# شۆڕشەکەی عێراق

**نووسینی**

سێر ئارنۆڵد ویڵسن

وەکیلی حاکمی پادشایی بەریتانی لەماوەی داگیرکاری عێراق و کوردستاندا

**وەرگێڕانی بۆ عەرەبی**

جەعفەر ئەلخەیات

**وەرگێڕانی بۆ کوردی**

سەرمەد ئەحمەد

هەولێر - ٢٠١٠

● شۆڕشەکەی عێراق

● نووسینی: سێر ئارنۆڵد ویڵسن

● وەرگێڕانی: سەرمەد ئەحمەد

● نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن

● پیتچنین: شیرین تەحسین

● بەرگ: ئاسۆ مامزادە

● ژمارەی سپاردن: (٩٤٤)

● نرخ: (٢٥٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٠

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٤١٣)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

به جگەرگۆشەکانم

ئاریز و ئەحمەد

پێشکەشە

کە هیوادارم لە خۆم بە بەرهەمتر بن

# پێشەکیی وەرگێڕی کوردی

گرنگی وەرگێڕانی ئەم کتێبە، لەوەوە هاتووە، باسی سەردەمێکی ناسکی مێژووی عێـراق بـە کوردستانیشـەوە دەکـات، سـەردەمێك لـە زۆر رووەوە لـەم سـەردەمەی ئێســتامان دەچــێت. ئــەویش ئــەو رووداو و گۆڕانکارییــە سیاســی و ئــابووری و جوگرافییانەیە، کە بەدوای جەنگەکە (یەکـەم جـەنگی جیهـانی) بەسـەر ناوچـەکەدا داهاتن و ئایندەی عێراق و کوردستانیان گۆڕی. هەروەها باس لە مێژوویێك دەکات کە داگیرکەرانی کوردستان نەیاننووسیوەتەوە، بۆ کورد گرنگـە مێـژووی نەتەوەکـەی لـە دیدگایەکی جیاواز لە خۆی و لە داگیرکەرانی بزانێ.

لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا هەموو پـەراوێزەکانی وەرگێڕانـە عـەرەبییەکـەم وەرنەگێڕاوە، تەنها ئەوانە نـەبێت  کـە هـی خـودی نووسـەرەکەن و ئەوانـەی دیکەش روونکردنەوەی زیاتر لە بابەتەکە دەکات، چونکە وەرگێڕە عـەرەبییەکەی زۆربەی پەراوێزەکانی لە دیدێکی شۆڤینی عـەرەبییەوە نووسیووە، بۆ خوێنەری کورد سوودی نابێـت، لـەو شـوێنانەی لـە کۆتـایی پـەراوێزەکان ((نووسـەر)) نەنووسرابێ، ئەوا پەراوێزەکە بۆ وەرگێڕە عـەرەبییەکە دەگەڕێتـەوە، هـەروەها پێشـــەکییە عـەرەبییەکەشـــی هـــەروا نووســـیووە، بۆیـــە بەباشـــم نـــەزانی پێشەکییەکە وەربگێڕم.

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەدا لە دوو شـوێن (لاپــەڕە ١٥٩ تــا ١٧٢) و (لاپــەرە ٢١٧ تــا ٢٢٦) وەرگێــڕە عـەرەبییەکـە بەمەبەست نووسینی دیکەی گرێدراو بەبابەتەکە و لێـدوانی خـۆی خسـتۆتە نـاو

وەرگێڕانەکە، لە یەکەمیان، سێ نووسینی (تـی.ئـەی.لـۆرانس)ی سـەبارەت بـە ڕەخنەگرتن لە نووسەری کتێبەکە دابەزاندووە، لەدووەمیشان، دوو لێدوانی خـۆی سەبارەت بە شۆڕشی زێبارییـەکان دابەزانـدووە. بۆئـەوەی جڵـەوی ڕای خوێنـەر بەدەسـت خۆمانـەوە نـەگرین، بەباشـم زانـی ئـەو دووشـوێنە کـە لـەدەرەوەی دەقەکەدان، وەرنەگێڕم.

هیوادارم بەم ماندووبوونە بچووکەمان، توانیبێتمان خزمەتێکی بچووکی مێـژووی نەتەوەکەمان کردبێ.

**سەرمەد ئەحمەد**

**هەولێر- زستانی ۲۰۰۹**

# بەشی یەکەم

## چوار مانگەکەی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠[١]

### بارودۆخی سیاسی

ئەگەر دەرەتان هەبوایە هێڵکاریەك هەر لە بابەتی ئەو هێڵکارییە باوەی کە بۆ پێشبینیەکانی کەش و هەوا دەکێشرێت، هێڵکارییەکیش بۆ پێشبینیە سیاسیەکان بکێشرابووایە، بە پشتبەستن بەو راپۆرتانەی کە تاڕادەیەك رۆژانە دەگەیشتنە نووسینگەی حاکمی گشتی مەلەکی ، ئەوا هێلکاریەکە دابەزینیکی توندی لەو فشارە پیشان دەدا کە لە سووریا دروستبووە و بەشێوەیەکی راستەوانە بەرەو دێرەزور دەجولیێ، هەروەها لەو هێڵکاریانەی کە لەدوای ئەو تۆماردەکرێن، دەردەکەوێت کە ئەو دابەزینە بەشێوەیەکی راستەوانە لە دێرەزورەوە بەرەو تەلەعفەر دەگوازرێتەوە و بەشێوەیەکی ترسناك پەشیوی و ئالۆزی دەنێتەوە و زەرەروزیانی مادی بە هەردوولا دەگەیەنیێ. هەروەها هێڵکارییەکە داتەپینێك لە بارۆمەتری سیاسی لە بەغدا و کەربەلا و نەجەف پیشان دەدات. ئەو سیێ شوێنەش بە سەنتەری وروژاندنی گەردەلول ناسراون، بەڵام لە شوێنەکانی دیکە، پێویست بوو بارۆمەتری سیاسی کەشێکی مام ناوەند کە تریشقەی ناوچەیی تۆمار بکات، چونکە هەواکەی بەکارەبا بارگاویکراوە و ئامێری خۆپاراستن لە هەورە تریشقە نییە. لە بەشەکانی ئێستادا هەوڵدەدەم سەرچاوەی ئەو دیاردانە و ئاراستەکانی روون بکەمەوە، چونکە ئاماژە بە پەشێویە ناوخۆییە مەترسیدارەکان دەدەن.

---

١- ناوەڕۆکی بەشی دەیەم لە کتێبی ویلسن، لە لاپەڕە ٢٢٧ تا کۆتایی لاپەڕە ٢٤٧.

له تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ حکوومەتێکی سەربەخۆ بە سەرۆکایەتی شا فەیسەڵ دامەزرا. ئەو حکوومەتە هەر لە حەلەبەوە تا دیمەشق حوکمڕانی دەکرد، رووخساری ئەو حکوومەتە رووخسارێکی عەرەبی بوو، بەڵام ئەفسەرانی ئینگلیز کاریان تێدا دەکرد و لە سەریان پێویست بوو راوێژکاری پێویست پێشکەش بکەن. حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی بە پارە بە گوێرەی ئەوەی کە عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی ئەو کات لە سەری راهاتبوون یارمەتی دەدات. زۆربەی زۆری پیاوە دیارەکانی دەستوپێوەندەکانی شا فەیسەڵ بەرەگەز عێراقی بوون. ئەوانە بەشێوەیەکی بەردەوام جەختیان لەسەر شەڕکردنیان لە هەڵمەتەکانی سووریا بۆ رزگارکردنی وڵاتەکەیان دەکردەوە، ئەوانە لە زستانی ١٩١٨-١٩١٩ لە میانەی ئەو جەنگانەی لە نزیك موعان دەکران، کۆمەڵەیەکیان پێکهێنا و ناویان نا (کۆمەڵەی پەیمانی عێراقی)، ئامانج لە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیەش سەربەخۆیی عێراق و رزگارکردنیەتی لە هەموو دەسەڵاتێکی بیانی و دواتر سووریاش بگەرێتەوە، بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە ژێر سایەی خانەوادەی مەلیك حوسێن لە حیجاز گرێ بدرێت. یاسین پاشا (ئەلهاشمی) کە لە کاتی کەوتنی دیمەشق بەدیل گیرا سەرۆکایەتی ئەو کۆمەڵەیەی دەکرد، ئەو پیاوە پلەو پایە بەرزەکەی لە سوپای تورکی بە پایەی سەرۆکی ئەرکان لە سوپای فەیسەڵ گۆڕییەوە، ئەو سوپایەی کە بووە هۆی ئەوەی پەلە لە خواستە نیشتیمانییەکان بکرێت، ئەو پیاوە گومانی لە پاڵپشتییەکانی ئەمیر فەیسەڵ بۆ بزووتنەوەکەی هەبوو، هەروەها زیاتر لەو توندڕەوییەی سەرکردەکانی تێوەگلا بوو، لەوەی کە سوودیان لێ وەربگرێت. لە زۆر بۆنەدا ئەو کردەوانەی پرتستۆ کرد کە ئەو کۆمەڵەیە ئەنجامی دەدا، بەڵام نەیدەتوانی ئاراستەی کۆمەڵەکە بەرەو ئەو لایە بەرێت، کە دەیخواست. چونکە ئەو لە رێگەی ئەو ئەفسەرە عێراقییانەوە کۆنترۆڵی سوپای دەکرد کە بەشدارییان تێدا کردبوو. سروشتی نافۆرمەڵەبووی ئەو کات پاڵنەرێکی رۆمانتیکی لە بزووتنەوەی نیشتیمانی دروستکرد، کە رەوتەکانی لە سووریاوە بۆ عێراق دەهاتن، زۆر سەختە کێشە ئیدارییەکان بە چەند هێڵێکی پان و روون چارەسەر بکرێن. بزووتنەوەکە لە عێراقدا لە ماوەی ساڵی ١٩٢٠ نە سەرکردە و

نە نوێنەری هەبوو، بۆ ئەوەی ئاراستەی بکات، بەڵکو بزوتنەوەکە خواستی رزگاربوون لـەو خەیاڵپلاوییـەی کـە جـەنگ هێنـابووی، بەدەسـتهێنابوو، بـەڵام دەرکەوتـە ناوخۆییەکانی گوماناوی و نا دڵنیا بوون، تـوخمی مژدەبەخشـی سـەرکەوتنم تێبینـی کرد، بەڵام هەستم بەمە کرد کە گوێڕایەڵی کوێرانە بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان راست و ناڕاست، جگە لە کارەسات هیچ شتێکی دیکەی لێناکەوێتەوە.

لە راسـتیدا رەگـەزی ناعـەقلانی لـە وڵاتـانی رۆژهەڵاتـدا لـە میانـەی تەنگـژە سیاسییەکاندا بەرزەفتکردنی لەو بەرزەفتکردنەی کە لە بەرامبەر کێشـە ئەتنییـەکان یان ئایینییەکاندا پیادەکرێن، کەمتر نییە، کەچی گرنگیدان بە مێژوو و ئابووری لەم بارەیەوە شتێکی لاوەکی و کەم بەهایە، بانگەشەکەرانی پێشکەوتنی سیاسی راستییە واقعییەکان لە بەرامبەر راستییە بێگەردەکان بەلادەنێنن.

## سنووری نێوان سوریا و عێراق

کاتی ئاگربەست کرا، هێشتا سنوورەکانی نێوان عێـراق و سـوریا بـە شـێوەیەکی روون دیاری نەکرابوو. ویلایەتی بەغدای ژێر دەسەڵاتی تورکی، قەزای (عانە)ی لە خۆ دەگرت و لە بەرزاییەکانی فوڕاتەوە تـا سـەروی (قـائیم)ی بـە چـەند میلێـك درێـژ دەبووەوە، هەروەها موتەسەڕەفیەی (دێرەزور) کە کەوتبووە نێوان (قائیم) و (رقە) کە دوورترین شارۆچکەی سەربە ویلایەتی (حەلەب) بوون، سەر بـە هـیچ ویلایـەتێك لـە ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی نەبوون، بەڵکو راستەوخۆ سەر بە ئەستەمبۆڵ بـوون. ئەو دابەشبوونە کارگێرییە بەر لە دەستپێکردنی جـەنگ گۆڕانکـاری بـە سـەرهات. موتەسەڕفیەی (دێرەزور) بە شێوەیەکی وا فراوان بوو، لە باشوور (عانە)شی لـە خـۆ گـرت، دوای کشـانەوەی تورکـەکان لـە (عانـە) لـە سـەر داوای زۆری خەڵکەکـەی، یاریدەدەرێکی حاکمی سیاسی بەریتانیم بۆ نارد.

لە کۆتاییەکانی تشرینی دووەم دانیشتوانی (دێرەزور) داوای هەمان شـتیان کـرد، (دێرەزور) کەوتۆتە سەر رووباری فوڕات و چوار سەد میل لە بەغداوە دوورە. منـیش

ئەفسەرێکی بەریتانیم بۆ پاراستنی ئاسایش و یاسا نارده ئـەوێ، ئـەوکات سـنووری بەرپرسیارەتیمان بـەو ئاراسـتەیە سـنووردار کرابـوو. هـەروەها ژنـەراڵ (مارشـاڵ)[1] درێژکردنەوەی بازنەی پاراستنە سەربازییەکەی بۆ سەرووی (قائیم) رەتکردەوە، بـەڵام پێ دەچوو هێشتنەوەی ناوچەی قەدەغەکراو لە نێوان سوریا و عێراق کـە بـە ئاسـانی بکەوێتە دەستی تورکەکان کارێکی مەترسیدار بێـت. بۆیـە کێشـەکە درایـە دەسـت حکوومەتی خاوەن شکۆ، لە ١٣ی کانوونی یەکەم سەرباری نارەزایـەتی حکوومـەتی عەرەبی لە دیمەشق، فەرمانم پێ کرا ئەفسەرێك لە ئەفسەرانی بەرێوەبـەرانی شـارەکە رابسپێرم بە شێوەیەکی کاتی ئەو کارە بکات، تا ئەو کاتەی بریاری کۆنگرەی ئاشـتی لە بارەیەوە دەردەچێت (واتە هەروەك ئەو بنەمایەی کە بە هۆیەوە ویلایەتی موسڵمان پێ داگیر کرد).

لەسەر ئەمە، کاپتن (کارڤەر) لە (عانە) بۆ (دێرەزور) ئینتیداب کـرا، کـاتێ کاپتن کارڤـەر گەیشـتە (ئەلبوکـەمال) سـەیری کـرد قائمقامێـك کـە نوێنـەری حکوومەتی عەرەبی دەکات و بە فـەرمانی حـاکمی حەلـەب لەگـەڵ ژمارەیـەك فەرمانبەر و نزیکەی چل سەرباز نێـردراون. کارڤـەر لـە ٢٣ی کـانوونی یەکـەم گەیشتە عانە و رێوشوێنی داگیرکردنـی لابـوو. لـە هـەمان کاتـدا موتەسـەرفی عەرەبیش گەیشتە دێرەزور، موتەسەرفی عەرەبی سەرقال بـوو بـە دامەزرانـدنی ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەر و سەربازگیری بە مووچەیەك لەوەی کە لـە عێـراق دەدرا زیاتر بوو، ئەو پارەیەش بە شێوەیەکی ئاسایی لـە خەزێنـەی حکوومـەتی خاوەن شکۆی بەریتانی لە رێگەی ئـەو راوێـژکارە بەریتانییانـەی کـە سـەر بـە حکوومەتی دیمەشق بوون، رادەکێشران.

پێ دەچێ حکوومەتی دیمەشق راگەیاندنەکەی ژنەراڵ (ئەلەنبی) یا حکوومەتی خاوەن شکۆ یـان بەغـدایان پشـتگوێ خسـتبێ، سـەبارەت بەوانـەی کـە خۆمـان پارێزگاریمـان

---

١ – فەرماندەی گشتی هێزە بەریتانییەکان لە عێراق، کە دوای مردنی ژنەراڵ (مۆد)ی رزگارکەری بەغدا لە شوێنی دانرا .

لێکردوون، پێ دەچێ لە راستیدا ئەوان حکوومەتی دیمەشقیان پشتگوێ خستبێ. بەم شێوەیە تەواو بێ ئاگام لەوەی، حاکمی سەربازی لە حەلەب، کە فەرمانەکانی دەردەکرد، ئینگلیزی یا فەرەنسی یا عەرەبی بووە. کاتێ پەیوەندی بە حەلەبەوە کرا، بینرا حاکمی حەلەب (شکری پاشا ئەیوبی) بوو، کە دوای سێ هەفتە رایگەیاند کە فەرمانبەرە عەرەبەکان بە پێچەوانەی رێوشوێنەکانمان روویان لە دێرەزور و ئەلبوکەمال کردووە، بە شێوەیەکی زۆرەملێ بە خێرایی گەڕێنراونەتەوە. هەر چەندە کێشەکە بە شێوەیەکی دۆستانە و کاتی یەکلایی کرایەوە، بەڵام مۆرکێکی پڕ چاوتێبڕینی دوژمنکارانەی بەرهەڵستکاری بە جێهێشت، کە کۆمەڵەی پەیمانی عێراقی لە بەکارهێنانی و سوود لێ وەرگرتنی کەمتەرخەمی نەکرد. هەروەها لە شوبات و تەمموزی ۱۹۱۹ نوێنەرێك لە نوێنەرەکانی کۆمەڵەی پەیمانی عێراق، کە دواتر بۆمان دەرکەوت ئەو نوێنەرە پیاوێك بوو ناوی (رەمەزان شەلاش) بوو، لە نێوان هۆزەکانی دێرەزور دەسوڕایەوە، بەڵگەنامە و دیکۆمێنتی وای بە دەست دەکەوێت، کە خزمەتی بە بەرژەوەندییەکانی حکوومەتی عەرەبی دەکرد. رەمەزان بۆ خۆشی موختار یان سەرۆك هۆزێکی لۆکاڵی بوو، کە بە (ئەلبوسەرایە) ناو دەبرا. ئەلبوسەرایە هۆزی جووتیارەکان و مەڕداران بوو، کە لە باکوور و باشووری دێرەزور نیشتەجێ ببوون. رەمەزان بۆ خۆی ئەفسەرێك بوو لە سوپای تورکی، لە بەرەی جەنگدا هەڵات و پەیوەندی بە شەریفەوە کرد.

ئەو بانگەشانەی کە ئەو کۆمەڵەیە پەخشی دەکردن، هەر تەنها بۆ دێرەزور نەبوون بەڵکو عێراقییەکانی سوریا بەردەوام پەیوەندییان بە خزم و برادەرانیان لە عێراقەوە دەکرد، مەبەستیش لەمە هاندانی عێراقییەکان بوو، بچنە پاڵ سوریا و داوای سەربەخۆیی تەواو بکەن.

لە سوریاوە بەمەبەستی یارمەتیدانی عێراقییەکان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بۆ چوونانە و پەخشکردنی بە ناو خەڵکیدا، پارە رەوانەکراوە[1]. من زۆر پەرۆش نەبووم،

---

١- سەبارەت بەمە بۆ راپۆرتی خاتوو (بێل) لە بارەی ئیدارەی شار، بگەڕێوە، لاپەرە ١٣٤ (نووسەر). لە خوارەوە ئەو راڤەیە دەنووسین کە ئاماژەی بۆ کراوە، لە کتێبی (فصول من تاريخ

هەروەك پێشتر روونم کردەوە، بۆ ئەوەی ناوچەی دێرەزور بخرێتە ناو سنووری عێراقەوە، ئەو ناوچەیە هەر لە دێر زەمانەوە بەشێك بووە لە سوریا[1]. بەنزیکبوونەوە لە سەلاحییە سنوورەکان کۆتاییان دێت. ئەمەش وایکردووە حسابکردن بۆ هێزی سەربازی شتێکی نابەجێ بێت، چونکە هێزی سەربازی ئەگەر بەم شێوەیە لە بارەگا دوور بێت، ناتوانرێت بەردەوام بێت. نەش دەتوانرا پشت بە گەنجە لۆکاڵییەکان ببەسترێت، هەریەکە لە (کاپتن کارڤەر) دوای ئەویش (کاپتن کامێر) و (مولازم بویس) بەیارمەتی دوو ئۆتۆمبێلی زرێپۆشەوە کە (کاپتن گۆرنج) لێی دەخورین، توانییان بۆ ماوەی هەشت مانگ پارێزگاری لە ئاسایش و ئارامی بکەن و رێگای فورات بە کراوەیی بهێڵنەوە، سەرباری ئەوەی کە نزیکترین مەفرەزەی سەربازی لێیانەوە لە رومادی یان لە موسڵ بوو. من ناوەناوە بە هۆی فڕۆکە سەردانم دەکردن، بەمەش توانیم پەیوەندی توندم لەگەڵیان هەبێت و ئاگاداری رووداوەکانی ئەو دەڤەرەش بم، هەرچەندە ئەوانە لە پاڵپشتی سەربازی مەحرومیش بوون، بەڵام بۆ چەسپاندنەوەی دەسەڵاتی حکوومەت هۆکاری تازەیان داهێنا و توانییان نرخی خۆراك بکەن بە نیوەی ئەو نرخەی کە پێش هاتنیان بۆ ئەوەێ لە ئارادابوو، ئەمەش یەکەم شت بوو کە بۆ چینە هەژارەکان بکرێت. بەم شێوەیە. ئارامی رەوشەکە لەو ماوەیەدا شایەنی پیاهەڵدان بوو، بەڵام ئیدارەکە ئیدارەیەکی کاتی بوو، واتا لەو ئیدارانە بووە، کە بارێکی گران دەخاتە ئەستۆی ئەفسەرە پەیوەندیدارەکان.

حکوومەتی خاوەن شکۆ لە هاوینی ١٩١٩ سنوورێکی کاتی پێشنیاز کرد، کە بریتی بوو لە هێڵێك کە رووباری فوراتی لە خوارووی دێرەزور بە چەند میلێك لە

---

العراق الحدیث) کراوە بە عەرەبی: سەید طالب پاشا لە ساڵی ١٩٢٠ بە یوسف ئەفەندی سویدی راگەیاندووە، کە کۆی ئەو پارەیەی وەریگرتووە (١٦٠٠٠) لیرەی زێر بووە، ئەو پیاوە سکاڵای لە کەمی ئەو برە پارەیە کردووە، کە بەشی هەموو لایەنەکان ناکات. هەروەها زانراوە کە (٣٠٠٠) لیرەی دیکە، شێخ سەعید نەقشەبەندی وەریگرتووە.

١- بۆ کتێبی مۆزیل (The middle Euphrates) بگەڕێتەوە.

سنگی رووباری خاپور دەبڕی، ئینجا بۆ ماوەیەك لەگەڵیا دەرۆیشت. بەڵام ئەو سنوورە لەگەڵ ڕەوشی ناوچەکە ناتەبا بوو، چونکە عەشیرەتەکانی ناوچەکە لە هەردوو بەری رووباری خاپور نیشتەجێ ببوون، بۆ سەقامگیری ئاسایش وای دەخواست، کە ئەو هۆزانە بکەونە بەر یەك حکوومەتی ئینتیدابکراو. لەگەڵ ئەمەش لەو گفتوگۆیانەی لە ئەیلولی ١٩١٩ لە نێوان بەریتانیای مەزن و فەرەنسا سازکرا، بڕیار درا بە شێوەیەکی کاتی ئەو سنوورە پارێزگاری لێبکرێت و دانرا کە خاپور سنووری جیاکەرەوەی نێوان عێراق و سوریایە. ئەو کات ئەمیر فەیسەڵ بەمەبەستی بەشداریکردن لە چەند کۆنگرەیەك لە ئەوروپا بوو، بەڵام دیار نییە ئاخۆ ئەو ئاگاداری سروشتی ئەو بڕیارە بوو یان نا، هەر چەند ئەو (فەیسەڵ) دەیزانی هاوپەیمانان نیازیان وایە، کە دێرەزور لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق وەدەربێنن. ئەو بۆچوونەی کە لە سوریا باو بوو لە سەر ئەوە بوو کە بەریتانیای مەزن، موتەسەرفیەی دێرەزور بە تەواوی چۆل دەکات، ئەمەش وا دەکات سنوورەکانی باشووری کە لە قائیم کۆتایی دەهات و سنووری ئیدارەی کۆنی سەردەمی تورکەکان بوو، دەگۆڕێت، یاخود لە خوارووی (عانە) لەو خاڵەی کە تورکەکان بە شێوەیەکی کاتی دیاریان کرد، سنوورەکانیان بگۆڕێت.

ئەو هەوڵانەی بۆ وەرگرتنی زانیاری لە لەندەنەوە بۆ ئەو مەبەستە دەدران، هەوڵگەلێکی سەرکەوتوو نەبوون، کەس نەبوو ناوەڕۆکی ئەو بڕیارە بزانێ کە لەم بارەیەوە دراوە، پرۆتۆکۆلیش نەبوو، هیچ شتێ یەکلایی نەکرابۆوە، تاکۆ بتوانرێت بنووسرێتەوە.

لە ماوەی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ هێزەکانی بەریتانیا سوریایان چۆڵکرد. دوای چەند ڕۆژێك بە گوێی (کاپتن کامێر) حاکمی سیاسی دێرەزور چرپێنرا، کە قائیمقامێکی تورکی هاتۆتە حەسەکە (شارێکە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی دێرەزور) و لە نێوانی عەشایەرەکاندا بڵاوکراوەی وای بڵاوکردۆتەوە، کە ئاماژە بە هاتنەوەی بە پەلەی تورکەکان دەکات. کاپتن کامێر بە دوای قائیمقامی حەسەکەی نارد بۆ ئەوەی باسی بابەتەکە بکەن، ئەویش پێشنیازی بۆ کرد، تاکۆ بچێتە (سەری کانی) و بەتەلەفۆن پەیوەندی بە سەرکردەی تورکی لە ماردینەوە بکات. داوای لێکرد

روونکردنەوە لە بارەی ئەو جولانەوەیە بدات. سەرکردە تورکییەکە وەڵامی دایەوە، کە ئەوان (واتە تورکەکان) وا تێگەیشتوون کە بەریتانیا دێرەزوری چۆڵ کردووە، بەڵام مادام کارەکە وا دەرنەچوو، ئێمە هەر زوو قائیمقامی خۆمان بانگ دەکەینەوە، هەروەها ئەگەر لە نێوان مەرجەکانی ئاگربەستدا هیچ بەندێکی تێدا نەبێت رێگری لە کاری تورکان لەو دەڤەرە بکات، چونکە دێرەزور لە رووی ئیدارییەوە سەربە سوریا نەبوو، هەروەها بە بەشێك لە ویلایەتی موسڵیش دانەدەنرا.

## رەمەزان شەللاش و داگیرکردنی دێرەزور

مەندوبی باڵای بەریتانیا لە قاهیرە[1]، لە رۆژی ١٩ ئەیلول سەبارەت بە وەی کە رەمەزان شەللاش حەلەبی چۆلکردووە، بروسکەی بۆ کرا. شەللاش رێنمای حکوومەتی دیمەشقی لایە  کە بچێتە دێرەزور، لە کانوونی یەکەم گەیشتە (رقە)، لە نێو هۆزەکانی ئەویٚ دەستی بە چالاکی کرد و ناوی خۆی نا ((حاکمی فوڕات و خاپور)) هەموو ئەو زانیارییانەی لەو ماوەیە بەدەستمان دەگەیشتن، ئاماژەیان بۆ پتەوبوونی پەیوەندییەکانی نێوان پیاوە دیارەکانی عەرەب و تورکەکان دەکرد، لە راستیدا ئەمە شتێکی سروشتی بوو، چونکە زۆربەیان لە سوپای تورکی خزمەتیان پێشکەش کردبوو، تا شەڕڕاگرتن جاردرا. بۆیە من زیاتر مەیلم بە لای ئەوەدا دەچوو کە ئەو بزووتنەوەیە، لە سەرچاوە تورکییەکانەوەیە و لە دیمەشقەوە نییە. سەخت بوو باوەڕ بەوە بکەم کە ئەفسەرانی بەریتانی ئەوانەی لە سوریا کاریان دەکرد لەوانەبن لە سەر ئەو هەڵسووکەوتە رازی بن. سەبارەت بەمە هیچ شتێکم نە لەوان و نە لە وەزارەتی هیندی بە دەست نەگەیشت.

لە یازدەی کانوونی یەکەم پیاوانی لە هۆزەکان باشوورەوە چوونەتە ناو دێرەزور و لەگەڵ کوڕانی شارۆچکەکە نەخۆشخانە و کەنیسە و مزگەوتێك یان دوانیان تاڵان کرد،

---

١- ئیدارەی بەریتانی هەر لەو کاتەوە لە قاهیرە هەبوو، لەوەتەی لە دەسەڵاتی تورکان رزگاری کرد بوو سەرپەرشتی ئەو بەشەی دەکرد.

هەڵیان کوتایە سەر (دائیرەی سیاسی) و قاسەی دائیرەکـەیان شـکاند و دەسـتیان بـە سەر شتەکانی ناوی داگرت، کۆگای نەوتیان تەقاندەوە، بە هۆیـەوە نـەوەد (٩٠) لـە هێرشبەران بریندار بوون. سەرجەم گیراوەکانیان ئازاد کرد، تەقەیان لە ئۆتـۆمبێلێکی زرێپوش کرد، کە بەنیاز بوو بۆ زانیاری وەرگرتن سـەردانی شارۆچـکەکە بکـات، بـە تەواوی شارۆچکەکە خاپورکرا. لە کۆتایی هەمان بەیانیدا تەقەیان لە چەند یەکەیەکی سەربازی کرد، یەکەکانیش کە چەکی رەشاشیان لە سەر خانووەکانیان جێگیر کردبـوو وەڵامی تەقەکەیانی دایەوە، بەڵام زۆری نەخایەند رەشاشەکەیان بە هۆی پێکـانی بـە چەکی دوژمنەوە، لەکارکەوت. دوای ئەمە بە ماوەیەکی کورت داوا لە کاپتن کـامێرا کرا بێتە شارۆچکەکە و کۆنگرەیەك لەگەڵ سەرۆکی شـارەوانی و هاوڵاتییـانی دیـاری شارەکە ساز بکات. پێ دەچێت ئەوان بە پەرۆشەوە بن بۆ سـازکردنی شـەڕاگرتن لـە نێوان هەر دوولا، چونکە دوای هاتنی عەشایرەکان بۆ ناو شارۆچکەکە نەیاندەتوانی بە سەر شارەکە زاڵ بن، کاپتن کامێرا چاوی بەو پیاوە ماقولانە کەوت کە سـەرکردایەتی شۆڕشەکەیان دەکرد، شۆڕشگێریتی و خرۆشانێکی گەورەیان تێدا بەدی دەکرا. رایان وا بوو کە دوای ئەوەی ئەو هێندە لە بزووتنەوەکەیان چۆتەپێش، پێویستە ئەو ئەفسەر و فەرمانبەرە بەریتانییانە بکوژرێن کە لە نـاو شارۆچـکەکە دان، ئەوانـە لەوانـە بـوو هەڕەشەکەیان جێبەجێ بکرابوایە، ئەگەر بەدەرکەوتنی ئەو دوو فڕۆکە بەریتانییە نەبا کە بارەگای گشتی بۆ دێرەزور بۆ بـەهاناوەهاتن لـە موسـڵەوە نـاردبووی، فڕۆکـەکان تەقەیان لە شارۆچکەکە کرد و شیخەکان یەکسەر زمانی قسەکردنیان گۆڕا و تکایـان لە کاپتن کامیر کرد کار بۆ وەستاندنی بۆردومانەکە بکات، کە دوو فڕۆکەکە گەڕانەوە هەردوولا شەڕڕاگرتنێکی ٢٤ کاتژمێرییان سازکرد.

دوای نیوەرۆ رەمەزان شەللاش گەیشت ، دەستبەجێ داوای کاپتن کـامیری کـرد و پێی راگەیاند، کە داوایان لێکراوە هەر ئێستا دێرەزور چۆل بکەن، هەروەك ئەوەی چۆن لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ بانگهێشتکرابوون بـۆ ئـەوەی ئاسـایش و ئـارامی پارێزگاکە بپارێزن. کابتن کامێر وەڵامی دایـەوە کـە هـیچ رێنماییـەکی لا نییـە بـۆ

چۆلکردنی دێرەزور. بەڵام لەبەرئەوەی کاپتن کامێر نەیدەتوانێ هیچ بەرگرییەك بکات، بۆیە لە سەر چۆلکردنی دێرەزور رازی دەبێت، بەمەرجێ رەمەزان شەللاش بەڵێن بدات پارێزگاری لە ئاسایش بکات و هیچ رێوشوێنێك لە دژی ئەو فەرمانبەرە عەرەبانەی لە ئیدارەی بەریتانی کاریان دەکرد، وەرنەگرێت. یان هیچ شتێك دژ بە کریستانەکانی شارۆچکەکە نەکات (لە دێرەزور ژمارەیەك پەنابەری ئەرمەنی هەبوون کە گرنگیدان پێیان، پاساوی خۆی هەبوو)، رەمەزان لە سەر ئەو مەرجانە رازی بوو، بەڵام لە شەودا رای خۆی گۆڕی و داوای لە کاپتن کامێر کرد، کە کاتێ بە سەلامەتی لە دێرەزور دەرچوو، زامنی ئەوە بکات بەریتانیا لە ئاسمان و وشکانییەوە هێرش بۆ سەر دێرەزور نەهێنێ، بەڵام کامێر نەیدەتوانی پابەندی ئەم بەڵێنە بێت، بەڵام رازی بوو لە سەر ئەوەی ئاماژەیەك بە یەکێ لە دوو فڕۆکەکە بدات بۆ ئەوەی فڕۆکەوانەکەی رازی بکات لە سەر زەوی بنیشێتەوە، لە رۆژدا ئەمەی کرد، ئینجا نامەیەکی بۆ دەسەڵاتدارانی بەریتانی نووسی، ئەوەی تێدا روونکردبووە کە ئەو بەریتانییانەی لە دێرەزور دا هەن، وەك بارمتە لە بەرامبەر ئاسایش و سەلامەتی شارەکە دەست بەسەر کراون.

هەرکە رەمەزان هاتە ناو دێرەزور، دەستی بە بلاوکردنەوەی پڕۆپاگەندە کرد، لەوانە هەر کەسێ یارمەتی بدات دادەمەزرێ، بەڵام مووچەکەی لە کاتێکی دواتر وەردەگرێت، هەروەها حکوومەتی عەرەبی نیازی وایە پێکهاتەی ئیدارەی تازە دابمەزرێنی و خودی سەرۆك عەشیرەتەکانیش بکات بە سەرۆکی ئەو یەکە ئیدارییانە. ژمارەیەك موختاری هۆزەکان بە درێژای رووبار یەکسەر سەردانی رەمەزانیان کرد. زۆربەی شێخانی هۆزی عەنزە ﴿فەهد بەگ هەزال﴾ کە نەیاری هاوپەیمانییەتیەکەمان بوون، هەر چەندە بە روونی رایانگەیاند؛ کە پێویستە هۆزەکان لە دژی بەریتانییەکان بورژێنرێن و شەڕ لەگەڵیان تاکو هیند دابگیرسێ، سەرجەم شێخەکان دوای وەرگرتنی دیاری نەختینەیی و تاقیکردنەوەی رەوشە باوەکە، هیچ کارێکی دیکەیان نەکرد و گەڕانەوە رەشماڵەکانیان، گومانی تێدا نییە،کە سەبارەت بە بەدەستکەوتنی یارمەتی و پاڵپشتی عەشایرەکان رەمەزان تاڕادەیەکی خراپ هەڵخەڵەتا بوو.

دوای ئەوەی، ئەو هەموو ڕووداوە ڕوویان دا، لە وەزارەتی جەنگ لە ڕێکەوتی ١٨ی کانوونی یەکەم بروسکەیەکمان بە بەرواری ٢١ی تشرینی دووەم بەدەست گەیشت، کە باس لەوە دەکات، کۆنگرەی ئاشتی بڕیاری داوە دێرەزور نەخاتە ژێر ئینتیدابی بەریتانی. لە هەمان ڕۆژدا بروسکەیەکمان لە ئەمیر فەیسەڵ بەدەست گەیشت کە ئەو کات لە پاریس بوو، کە بە قسەیەکی توند جێگر و براکەی لە دیمەشق (ئەمیر زەید) ئاگادار دەکاتەوە و کارەکەی ڕەمەزان شەللاش سەرکۆنە دەکات و فەرمان بە فەرمانبەرانی عەرەب دەکات لە دێر پاشەکشە بکەن. هەروەها ئەوەش بۆ سەر بروسکە زیاد کراوە، کە فەیسەڵ هەموو ئەو بەرپرسانەی لەو ڕووداوە بەشدارن سزا دەدات و بەیاخی لە قەڵەمیان دەدات. فڕۆکەکانمان ئەو نامەیان لە ٢٢ کانوونی یەکەم بە سەر دێرەزور بڵاوکردەوە، هەروەها لەگەڵ ئەو نامەیەدا نووسراوی سەرکردەی گشتی بەریتانی بڵاوکراوەیە کە داوای لە ڕەمەزان کردووە ئەفسەران و پیاوانی بەریتانی بە سەلامەتی بگەیەنێتە ئەلبوکەمال، ئەگینا ڕێوشوێنی گونجاوی لە دژی وەردەگرێت. بێ گومان ڕەمەزان دەیزانی کە دەستگرتن بەسەر دێرەزور ناکرێت پاساوی بۆ بهێنرێت، هەر چەندە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کۆنگرەی ئاشتی دێرەزوری بۆ حکوومەتی عەرەبی تەرخان کرد بوو، ئەوەش نکۆڵی ناکرێت کە ڕەمەزان لە جوڵانەوەی تورکەکانیش نیگەران بوو، ئەو نیگەرانییەش ئاسایی بوو، چونکە خۆی دوایین کەس بوو کە لە سوپای تورکی رایکردبوو. لە ١٩ی کانوونی یەکەم بە کاپتن کامێری ڕاگەیاند، کە تورکەکان بەشێکی زۆری هێزەکانیان لە سەری کانی مۆڵگەداون، دواتر ڕوونی کردەوە کە خوازیار نەبوو شەڕی حکوومەتی بەریتانی بکات، پرسیاری ئەوەشی کردبوو، ئا خۆ کامێری دەتوانێ یارمەتی بدات هەتاکو ئەگەر بە پارەش بێت، ئەگەر تورکەکان هێرشیان کرد؟

لە ٢١ی کانوونی یەکەم دوو ئەفسەر لە حەلەبەوە هاتن ئەوانیش: ڕەئووف بەگ و توفیق بەگ بوون، ئەوەی دوایی یاوەری (جەعفەر پاشا)[1]ی حاکمی حەلەب بوو یان لە

١- ڕەئووف ئەلکوبەیسی کە دواتر ماوەیەکی درێژ لە حکوومەتی عێراقی خزمەتی کردووە، وەك موتەسەریف و بەڕێوەبەری گشتی ئەوقاف لەم دواییەدا، هەرچی صدیق ئەلدەملوچی یە بووە یەکێ

دەست و پێوەندەکانی ئەمیر فەیسەڵ بوو، ئەو ئەفسەرانە لەوانــە بــوون کــە ژەنــەڕاڵ (ئەلەنبی) و ئەفسەرانی ئەرکان زۆر پشتیان پێ دەبەستن. رەئــووف نووســراوێکی لــە جەعفەر پاشا بۆ کاپتن کامێر هێنابوو، تا دوو رۆژ رێگەی پێنەدرا بیگەیەنێتە کــاپتن کامێر. لە نووسراوەکەدا جەعفەر پاشا داوای لە ئەفســەرانی بــەریتانی کردبــوو، کــە لەگەڵ رەئووف باسی باشترین ئەو ئامرازانە بکەن کە بە هۆیــەوە ئاســایش بەرقــەرار دەبێت، رەئووف بەگ بە کاپتن کــامێری راگەیانــد؛ ئــەو رێنمــایی لایــە بــۆ لابردنــی رەمەزان لە پۆستەکەی و دەکرێت بە قائیمقام لە رقە، بە دەستبەســەری بــۆ حەلــەب دەنێردرێت. بەڵام لە بەر ئــەوەی هــەردوو نوێنەرەکــەی حکوومــەتی عــەرەبی هێــزی پێویستیان بۆ بەجێهێنانی ئەو فەرمانە نەبوو، لە بەرئەوەی رەمەزان تاکە پیاو بوو کە نێوانی ئەفسەرانی بەریتانی و دەمارگیری هــۆزە لۆکاڵییــەکانی گــرژ دەکــرد، کــاپتن کامێر پێشنیازی کرد کە هەموو کردەوەیەك بەرامبەر رەمەزان دوابخرێت بە پێویستی زانی مولازم تۆفیق (دەملوچی) لەگەڵ ئەفسەرێکی بەریتانی بــۆ ئەلبوکــەمال بچــێت لەمبارەیەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەریتانی قسە بکات. منیش لە هــەمان رۆژدا بــە فرۆکە چووبوومە ئەلبوکەمال، تۆفیق بەگ هانی دام، کە هەرچی پێویستە بکرێت بــۆ ئەوەی سەربازانی بەریتانی بیکەن بۆ دەرکردنی رەمەزان شەللاش لە دێرەزور. وەڵامی من ئەوە بوو کە ئێمە هەرگیز نیازمان نەبووە، دەست بەسەر دێرەزور بگرین، تەنها بۆ سەپاندنی ئاسایش نەبێت، لەبەرئەوەی رەمەزان هۆکاری ئاژاوەی ئەو کات بوو، بۆیــە ئەرکی حکوومەتی دیمەشــق بــوو، کــارێکی وا بکــات رەوشــەکە بــۆ بــارێکی ئــارام بگەرێنێتــەوە. بــۆ هــەمان مەبەســت فرۆکــەکان بڵاوکراوەیــان بەســەر دێــرەزور دا بەردایەوە، لە بڵاوکراوەکان تیشك خرابووە سەر ئەوەی، کە ئەگەر رەمەزان ئەفسەر و پیاوانی بە سەڵامەتی لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا بگەیەنێتە ئەلبوکەمال، ئــەوا دێــرەزور هیچ دەستی لێنادرێت.

---

لە ئەفسەرە پێشکەوتووەکانی سوپای عێراقی، هەرچی جەعفەر پاشا ئەلعەسکەری یــە، کەســێکی ناسراوە، لە کودەتای بەکر صدقی ساڵی ١٩٣٦ کوژرا.

لە ٢٥ی کانوونی یەکەم بەندییەکان ئازاد کران و دێرەزور یان جێهێشت، دوایی دڵنیا کران کە دانیشتوانە کریستانەکانی دێرەزور ئازار نادرێن. لـە ژێـر رۆشـنایی رووداوەکانی کە دواتر روویان دا، ئەو بڕیارەی کە لەمبارەیەوە دام لە لایـەن چـەند لایەنێك گفتوگۆ کرا، دیتم لە سەر هەڵەم، من دەبوایـە فشـار بخەمـە سـەر (سـێر جـۆرج مـاکمۆن) سـەبارەت بـە پێویسـتی بـەکارهێنانی چـەك بـۆ گەڕاندنـەوەی رەوشەکە، تا ئەو کاتەی کێشەکە بە شێوەیەکی ئاشتی لەگەڵ حکوومـەتی سـوریا بە رێگەی دیپلۆماسی یەکلایی دەکرێتەوە، بەڵام پێویستە لەلایەکی دیکەوە باسـی ئەمانە بکەین:

١- دێرەزور بۆ سوریا تایبەت کرابوو.

٢- وەزارەتی جەنگ و حکوومەتی سوری و ئەفسـەرانی بـەریتانی گرێـدراو بـەم حکوومەتەوە، رەوشە نالەبارەکەیان لە پێگەیـەکی نادروسـت هـەر لـە بنـەماوە لـە بەردەستی ئێمە دانا.

٣- کەمی سەرباز و هۆکارەکـانی گواسـتنەوە، کـە دوای مۆڵەتـدانی سـەربازان روویدا، وایکرد بەڕێوەبردنی چالاکییە سەربازییەکان بـە هـۆی دووری ماوەکـانی لـە بنکە سەرەکییەکەی لە بەغدا، کارێکی ئەستەم بێت. ئەستەمە بتوانرێـت درێـژە بـە پەیوەندی نێوان دێرەزور و بەغدا یان موسڵ بدرێت لـە کاتێکـدا ئەگـەر هـەر جـۆرە ناهاوسەنگییەك روویدا. بۆیە بۆ هەموو باروزروفێك دەردەکـەوێت کـە ئـەو بڕیـارەی داومە، تاکە بڕیارێکە کە توانای جێبەجێکردنی هەبێت.

## حکومەتی دیمەشق و سنوور

لە ٢٢ی کانوونی دووەم حکوومەتی عەرەبی لە دیمەشق سەبارەت بە سنووری خاپور ناڕەزایەتی دەربڕی، ئەو ناڕەزایەتییە لە بروسکەیەکدا هات کە بە فرۆکـە گەیەنرایە قاهیرە، پاساوی ناڕەزایەتییەکە هەمان پاساو بوو کە پێش شەش مانگ پێشکەشی بەغدا کرابوو، پاساوەکە ئەوە بوو کـە سـنوورەکە یەکـەی هۆزایـەتی

عەشـیرەتەکان دەکـات بـە دوو لەتـەوە. داوایـان کردبـوو کـە عەشـیرەتەکانی (مەیادین) و (ئەلبوکەمال) بخرێنەوە سەر ناوچەی سوری. ئەو رێوشـوێنانەی کـە رەمەزان شەللاش گرتبوویەبـەر زۆر روون و ئاشـکرا بـوون، هـەر لـە سـەرەتاوە هەڵوێستی بەرەنگاری فەرمانەکانی ئـەمیر فەیسـەڵی گرتەبـەر، رایگەیانـد کـە دەبێت بەریتانییەکان بۆ دۆڵی حـۆران بـە درێـژایی نزیکـەی (٥٠) میـل بـەرەو باشووری عانە پاشەکشە بکەن، وای بانگەشە کرد کە ئـەوە ئـەو سـنوورەیە کـە کۆنگرەی ئاشـتی دیـاریکردووە. هـەروەها رایگەیانـد کـە تـا عانـە هیزەکـانی دەجولێنیٚ، شەللاش باجی لە هەموو شوێنێکی دەسەڵاتی بەریتانی کـۆدەکردەوە کە بتوانیٚ کۆی بکاتەوە. هانی هۆزەکانی دەدات کە داگیرکـاری و تـاڵان بکـەن، نامەی هەڕەشـەی بـۆ حاکمـە سیاسـییەکانی ئەلبوکـەمال دەنـارد و نووسـراوی حەماسی بۆ شێخانی ناوچەکانی بەریتانیا دەنارد، بـەڵام وەڵامـی نووسـراوەکانی دڵخۆشکەر نەبوون. کەچی سەرکەوتوو بوو لە هەوڵەکانی بـۆ خرۆشـاندنی هـۆزی (عەقیدات)[1]، کە دواتر خۆی چووە پاڵیـان. هیـوای رێگـری و جەردەیـەکی بـیٚ سنوور زۆر لەگەڵ خواستەکانیان یەکانگیردەبوو، لە ئاستێکی بەرزدا گوێیان بـۆ هەر دەنگێکی ئایینی یا سیاسی شل کردبوو، کە دزی و تالاّنەکەیان بـەو هۆیـە پاساو بدات. هەرچی بازرگانەکانی بەغدا بوون ئەوا سەرقالی کڕینی زێر بوون لە سوریا و بە قازانجێکی زۆر دەیانگوازتەوە بۆ عێراق، ئەوان بە دیدگایەکی دیکەوە سەیری رەوشەکەیان دەکرد، چیرۆکەکانیان سەبارەت مەترسییەکانی رێگـا و ئـەو زیانانەی رووبەڕووی دەبوونەوە لـەو شـوێنانە کۆتاییـان دەهـات کـە دەگەیشـتە ناوچەی پارێزراوی ئینگلیزی لـە ئەلبوکـەمال، ئینجـا وەسـفی ئاسـایش و ئـەو دڵنەواییەیان دەکرد کە لە ناوچە پارێزراوەکان هەستیان پیٚ دەکرد.

---

١- شێخ موشەڕەف دەندەل سەرۆکایەتی دەکردن.

نارەزایەتییە فەرمییەکان سەبارەت بە کردەوەکانی رەمەزان[1] بە فرۆکە دەگەیەنرانە مەیادین و دێر. شەللاش ئاگادار کرایەوە، ئەگەر لە ناو سنووری بەریتانی لە دەست درێژی بەردەوام بێت، ئەوا سەرکردەی گشتی ناچار دەبێ تۆڵەی لێبسەنێتەوە، ئەگەر هەر شەللاش هیچ پێشنیازێکی لە بارەی بابەتی سنووری هەیە، پێویستە بیداتە حکوومەتەکەی خۆی ئەویش لە رێگەی خۆیەوە بە شێوەی گفتوگۆی برایانە لەگەڵ حکوومەتەکانی دیکە کە گرنگی بە مەسەلەکە دەدەن باسی دەکات. شەللاش بە نکۆڵیکردنەوە وەڵامی دایەوە، بێ ئاگایی خۆی لە رێککەوتننامەکە دەربڕی کە لەمبارەیەوە ساز کراوە، کۆتایی نامەکەی بە هەڕەشەکردن بە هێرشکردنە سەر ئەلبوکەمال هێنا بوو، لە ٢١ی کانوونی دووەم ئەو هۆزانەی کە هاتبوونە دەورووبەری ناوچەکە هێرشیان دەست پێکرد، ماڵی ئەو عەرەبانەی کە خزمەتی ئیدارەی بەریتانیایانن دەکرد، تالاّن کرا و دەستدرێژیش کرایە سەر ژنانیان.

## مەولود لە دێرەزور

لە نیوەی کانوونی دووەم هێشتا رەوشەکە باشتر نەبوو، کاتێ رەمەزان شەللاش چووە حەلەب و بە مەولوود پاشا موخلیس گۆڕدرا، مەولوود پاشا سەرکردەیەکی سەربازی یەکێ لە بنکە سەربازییەکانی پێشوو بوو، بەڕەگەز عێراقی بوو[2]، وەکو ئەوەی پێش خۆی خەڵکی موسڵ بوو، هەروەها ئەندامێکی دیاری کۆمەڵەی پەیمانی عێراقی بوو، یەکەم هەنگاو دوای وەرگرتنی

---

١- عەلی جەودەت لە ((یادداشتەکانی)) دەڵێت :. رەمەزان بە هاندانی (یاسین ئەلهاشمی) لە دەورووبەری دێرەزور هێرشی کردە سەر ئینگلیز.

٢- رەمەزان شەللاش بەڕەگەز عیراقی نەبوو، بەلاّم سەر بە یەکێ لە هۆزەکانی دێرەزور (ئەلبو سەرایە) بوو، هەروەك پێشتر نووسەر ئاماژەی پێداوە، بەلاّم مەولوود پاشا هەر لە بنەچەوە خەڵکی تکریت بوو، دواتر بە مەولوود موخلیس ناسرا.

سەرکردایەتی ئەوەبوو نامەیەکی بۆ سەرکردەی گشتی لە بەغدا نووسی و پێی ڕاگەیاند کە سنووری خاپور بە فاکتەری عەشایری نابێت وابمێنێتەوە، داوای کرد پاشەکشەی خێرا بۆ دۆڵی حۆران بکرێت، بەڵام ئەو ئەلتەرناتیڤەی کە مەولوود پاشا خستیەڕوو بەهەمان بڕ ڕووبەڕووی نارەزایەتی دەبێتەوە، چونکە ئەگەر وابکرێت، ئەوا هۆزی (دلێم) بە شێوەیەکی ڕەمەکی بۆ دوو بەش کەرت دەبێ. هەروەها لە هەمان کاتدا داوای دووبارە گەڕانەوەی خزمەتگوزارییەکانی پۆستە و نامەی کردبوو. جگە لەو شێوەیەی کە بە هۆیەوە وەڵامی شەللاش درایە، بە هەمان شێوە وەڵامی درایەوە، ئەویش ئەوە بوو کە ڕێککەوتن لە سەر سنوور لە ئەوروپا تەواو بووە، ناکرێت گفتوگۆی ئەو بابەتە بکرێت، تەنها لە ڕێگەی دیپلوماسی باو نەبێت. چەك و تەقەمەنی و ئازووقە ڕەوانەی ئەلبوکەمال کرا، بەڵام ئەو ناوچەیەی کە بە درێژایی خاپور درێژ ببووەوە لە ترسی بەرەنگاری و خوێنرێژی داگیر نەکرا. ئەگەر خۆمان بوارد لەوەی کە حکوومەتی عەرەبی بەرپرس نییە لەوەی کە ئەفسەرانی ئەنجامیان داوە و حاڵەتی جەنگ لە ئارادا نییە ئەم ئەگەرە زۆر سەختە بمێنێتەوە. ئەگەر مەولوود سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی پڕۆپاگەندەی دوژمنکارانە بێت وەك شەللاش، نامەکانی گەیشتە شێخەکان، تا شێخانی عەممارەش لە باشوور. پێ دەچوو پارەیەکی زۆریش درابێت[1] (ئەو پارەیەش بێ گومان حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی دەیدات)، ئەو پارانەش بە سەر ئەو سەرۆك هۆزانە دابەش دەکرا، کە توانای نانەوەی ئاژاوە و پەشێوی و نیگەرانییان لە ناوچەی قەڵەمڕەوی بەریتانی هەبوو. پشوودرێژی ئێمە کاری لە

---

١- لە (یادداشتەکانی) عەلی جەودەت دا هاتووە کە بە نوێنەرایەتی ئەفسەرە عیراقییەکان چۆتە لای مەلیك فەیسەڵ لە شام، سەبارەت بەو جولانەوانەی لە دێرەزور و دواتر لە تەلەعفەر ڕوویان دەدا. مەلیك فەیسەڵ بە دوو دڵییەوە ڕازی بوو کە بە (٣) هەزار جونەیهی میسری یارمەتییان بدات.

لایەنگرانمان کرد، ئەوان لەوە نەدەگەیشتن کە بۆچی حکوومەتی بەریتانی کێشەی نەیارانمان (هیچ و پوچێکی دز و تالانکەری وەك مەولوود پاشا و دواکەوتوانی) راستەوخۆ یەکلایی ناکاتەوە، بۆچی پارێزگاری و یارمەتی بە پەلەی ئەو کەسانە ناکەین کە ئامادەن لە تەکمان بوەستن، ئەگەر دلنیامان کردن کە تۆلەیان لێناسەنرێتەوە.

بۆ چەسپاندنی رەوشەکە لەسەر بنەمایەکی ئارام، لە کۆتایی کانوونی دووەم بەرەو سەلاحیە (کە دەکەوێتە نێوان ئەلبوکەمال و خاپور) چووینە پێش. مەولوود ئەو بەرەوپێشچوونەی ئێمەی کردە بەهانە بۆ ئەنجامدانی چەند کردەوەیەکی دوژمنکارانە و رایگەیاند، کە ئەو ناتوانێت تورەیی هۆزەکان کپ بکات. لە ناوەراستی شوبات بە سەرکردایەتی ئەفسەرێکی عەرەب هێرشکرایە سەر ئەلبوکەمال، ئەمە لە کاتێدا هێلەکانی هاتووچۆ (گەیاندن)ی بەریتانی تا قائیم رووبەرووی داگیرکاری بەردەوام دەبووەوە.

سێر جۆرج ماکمۆن نووسراوێکی ئاگادارکردنەوەی ئاراستەی مەولوود کرد، لە رێگەی حکوومەتی خاوەن شکۆ، وای لە حکوومەتی دیمەشق گەیاند، کە ئەو بەرپرسە لە هەر دەستدرێژیەك کە هۆزەکان یان فەرمانبەرانی سەر بە مەولوود لە سەر سنووری کاتی ئەنجامی بدەن، هەروەها رایگەیاند کە بەردەوامبوونی یارمەتییە داراییەکانی بەریتانیای مەزن کە هێشتا بە حکوومەتی عەرەبی دەدرێت لە سەر توانای ئەو حکوومەتە لە جێبەجێکردنی رژێم و ئاسایش بەزەبر، بەندە. بەلام ئەو توندییە، هەروەك توندییەکانی بەر خۆی بێ سوود بوو، رێگە بە رەمەزان درا یان فەرمانی پێکرا بگەرێتەوە دێرەزور، مەولوود لە شوێنی خۆی لە حەلەب یارمەتی سەربازی لە سەربازە نیزامییەکان لەگەل خۆی هێنا، عێراقییەکی توندوتیژ بە حاکمی مەیادین دانرا. ئەو پرۆپاگەندانەی کە لەو مەلبەندانەوە دەردەچوون پڕ دەرمارگیری بوون و دەگەیشتنە کەربەلا و نەجەف، سەرباری ئەمانەش یارمەتی دارایی بەریتانی بۆ حکوومەتی عەرەبی لە سوریا

نەوەك هەر نەوەستا، بەڵكو برێكیشی لێ كەم نەبووە. لە كاتێكدا مەولوود سەرقاڵی هاندانی خەڵك بوو لە ناوچەكانی فوڕات بۆ جیهادكردن، ئەمیر فەیسەڵ لە پاریس گەڕایەوە، یەكسەر نامەیەكی بۆ قاهیرە نووسی و داوای لێبووردنی لەوەی كە لە دێرەزور روویداوە دەربڕی، دڵنەوایی كردن كە هەنگاوی پێویست بۆ دووبارە روونەدانەوەی رووداوی لەم چەشنە، دەنێت. بەڵام لە نامەكەدا ئاماژە بەوە كرابوو، كە سنووری كاتی بە شێوەیەكی رەمەكی موڵك و ماڵی هۆزەكان دەكات بە دووبەشەوە، ئەمەش زۆر جار دەبێتە هۆی نانەوەی ئاژاوە و تێكنەگەیشتن، بۆیە پێشنیاری پێكهێنانی لیژنەیەكی تێكەڵاو لە عەرەب و بەریتانی كرد، كە كار بۆ هەمواركردنی ئەو رێوشوێنانە بكەن كە لە كانوونی دووەم پێی گەیشتبووین. یەكسەر لە سەر پێشنیازەكە رەزامەندی پیشاندرا[1]، هەڵوێستی مەولوود لەو سەردەمەدا زیاتر عاقلانە بوو. رەمەزان شەللاش لە لایەن سەركردەی گشتییەوە بانگكرا، گەڕایەوە دێرەزور و لەگەڵ مەولوود دا یەكانگیر بوون، دواتر گەڕایەوە ناو هۆزەكەی خۆی كە زۆر لێی دوور نەبوون. دوای سەپاندنی باج و سەرانە بەسەر هۆزە نەیارەكان.

لە سەرەتاكانی مایس دەسەڵاتمان پێدرا كە بۆ خالی پێشەوە لە ئەلبوكەمال بگەڕێینەوە ئەو شوێنەی كە سنووری نێوان عێراق و سوریای پێدا درێژ دەبێتەوە.

---

١- ئەوەی لە یادداشتەكانی عەلی جەودەتدا هاتووە، وای تێدەگەین كە ((كاتێ مەولوود موخلیس حاكمی دێرەروز بووە، كۆلۆنیل لیمجن حاكمی سەربازی بەریتانی لە فوراتی سەروو داوای لە حكوومەتی دێرەروز كردووە كە شاندێك دیاری بكات بۆ ئەوەی سەبارەت بە بابەتی سنووری نێوان عیراق و سوریا دانوستاندن بكەن، مەولوود عەلی جەودەت و تەحسین عەلی بۆ دانوستاندنەكە نارد، كۆبوونەوەكە لە ((عەشارە)) سازكرا و بڕیاردرا ئینگلیزەكان لە ئەلبوكەمال پاشەكشە بكەن، لەبەر ئەوەی هۆزی ((عەقیدات))ی تێدایە، بەم شێوەیە ئەم هەرێمە عێراقییە لە شێوە و رووخساردا بە دەستی عیراقییەوە، لە عیراق كرایەوە.

## چالاکیی عێراقییەکان لە شام

پێش ئەوەی کۆبوونەوەی فوڕات گرێ بدرێت، کۆنگرەی سوری لە دیمەشق سازکرا و لە ١١ی ئازار راگەیەنرا کە فەیسەڵ مەلیکی سوریایە[١]. دەستەیەکی دیکە،

---

١- لە سەعات (٣) ی دوای نیوەڕۆی رۆژی دووشەممە رێکەوتی ٨ی ئازاری ساڵی ١٩٢٠ فەیسەڵ بە مەلیکی سوریا راگەیەنرا، نەوەك لە رۆژی ١١ی ئازار، هەروەك ویلسن لێرەدا باسی دەکات، ئەم رۆژەش وەك وەلامێك لە کۆنگرەی سوری کە لە ١٩٢٠/٣/٦ گرێدرابوو، دیاریکرا، مەلیك فەیسەڵ لەو کۆنگرەیە پێشتر گوتارێکی پێشکەش کردبوو. کۆنگرەی گشتی سوری وەك ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی دامەزراندن بوو. کۆنگرەکە نوێنەرانی سوریای گەورەی لە خۆ گرتبوو، بە سوریا و فەلەستین و لوبنان، ئەندامەکانی بە گوێرەی یاسای هەڵبژاردنی عوسمانی لە سوریا هەڵبژێردران، ئەو بەیاننامەیە لە هەیوانی تەلاری شارەوانی دیمەشق لە ئاهەنگێکی گەورە خوێندرایەوە، راگەیەنرا کە سوریا بە هەر سێ پارچەکەیەوە سەربەخۆیە، راگەیەنرا کە فەیسەڵی کوڕی حوسێن مەڵیکی ئەو وڵاتەیە. هەروەها هەموو ئینتیداب و پارێزگارییەکی لە هەر وڵاتێکی ئەوروپییەوە بێت رەتکردەوە. هەروەها داوا کرا عیراق سەربەخۆ بێت و لەگەڵ سوریا یەکگرتنێکی سیاسی ئابووری پێکبهێنن. شتێکی سروشتی بوو کە بەیاننامەکە هاوپەیمانان تۆڕە بکات، لە بەر ئەوە لۆرد (کیرزن) بە ناوی هەردوو حکوومەتی بەریتانی و فەڕەنسی بە زمانێکی توند لە بروسکەیەکدا ناڕەزایی لە سەر بەیاننامەکە گرت و رایگەیاند کە کۆنگرەی سوری دەستەیەکی شەرعی نەبوو، راگەیاندنی بڕیارەکانی لەو خاڵانەی باسکراوە، کۆسپ دەخاتە بەردەم ئەرکەکانی کۆنگرەی ئاشتی لەگەڵ تورکیا. بەڵام مەلیك فەیسەڵ وەڵامی دایەوە کە کۆنگرەکە پێشتر پێش ماوەیەك هەڵبژێردرا بوو، کۆنگرەکە کاری خۆی کردووە و بڕیاری دەرکردووە، پێشتریش بەریتانیا ناڕەزایی لە سەر دەرنەبڕیووە، ئەو کۆبوونەوەیەی کە بەیاننامەکەی لێ دەرچوو یەکەم کۆبوونەوە نەبووە، ئەو بڕگەیەی کە تایبەت بوو بە عیراق دەقەکەی بەم شێوەیە بوو. لەبەر ئەوەی شۆڕشی عەرەبی بۆ رزگارکردنی گەلی عەرەبی لە حوکمی تورکان بەرپا بوو، ئەو هۆکارانەی کە سوریا بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی خۆی پشتی پێ بەست، هەمان هۆکارن کە عیراق بۆ سەربەخۆیی خۆی پشتی پێ دەبەستێ، لەبەر ئەوەی لە نێوان هەردوو هەرێمەکە (عیراق + سوریا) پەیوەندی و پەیوەستبوونی زمان و مێژوو و

بانگەشەی عێراقی بوونی دەکرد، کۆبووەوە، ئەو دەستەیە لە ئەفسەرانی بەرەگەز عێراقی کە لە سوریا نیشتەجێ ببوون، پێکهاتبوون[1]، براکەی شەریف عەبدوڵلایان بە ئەمیری عێراق پالاوت.

لە نێوان ئەو ئەفسەرانە پیاوی بەتوانا و ئازا هەبوون، کە توانییان متمانەی ئەو ئەفسەرە بەریتانییانەی کە لە سوریا کاریان دەکرد بەدەستبێنن. ئەوانە دەمێك بوو بەو بڕوایە هاندرا بوون، کە ئینتیدابی بەریتانی بۆ سوریا نیعمەتە نەوەك ئینتیدابی

---

ئابووری و سروشتی و رەگەز هەیە، ئەمەش وا دەکات هەردوولا دەستبەرداری یەکتر نەبن، ئێمە داوای سەربەخۆیی هەرێمی عیراق بە شێوەیەکی تەواو سەربەخۆ دەکەین پێویستە هەردوو هەرێمە براکە ئیتیحادێکی سیاسی و ئابووری پێك بهێنن ((بۆ (رۆژی مەیسەلون / ساطع الحصری) و (یادداشتەکانی تۆفیق ئەلسویدی و عەلی جەودەت) بگەڕێوە)).

١- هەموو ئەو عیراقییانەی لە دیمەشق بە ناوی (کۆنگرەی عیراق) کۆببوونەوە هەموویان ئەفسەر نەبوون، بەلام زۆربەیان ئەفسەربوون. هەروەك لە ناوەکانیان دیارە:- تۆفیق ئەلسویدی (سەرۆکی کۆنگرە)، جەعفەر عەسکەری، ناجی ئەلسویدی، رەزا ئەلشەبیبی، سەعید شێخلی، سەعید مەدفەعی، تەحسین عەلی، ئیسماعیل نامق، سامی ئۆرفەلی، یوسف وەهبی، ئەحمەد رەفیق، رەشید ئەلهاشی، عەبدولەتیف فەلامی، فەرەج عەمارە، حەمدی صدرالدین، نوری ئەلقازی، سەبیح نەجیب، مەحموود ئەدیب، تەوفیق ئەلهاشی، محەممەد ئەلبەسام، ئیبراهیم کەمال، نەزیف ئەلشاوی، بەکر صدیق، عەلی جەودەت، جەمیل محەمەد مەدفەعی، مەکی شەربەتی، سابت عەبدولنور، ئەسعەد صاحب حاجی محەممەد فەیر، عەبدوللا عەلی ئەلدلیمی، عیزەت کەرخی. ئەوەی خوارەوە لە بڕیارەکانی کۆنگرەی عیراقییە، کە هاوکاتە لەگەڵ کۆبوونەوەی کۆنگرەی سوری (٨ی ئازاری ١٩٢٠): کاتێ عیراقییەکان بینیان هەڵی کارکردن بۆ عیراقی ژێر داگیرکاری بەریتانی هاتۆتەپێش، لەمبارەیەوە عیراقییەکانی سوریا بیروڕایان گۆڕییەوە، دەنگیان یەك خست. بۆیە بڕیاریان دا کۆنگرەیەك بۆ چارەنووس و داهاتووی عیراق ساز بکەن، ئەگەرچی ئەوان لە ولات دوورن و ناتوانن زۆر لەوانەی ئەو ئەرکە دەیانگرێتەوە کۆبکەنەوە، ئەمە تەنها ویستێکە بۆ دەربڕینی خواستی خەڵکی خۆیان بۆ ئەوەی بەهەر شێوەیەك بێت گوێیان لە دەنگمان بێت.

فەڕەنسی، ئەوانە کاتیان نەبوو بەشێوازی تایبەتی خۆیان ئەمە بسەلمێنن. هەر لەو سەروبەندە دا بوو کە بۆیان دەرکەوت، کە هەموو ئەو هیوایەی هەیانبوو سەرکەوتنی بەدی نەهێنا. بۆیە ئاڕاستەی دیدگایان بۆ عێراق وەرگێرا[1]. ئەوانە تەواو بڕوایان وا بوو کە بەریتانیای مەزن بەهەر شێوازێك بێت ئەو بەیاننامەی نێوان (ئینگلیز + فەڕەنسا) لە عێراق جێبەجێ دەکات، هەرچەندە شێوەی حکوومەتەکە بەو جۆرە بوو کە داگیرکاری سەربازی بەریتانی دەیخواست. ئەو ئەفسەرانە بێ ئاگابوون لەوەی کە حکوومەتی خاوەنشکۆ دەیتوانی هەموو دەسەڵاتێکی سەربازیم بۆ لە ناوبردنی هەر جۆرە حکوومەتێکی لۆکاڵی، پێ بدا، هەروەها ئەفسەرە بەریتانییەکانی سوریاش بە کەمێك پاساوەوە وەکو ئەفسەرە عێراقییەکان لە تاریکی رووچووبوون، تەواو بێ ئاگابوون لەو ئالۆزییەی کە بە هۆی پەشێوییەکانی کوردستانەوە هاتبوونە ئاراوە. ئێران دەسەڵاتێکی گەورەی پەیدا کردبوو، دەبوایە چاودێری زیاتر لە سەر هەزار دیل و پەناهەندەی جەنگ بکرابوایە، ئەفسەرە بەریتانییەکان بەو بڕوایەی کە ئەوەی پێی دەگوترێت ((سیاسە التهنید)) کە ئیدارەی مەدەنی لە بەغدا دەستی پێوەگرتبوو،

---

[1]- دوای دروستبوونی حکوومەتی عەرەبی لە سوریا، شتێکی سروشتی بوو، کە ئەوانە چاو ببڕنە وڵاتەکەیان. لێرەدا بەم بۆنەیەوە باسی ئەوەی عەلی جەودەت لە (یادداشتەکانی) نووسیویەتی لەم بارەیە دەکەین، عەلی جەودەت لە دیمەشق چاوی بە مەلیك فەیسەڵ دەکەوێت و دەڵێت : سەیری لوبنان بکە لە ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسییەکانە و عیراق و فەلەستین لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکانە، هەرچی ئێمەین، بێ شوێن و پەناگە ماوینەوە. دواتر بۆ مەلیك فەیسەڵی روونکردۆتەوە کە چۆن یاسین ئەلهاشی رفێنراوە و لە رومێلە خراوەتەوە ژێر نیشتەجێبوونی بە زۆرەملێوە. ئەوەی بۆ فەیسەڵ روونکردۆتەوە بەسەر جەمیل مەدفەعی و ئیبراهیم کەمال هاتووە، کاتێ بۆ بینینی خزم و کەسانیان سەردانی عیراقیان کرد، لەوێ حاکمی سەربازی بە دوایان دەنێرێ و داوایان لێ دەکات عیراق جێ بهێڵن. ئێمەی عیراقی لە سوریا وا هەست دەکەین حەزمان پێ ناکەن، ئەمەی لەژێر کاریگەری پڕۆپاگەندەی فەڕەنسییەکان کە دژ بە ئێمەی دەکات، لەبەر ئەو هۆکارانە بڕیارمانداوە، بچینە دێرەروز و شەڕی ئینگلیزی بکەین، کە بێ بەڵێن بوو، بەرامبەر عەرەب.

تاکە کۆسپی بەردەم هیوا و ئاواتی ئەفسەرە عێراقییەکانە، لە سەر ئەو باوەڕە هـانی ئەفسەرەکانیان دەدا. هەر لەو سەروبەندە وابوو، ئەو سەرکردانە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە تاکە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان و چاوتێبڕینە سیاسییەکانیان بریتییـە لە هێرشکردنە سەر ئیدارەی مەدەنی لە بەغدا. لە راستیدا ئـەم بۆچـوونەیان تۆزێـك پاساوهێنەر بوو، چونکە حکوومەتی خاوەنشکۆ بە شێوەیەکی بنبڕ لە سەر ئەوە رازی نەبوو، کە لە بارەی بەیاننامەی (فەڕەنسی + ئینگلیزی) کـە لـە ٨ی تشـرینی دووەم ١٩١٩ دەرچوو، ئەوەی تایبەتە بە عێراق هیچ روونکردنەوەیەك دەربکـات، هـەروەها رێگەی بە منیش نەدا ئەو کارە بکەم.

## عێراق لە پەڕلەمانی بەریتانی

کاتێ پەرلەمانی ئیمپراتـۆری بـەریتانی لـە شـوبات دەسـتی بـە دانیشـتنەکانی کردەوە، لۆرد کیرزن بە ئەنقەست وایکرد ئەو وتـارەی کـە لـە ئەنجوومـەنی لـۆردات سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە پێشکەشی کرد، ئـالۆز بێـت. کـیرزن لـە وتارەکەیـدا دەڵێت دەبوایە ئێمە پێشـوازی لـە هەڵوێسـتی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا سەبارەت بە دامەزراندنی وەك دەوڵەتێکی ئینتیـدابکراو لـە سـەر تـەواوی دەوڵـەتی عوسمانی بکەین. گرێدانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا زۆر دواکەوت، تەواوی جیهـان بـاجی ئەو دواکەوتنەیان دا. هەروەها مەسەلەی رازیبوونمان بە ئینتیدابی بەسرە بەبێ بەغدا، شتێك بوو لە دەرەوەی بەرنامەکانمان، بەڵام هیچی لە بارەی موسڵەوە نـەگوت، بـەڵام لە ئەنجوومەنی عموم، کـە دوای چـەند رۆژێکـی کـەم گریـدرا، هـەموو ئـەوەی کـە (بۆناراو) توانی بیڵێ ئەمە بوو:

((ئیدارەی مەدەنی لە عێراق سەربە وەزیری دەوڵەتە بۆ کاروباری هیند، ئیـدارەی عەسکەریش، وەزارەتی جەنگ بە سەریدا زاڵە. تـا ئاشـتی لـە نێـوان هاوپـەیمانان و تورکیا سازنەکرێت و چارەنووسـی بەشـە جیاجیاکـان کـە موڵکـەکانی عوسمـانی لێ پێکهاتبوو دیاری نەکرێت، ناتوانرێت دەست لە ئیدارەی مەدەنی بدرێت)).

سەبارەت بە سروشتی حکوومەتی داهاتوو کەس فزەی لێوەنەهات، مستەر (مۆنیتیگۆ) کە سەبارەت بە دەرکردنی بەیاننامەیەك کە نارۆشنی لە سەر پابەندییەکانی حکوومەتی خاوەنشکۆ لە هەموو لایەك بێت، دەربڕی.
لە ٢٣ی شوبات چرچڵی وەزیری جەنگ بە زیاتر ئازادانە و رۆشنییەوە لە بارەی گرفتی پابەندییە سەربازییەکانمان قسەی کرد، ئەو کات مۆنیتیگۆ وەزیری کاروباری هیند بوو لە وەزارەتی بەریتانی گوتی: عێراق بە هۆی کەفوکوڵی دانیشتوانە عەرەبەکەی ئەوانەی کاریگەر بوون بە رەوشی سوریا، شێوا. بزووتنەوەکانی هێزی نیشتیمانی لە ئاسیای بچووك لە زیاد بووندایە، لە باکووردا بەلشەویکەکان لە پێشکەوتن دان، چاوەڕوان ناکرێت یارمەتی دیکە پێشکەش بکرێت ئەگەر ئاشتییەکی راستەقینە لەگەڵ تورکیا نەبەسترێت. زیانێکی زۆرمان لە درێژایی ساڵ پێکەوتووە، من باوەڕی تەواوم هەیە کە ئێمە ئەگەر سوپاکەمان پارچە پارچە بکەین، ناتوانین هەنگاوی وا بگرینە بەر کەوا لە تورکان بکەن نائومید بن یان ئیلتیزاماتی نوێ وەربگرین، چونکە دەرامەتەکانمان لەگەڵ خەرجییەکانمان یەکسان نین..

## بەرزەفتکردنی عێراق لە ئاسمانەوە

ئەو قسانەی چرچڵ حەکیمانە بوون، بەڵام ئەو سیاسەتەی کە بانگەشەی بۆ دەکرد لەلایەن وەزارەتەوە نەکرایە پلانی کرداری. لە دوا جاردا بۆ دەورەدانی سەرکردایەتی گشتی لە عێراق بە ئەفسەرانی گەورە لە ئەفسەرانی هێزی ئاسمانی، پلانەکە کورتکرایەوە. ئەو بیرۆکەیە لەلایەن جێگری مارشاڵی ئاسمانی (سێر جوفری سالمۆند) و (کۆمۆدۆر ئەلجۆ درۆ) دوای لێکۆلینەوەیەکی وردی رەوشەکە لە ماوەی ساڵی رابردوودا، فراوان کرا. من هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨ ە وە، فڕۆکەکانم لە بری بەکارهێنانی ئامرازەکانی دیکەی گواستنەوە تا پلەی دەستبەرداربوون، بەکار هێناوە، بزوێنەری فڕۆکەکان بەو شێوەیەی کە فڕۆکەوانەکان یا سەرنشینانی ساڵی ١٩٣١ حەزیان لێ دەکرد، بۆ ئێمە ئامادە نەکرا بوون (واتە لە جۆری (بی ئەی تو سی) و

(ئار، ئەی، ئایت) و فڕۆکەی شەڕکەری بریستول (بریستول فایتەرز) و (دی ئێچ فـۆر) بوون، هەروەها هەندی فڕۆکەخانەی شوێنە دوورەکان فڕۆکەخانـەی زۆر خـراپ بـوون. هەندێ جار سەرکەشی فڕۆکەوانەکانیش پێش بڕیارەکانیـان دەکـەوتن. بەشـداریم لـە بۆردومانی هەندێ گوندی کورد کـرد، کـە دانیشـتوانەکەی حاکمـە سیاسـییەکانیان کوشتبوو، هەروەها لە ریشەکێشکردنی یاخیبوانی شوێنکەوتووانی شێخ مەحموود بـە ئاگری رەشاشەکان بەشداریم کرد. بەمەش لە سەر تواناکانی ئەو چەکە نوێیە وەستام، سەرباری ئەمەش بیرۆکەی دەستگرتن (زاڵبوون) بە سەر عێراق لە ئاسمانەوە، هەر لـە سەرەتاوە لەگەڵ دیدگای من دەگونجا و پێمخوش بوو. زۆر حەزم کرد ئـەو پلانـە کـە خۆم تێدا بەرپرسی بووم، دەست بە جێبەجێکردنی بکەم. ئەمەش دوای ئەوەی لە دوو یادداشت کە لە ماوەی ئەیلولی ١٩١٨ و نیسانی ١٩١٩ پێشکەشم کردن، سوربوونی خۆم پیشاندا. بەڵام ئەم رایە لە (سیملا) و بارەگای گشتی لە بەغدا کەمێك نـەبێت، زۆر پشتگیری نەکرا.

زۆرینەی کۆنە سەربازانی ئینگلیز (لە عێراق) لە سەر رای مـیر لیـوا (سـیلی)ن باوەڕیان بە ئاسمان نییە و لێناگەڕێن سوودی تەواو لە هێزی ئاسمانی وەرگیرێت، ئەگەر هێزێکی ئاسمانی تەواوتان هەبێت، بتوانن بە سەرپەرشتی حاکمانی سیاسی کاریان پێ بکەن، ئەوا ملیۆنەها پاوەند و هەزاران کەسیش دەست دەخەن.

لە سەرەتای ساڵەوە ژمارەی هێزەکانمان لە عێراق گەیشتە (١٧) هەزار سـەربازی بەریتانی و (٤٤) هەزار سەربازی هینـدی، هـەروەها هێزەکانمـان لـە فەڵەسـتین کـە ژمارەی دانیشتوانی بە (١٠) هێندی عێراق مەزەندە دەکـرا، گەیشـتە (١٠) هـەزار سەربازی بەریتانی و (١٣) هەزار سەربازی هیندی. تێچوونی سوپاکەمان لە هـەردوو وڵاتەکە بە بڕی (٣٥,٥٠٠,٠٠٠) پاوەندی ئیسترلینی خەملێنرا. لەسەر بنەمای ئەو راستییە، بیروڕاکانی بەرێز (وینستۆن چرچڵ) بە سوود و بونیادنەر نابێـت. سـەرباری ئەمەش ئێمە لە عێراق لە چارەسەرکردنی گرفتی هەنووکەیی نزیك نەکردەوە. نکـۆڵی لەمە ناکرێت کە بڕیاری وەرگیراو سەبارەت بە کۆنترۆڵکردنی عێراق بـە هـۆی هێـزی

ئاسمانی مەلەکی، وایکرد، پارێزگاریکردن لە ئینتیداب کارێکی مومکین بێت. چونکە خەرجی سوپا هەرچەندە ژمارەی سەربازانیش کەم بکرێتەوە، هەر دەبێتە بار بە سەر هەموو رژێمێك. هەروەها، بە هۆی درێژبوونەوەی هێڵەکانی گەیاندن هەموو هەوڵەکان بێ کاریگەر دەبن، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە هێزی ئاسمانی پادشایی نەیدەتوانی لێشاوی یاخیبوون و شۆڕش بە شێوەیەکی ئەکتیڤانە لە ساڵی ١٩٢٠ چارەسەربکات، خۆشبەختانە داواشی لێنەکرا، ئەم کارە بکات.

## رای چەرچڵ لە بارەی مامەڵەکردن لەگەڵ تورکیا

راکانی چەرچڵ کە پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، سەبارەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ تورکیا، تەواو لەگەڵ راکانم لەمبارەیەوە دەگونجا، چونکە من لە نیسانی ١٩١٩ لەمبارەیەوە یادداشتێکم نووسی، کە لێرەدا چەند بڕگەیەکی دەخەینەڕوو:

لە ٣١ی تشرینی یەکەم شەڕ راگرتن مۆرکرا، تا ئێستا هاوپەیمانان نیازەکانیان سەبارەت بە ئەستەمبۆڵ و ئەنادۆل رانەگەیاندووە، هاوپەیمانان سەبارەت بە بەشەکانی دیکەی تورکیا (وەك سوریا و ئەرمینیا)، پێ دەچێت لەسەر ئەو هەنگاوانەی کە دەبێت دەرهەق بەم بەشانە بگیرێتەبەر، رێك نەکەوتبوون. بۆیە ئەو دوو دڵیەی کە لەمبارەیە لە ئارادابوو، هیوای تورکان و ترسی مەسیحییەکانی وروژاند. موسوڵمانەکانی جیهان بە عێراقیشەوە، ئامادەبوون دەرەنجامەکانی جەنگەکە ببینن تورکیا ویلایەتە عەرەبییەکان بە ئەستەمبۆلیشەوە دەدۆڕێنێ. بەڵام موسوڵمانەکان لەلایەکی دیکەوە، لایەنگری تورك و کوردیان دەکرد و زۆر دڵتەنگ بوون بەلێکهەڵوەشانەوەی پاشماوەی ئیمپڕاتۆری تورکی لەسەر دەستی کۆنگرەی مەسیحی بۆ ئاشتی، کە لەسەر بنەمایەکی خۆپەرستان بەڕێوەدەچوو. ئەوەی پێش سێ مانگ پێمان دەکرا، ئێستا پێمان ناکرێت. لەمێشکی خەڵکان، لە رۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا گیانێکی نوێ رواوە، بۆیە لەم رۆژەدا ناتوانرێت ئیمپڕاتۆری تورکی بڕووخێنین، چونکە

ئیمپڕاتـــۆری تـــورکی بۆتـــە نموونـــەی بـــاڵای حـــوکمی دونیـــایی لەســـەرجەم وڵاتـــە دەســـەڵاتدارەکانی موســـوڵمانان. وڵاتـــانی مەســـیحی لەکاتێکـــدا ماندووشـــەکەتی جەنگەکان بوون، توانای جەنگی دیکەیان نـەبوو، ئینجـا سـەبارەت بـە ئیمپڕاتـۆری تـــورکی ڕێـــك نەدەکـــەوتن. تاکـــە چارەســـەر بـــۆ ئەمرۆکـــە ئەوەیـــە، کـــە دان بـــە ئیمپڕاتۆرییەتێکی تورکی بنرێت کەلە ئەستەمبۆڵەوە تا قـەفقاس درێژببێتـەوە، کـە چەند وڵاتۆچـکەیەکی ئەرمـەنی و نەسـتۆری[1] لـەخۆ بگرێـت، ئەسـتەمبۆڵ لـە ژێـر فەرمانڕەوایەتییـــەکی ئـــەوروپی لـــە ڕێگـــەی دەســـتەیەکی نێودەوڵـــەتی تایبـــەت بەڕێوەببرێت. ئەمەش وادەکات پابەندبین بە پاڵپشتیکردنی تورکیا، ئەمـەش بڕێکـی تەواوە بۆ ڕازیکردنی هاوڵاتییە موسوڵمانەکانمان.

لەم داننانەدا داوانەکراوە، دان بەسەروەرێتی تورکیا بەسەر وڵاتە عەرەبییەکان بنرێت، هەرچەندە چاوەڕوان دەکرێت ئەمە لـە ئـەنجامی بزووتنـەوە گەلییەکانـدا بێتەدی، هەروەها داننانەکە واناکات کە ئەستەمبۆڵ نەبێتە دەوڵەتۆچکە.

ئەم سیاســەتە وادەکــات هەنــدێ وڵات بەهەنــدێکی دیکــەوە، نــەلکێنرێت، یــان پارێزگارییان بەبێ خواستی گەلەکەی بخرێتە سەر، پێویسـتە ئـەم بیرۆکەیـە لەلایـەن پارتە سیاسییە پێشـکەوتووەکانی وڵاتـانی هاوپـەیمان بـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکاشەوە پەسەند بێت، ئەگەر بمانەوێت زامنی بەردەوامی و مانەوەمان بکـەین. بانگەشەی دەسەڵاتداری تورکی، کەلە ژێر سەرپەرشتی ڕاوێژکارانی بیانی (واباشترە لە ڕاوێـژکارانی ئینگلیـز بـن)دا بێـت، لـە ویلایەتـەکانی بـاکور، وادەکـات بەشـێوەی سنوورییەکانی باکووری عێراق (واتە کوردستان) کە لەم دواییانـەدا دەسـەڵاتدارێکی سیاسی بەپیلانی (تورکی و کوردی) کوژرا، کەم ببێتەوە.

---

١- واتە دەوڵەتۆچکەی (دویلە) ئاشوری.

## پێشنیارە دەستوورییەکان

لەوەتەی ویلسن لە نێو تەمومژی بالکێشراو بەسەر ڤێرسای هاتۆتەدەر و بینرا کە، تابلۆی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم)ی هەڵگرتبوو، هیچ شتێکی تایبەت بە عێراق بلاو نەکرایەوە. وەك موسا کەلە کێوی تور دوای بزربوونی لە تاریکی بەدەرکەوت، دوای گەڕانەوەی بینی قەومەکەی لەبڕی ئەوەی دەست بە شەریعەتی نوێوەبگرن، شەیدای خوا کۆنەکانیان ببوونەوە. بۆ رازیکردنی حکوومەتی خاوەنشکۆ، چەند هەوڵێك درا، تاکو رێگەم پێبدات لەو رێوشوێنە دەستوورییانەی کە پێشنیازکرابوون، بەردەوام بم. لە بروسکەیەکی بەرواری ١٩ی ئازاردا، داواکرابوو مۆڵەت بە پێکهێنانی ((ئەنجوومەنی یاسادانانی مەرکەزی)) بدرێت، کە مەندوبی سامی (کاتێ دەگات) سەرۆکی دەبێت، ئەندامە عەرەبەکانی ئەو ئەنجوومەنە لەگەڵ سکرتێرە بەریتانییەکان کارە جۆراجۆرەکانی دائیرەکان بەڕێوە دەبن، من جەختم لە سەر ئەوە کردەوە، کە لە سەر ئەم بنەمایە دەبێت بەیاننامەیەك دەربچێت، جا ئاشتی لەگەڵ تورکیا کرا یان نا. دواتر ئەمەشم زیاد کرد:- بەلام کۆسپی سەرەکمان ئەوەیە، لە دانانی هەر پلانێکی چاکسازی، لەگەڵ دەسەلاتدارانی سەربازی سەبارەت بە کاروبارە ئیدارییەکان دەکەوینە ناخۆشییەوە. ئەگەر حکوومەت ئارەزوو دەکات لە سەر کارەکانم بۆ ماوەی شەش مانگی دیکە لێرەدا بەردەوام بم، بە بێ ئەوەی رەوشەکە زیاتر خراپ بێت، ئەوا گومانی تێدا نییە لە کاتی جیاوازیم لەگەڵ دەسەلاتدارانی سەربازی من پێویستیم بە بڕێك یارمەتی و پشتگیری نیشتمانی دایك، دەبێت. ئەو یارمەتی و پشتگیرییە زۆر لەوە زیاترە کە لەو باوەڕەدا بووم، تا ئێستا پێویستیم پێ ی بێت.. . لە سەر ئەم بروسکەیە هیچ وەلامێکم بەدەست نەگەیشت، رای وەزارەتی دەرەوە مەحال بوو وەربگیرێت، زۆر ئامادەنەبوونی لۆرد کیرزن بە هۆی نەخۆشییەوە، وایکرد کارە گشتییەکان بە سەریەکدا کەڵەکە بێت.

## گفتوگۆ لەبارەی عێراق لە پەرلەمانەوە

دوای چەند رۆژێك لە ٢٥ی ئازار لە ئەنجوومەنی عەوام گفتوگۆیەکی زۆر گرنگ سازکرا، بەرێز (ئەسکویت) بە یارمەتی سێر (تاوزند)[١] ئەو گفتوگۆیانەیان وروژاند و جەختیان لە سەر پێویست بوونی دیاریکردنی پابەندییەکانمان لە عێراق بۆ ناوچەی بەسرە کردەوە، (کە بە دڵنیاییەوە هەڵەیە) کە بەشی هەرە زۆری تیکچوونەکانی بەرکەوتووە. بەرێز (لوید جۆرج)ی سەرۆك وەزیران، بە شێوەیەکی تەواو دژایەتی ئەو راوێژەی کرد و گوتی:

.... ئێمە لەوانەیە وڵاتەکە هەموو جێبهێڵێن و لێیدەربچین، بەڵام من ناتوانم ئەوە بکەم، کە تەنها لە بەشێکی گرنگی پاشەکشە بکەین، یان لەو بەشەی کە مژدەی خێری بۆ عێراق پێیە پاشەکشە بکەین. موسڵ بە زۆری نەوت و دەرامەتی سروشتی دەوڵەمەندە، وڵاتێکە خاوەن توانایەکی مەزنە لە جیهاندا، عێراق ئەمرۆ بە زیاتر لە دوو ملیۆن کەس دەژێت. چی روودەدات ئەگەر پاشەکشەمان کرد؟! ئێمە ئەگەر بەرپرسیارێتی ئەو وڵاتە لە ئەستۆ نەگرین، لەوانە وڵاتی دیکە ئەم کارە بکات، ئەگەر هیچ وڵاتێکی دیکەش ئەم بەرپرسیارییە لە ئەستۆ نەگرێت، ئەوا عێراق وەك هەیە دەمێنێتەوە، یان لەوەی ئێستا زۆر خراپتر دەبێت، دوای ئەو هەموو خەرجییە گەورەیەی کە لە پێناو رزگارکردنی ئەو وڵاتە لە داپلۆسینی تورکان داومانە، ئەوا گەڕاندنەوەی پەشێوی و نالەباری و واز هێنان لە بەرپرسیارێتی گەشەسەندن و نشونماکردنی نموونەی گێلایەتی و کارێکە ناکرێت هەرگیز بەرگری لێ بکرێت. ئەگەر لە حکوومەتی مەرکەزی ئێستایان مەحروم بکەین، ئەوا دەبێت حکوومەتێکی دیکەیان لە شوێنی ئەو حکوومەتە بۆ پێك

---

١- کاتێ هێزەکانی ئینگلیز لە بەسرەوە بۆ سەر بەغدا هاتن، چارلز تاوزند سەرکردەی گشتی بوو لە بەرەی جەنگی کوت، هێزەکانی تورکیا هێزەکانی تاوزندیان بۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆدا، ناچار بوو خۆی بەدەستەوە بدات.

بهێنێن. عەرەبەکان لەمبارەیەوە را و ئارەزوویان تێکەڵاو ببوو. لەو باوەڕەدام ئەوان هەموویان بەبێ جیاکردنەوە، چاوەڕوانی مانەوەی حکوومەتی بەریتانی لێرە دەکەن!! ئەوان (عەرەبەکان) سەبارەت بە جۆری ئەو حکوومەتە سەربەخۆیەی داوای دەکەن، جیاوازن. ئێمە پێشنیاری ئەوە ناکەین؛ کە ئەو وڵاتە هەروەك چۆن بەشێك بێت لە بەریتانیا حوکم بکرێت لە سەر ئەم بنەمایە قانوونی بۆ دابنرێت، ئەمە بۆچوونی ئێمە نییە. بۆچوونی ئێمە ئەوەیە؛ کە دەبێت ئەوان خۆیان حوکمی خۆیان بکەن، ئێمەش بەو پێیەی وڵاتی ئینتیدابین لە سەرمان پێویستە راوێژ و چاوساغی بەکاروبارەکان پێشکەشیان بکەین. لە بەڕێوەبردنی کارەکاندا یارمەتییان بدەین، بەڵام حکوومەتەکە دەبێت حکوومەتێکی عەرەبی بێت. رێز لەو بەڵێنە دەگرین کە لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ لەمبارەیەوە بە هاوپەیمانانمان دا، ئەگەر هیچ وڵاتێك نەچێتە ژێر بەرپرسیارێتی، بەرپرسیارێتی باڵا، لە دامەزراندنی ئەو حکوومەتە و پێشکەشکردنی راوێژ بۆی، دەرەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. بەڵام ئاخۆ جگە لە بەریتانیای مەزن هیچ وڵاتێکی دیکە ئەو بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆ دەگرێت؟! رادەستکردنی وڵاتەکە بۆ هەر لایەنێکی دیکە لەگەڵ خواستەکانی دانیشتوانە عەرەبەکەی ناکۆك دەبێت. ئەوان بە تەواو لەسەر ئەوە کۆکن، کە دووبارە دەسەڵاتی تورکی قەبوول ناکەنەوە، هەروەها ئەوان رازین بە حکومی بەریتانی و سەرپەرشتیکردنی بەریتانی. کاتێ کار دەگاتە ئەوەی یەکێ لە کوڕانی خانەوادەی شەریف بەسەریانەوە بکرێت بە دەسەڵاتدار، یان هەرکەسێکی دیکە، دەبینین لەنێوان خۆیان بەشێوەیەکی نابەدڵ دابەش دەبن، ئەمەش یەکێکە لەو سەختییانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە. ئێمە مافی ئەوەمان نییە قسەبکەین چونکە وڵاتێکی بەسەر عێراقەوە ئینتیداب کراوین. لە کاتێکدا هێشتا گرێدانی پەیماننامە لەگەڵ تورکیا تەواو نەبووە، کاتێ ئەمە بەشێوەیەکی کۆتایی بڕیاری لەسەر درا، کێشەی کێ دەوڵەتی ئینتیدابکراو دەبێت، چارەسەر کرا، بە دڵنیاییەوە داوای مافی بوون بە دەوڵەتی ئینتیدابکراوی عێراق بە موسڵیشەوە، دەکەین.

لەگەڵ ئەوەی ئەو ئەندامانەی بەشداریان لەو گفتوگۆیە کـرد، کەسـیان سـەردانی عێراقیان نەکردبوو، بەڵام کۆدەنگییەك لە نێوان سەرجەم پارتەکان لەسەر ئـەوەی کـە دەبێت ئینتیداب پەسەند بکرێت و حکوومەتی عەرەبیش پێکبهێنرێت، لە ئارادابوو. بەرێز (ئۆرمزبی گۆر) کە رەخنەکانی سەبارەت بە سیاسەتەکانی بەریتانیا لـە عێـراق بەشێوەیەکی گشتی پرۆسەیەکی دووربـین بـوو، لـەو گفتوگۆیـەی کـە سـەبارەت بـە مەزنـدەکانی سـوپا ئـەنجام دران پـێش چـەند رۆژ، رایگەیانـد کـە بـە دووبـارە بەرهەمهێنانەوەی ١٤ ملیـۆن ئیکـەر لـەو زەویانـەی عێـراق کـە رۆژێـك لـە رۆژان کشتوکاڵی تێدا دەکرا و بووبوو بە عـەمباری دانەوێلـەی جیهـان، ئـەرکێکی گـەورە دەخەینە سەر شانمان، بەڵام ئـەو زەوییانـە بـە هـۆی وێرانکـاری مرۆڤەکانـەوە بۆتـە بیابانێکی وشك. گەشەکردنی عێراق لەو شتانەیە، کە پێویستە بۆ دابەزینی نرخەکان و زیادکردنی بەرهەم لە جیهاندا حیسابی بۆ دەکرێت.

## لێژنەکەی پۆنهام کارتەر و پێشنیارەکانی

بەم شێوەیە گفتوگۆیەکە کۆتایی هات، بەڵام هێشتا لـە عێـراق هـیچ بەڵگەیـەك سەبارەت بە جۆری ئەو هەنگاوانەی کە بۆ جێبەجێکردنی ئـەو سیاسـەتانەی سـەرۆك وەزیران ئەو رۆژە جەختی لەسەر کردەوە، نەگیراوەتەبەر.

لام روون و ئاشکرا بوو، ئەو پرۆژەیەی کە لە نیسانی ١٩١٩ پێشکەشـم کردبـوو، سەرباری ئەوەی حکوومەتی خاوەنشکۆ پەسەندی کردبوو، پێ دەچێ ئێستا نیازەکـان نەپێکی. پێویستە لەسەرمان قۆناغی یەکەمی پشتگوێ بخەین و بەرەو قۆناغی دووەم بچین، بۆیە لیژنەیەك بۆ ئامادەکردنی پێشنیازەکانی دارشتنی دەستوور بۆ عێراق کـە لەگەڵ میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکان و بەیاننامەکانی حکوومەتی خاوەنشکۆ بگونجێ، دامەزرا. ئەو لیژنەیە بە سەرۆکایەتی (ئەیدگار بونهام کارتەر) سکرتێری قانوونی لـە حکوومەتی پێشووی سودان، کۆبووە. ئەندامانی لیژنەکە لە (ئەی بی هاول)[1] و (ئـیچ

---

١- دواتر بوو بە سکرتێری کاروباری دەرەوەی حکوومەتی هیند — نووسەر.

ئێم ئیف تایلور)[1] و (ئیف سی بەلفۆر — کە دواتر بووە حاکمی ویلایەتی دەریای سور لە سودان) و (ئار دەبلیو بۆلارد — خزمەتگوزاری قونسڵخانە لە رۆژهەڵات، کە زانیارییەکی دیکیۆمێنتی لە بارەی رەوشی عێراق و تورکیا پێش جەنگ و لە میانەی جەنگ هەبوو)، پێکهاتبوون.

ئەو لیژنەیە لیژنەیەکی بەهێز و ئازاد بوو، لە کۆبوونەوەکە گفتوگۆی کێشە هەنووکەییەکان بە شێوەی ئازاد لەگەڵ پیاوە دیار و ناسراوەکانی وڵات کرد، لێرەدا داوای لێبوردن بۆ هێنانەوەی ئەو بڕگانەی کە لە راپۆرتەکانیان هاتووە ناکەم، بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە ئیدارەی مەدەنی لەساڵی ١٩٢٠ و دووساڵیش بەرلەمە بۆ ئەم جۆرە کاروبارانە زۆر لەوە دوور بووە بگوترێت کوێرانە یان کەڕانەبووە ((.... ئێمە لەو باوەڕەدانین، کە پێوست بێت بۆ دڵنیا بوون لە خواستەکانی دانیشتوان، هەوڵی فراوان بخرێتە گەر، بەڵام ئێمە وای دەبینین، کە پێش ئەوەی ئەم کارە سەرکەوتن بەدەست بێنێت، کار بۆ:

١- ئینتیداب بە دەوڵەتی ئینتیدابکراو ببەخشرێت.

٢- حکوومەتێك لە ماوەیەکی کورت بە گوێرەی دەستوور پێك بهێنرێت و حکوومەتەکە کار بۆ لەناوبردنی پەشێوی و نائارامی بکات، کە جەنگ هۆکاری بووە. تا ئینتیداب نەچەسپێ، ئەستەمە بگەیتە رای رۆشنی خەڵك، زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتوان بە داگیرکاری رازین و قەناعەتیش بە شێوەی ئەو حکوومەتە دەکەن کە دەسەڵاتی داگیرکەر بۆیان دیاری دەکات. بەڵام ژمارەیەکی دیکە لە خەڵك ئەو قەناعەتەیان نییە، ئەمانەش لە هەندێ لایەنی ئایینی گرنگ، پێکدێن، هەروەها دەستەیەکی کەم لەوانەی بزوێنەری سیاسین زۆربەیان لە بەغدادان،

---

١- پێشتر سکرتێری حکوومەتی قوتابخانەکان بوون لە ساڵی ١٩٢٩ بوو بە سکرتێری لیژنەی مەرکەزی هیندی، بۆ ئەوەی لەگەڵ لیژنەی یاسایی (کە بە سەرۆکایەتی جۆن سامون بوو) لە کۆنگرەیەکی هاوبەشی ئازاد کۆببێتەوە — نووسەر.

هەروەها هەموو ئەو گرووپانەی مەیلداری تورکیان هەیە و لەگەڵ دەستەیەکی سوریی بچووك[1] بەداگیرکاری رازی نین. پێشتر کاریگەری ئەو گرووپانەمان لە بەغدا و نەجەف لە رێگەی یاریکردن بە هەستی ئایینی و نیشتمانی تاقیکردەوە، سەختە خەڵکی میانڕەو بەرگری ئەو فشارە بکەن، کە توندڕەوەکان ئاراستەیان دەکەن. رازیبوون بە چاودێری وڵاتێکی مەسیحی و ئامۆژگاری وەرگرتن لێی، بە خیانەتکردن لە دین و رەگەز دادەنرا، توندڕەکان هەموو هێزێکی عاتفی و دەمارگیری ئایینی و سەرجەم تواناکانی گەندەڵیان لابوو.

ئەمە کارێکی دادپەروەرانە نابێت بۆ لایەنگرانی سیاسەتی ئینتیداب، بەو پێیەی کافر و خیانەتکاران، سەرلەنوێ رووبەڕووی خراپەکاری ببنەوە، ئەگەر هیچ لێدوانێك لە ئێمەوە سەبارەت بە سیاسەتی ئایندە دەرنەچێت، ئەوا نابێت چاوەڕوانی ئەو پێشگیرییە تا کۆتایی بکەین. لەگەڵ ئەگەری گەڕانەوەی تورکان بۆ وڵات، ناکرێت لە دەستەیەکی زۆری خەڵك چاوەڕێی رایەکی پاك و بێگەرد بین. بۆیە دەبێت ئینتیداب جێگیر بکرێت، بۆ ئەوەی پەشێوەی قەدەغە بکات، هەروەها بۆ ئەوەی حکوومەتی بەریتانی بتوانێ سیاسەتەکان دیاری بکات و روونیان بکاتەوە.

لە سەر ئەم بنەمایە ئامۆژگاری دەکەین کە ئینتیداب بەزووترین کات بسەپێنرێت، سەبارەت بەو شێوازەی کە میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکانی تێدا هاتووە، کە دەبێت دەوڵەتی ئینتیدابکار بەڵێنی بە کۆمەڵەی نەتەوەکان بدات کە لە بری ئەو رێنمایی و ئاڕاستەی عێراق بکات. لەو باوەڕەداین سوودبەخش دەبێت، ئەگەر دەوڵەتی ئینتیدابکار دەسەڵاتی زەرووری جێبەجێکردنی ئینتیدابەکەی هەبێت. واتا هەروەك میساکە چەسپاندوویەتی، دەبێت بتوانێ (خۆشگوزەرانی و گەشەپێدانی دانیشتوان) دابین بکات.

---

١- لەوانەیە مەبەستی لیژنەکە لەم دەستەیە، کۆمەڵەی ئەفسەرانی عیراقی بێت، کە لە شۆڕشی عەرەبی بەشدارییان کرد و لە حکوومەتی فەیسەڵ لە شام بوونە کار بەدەست.

پێدەچێت، دوای سەپاندنی راستەوخۆی ئینتیداب و دڵنیـابوون لـە خواسـتەکانی دانیشتوانەکەی، سەختی زۆر گەورەمان بێتەرێ. راستە بەیاننامەیەکی دیاریکراو بـێ پەردە، لە بارەی ئەو مەرجانەی کە حکوومەتی خاوەنشکۆ ئینتیـدابی لـە سـەر ئـەو وڵاتە پێ قەبووڵ کردووە، دەردەچێت.

ئەمەش سنوورێك بۆ هەمـوو ئەوانە دادەنێت، کە تەقە بە تاریکییەوە دەنێن، بەڵام کاریگەری پیلانەکانی تورکیا و باری شێواوی لە سوریا و ئەو کۆت و بەندە زەرووریانەی بارودۆخی جەنگ لـە عێـراق داسـەپاندیان، هەسـتکردن پێیـان بـۆ ماوەیەك بەردەوام دەبن. ئەمە سەرباری ئەوەی کـە خـەڵکانێك هـەن، لـە سـەر گفتوگۆی ئازاد و رادەربڕین بۆ خەڵك بە یەکجاری رانـەهاتوون، بۆیـە چـاوەڕوان دەکرێت لەو لایەنانەی کە لە بارەی بابەتە گرنگـەکانی وەك دەسـتوور را بـدەن، پێویستە لە سەریان بۆ هەڵی بینیی حکوومەتی دەستووری، خۆیان ئامادە بکەن، ئـەویش لـە پێنـاو لێکۆڵینـەوە لـە دەرەئەنجامـەکانی هـەر بڕیارێـك کـە لەوانەیە بیدات.

لە بەر ئەمە، پێشنیاز دەکرێت، رای ئەنجوومەنی یاسادانان لە بارەی دەستوور دڵنیا بکرێت، پێویستیش ناکات ئەم کارە لە پڕ رووبدات. هەروەها پێویستە لـە کاتی بڵاوکردنەوەی وردەکارییەکانی هەڵبژاردن، کە داوا لە ئەنجوومەن دەکرێـت، پێویستە ئەم کارە لەکاتێکدا ئەنجام بدرێت لە گرێدانی دانیشتنی سێیەم زیاتر دوا نەکـەوێت، گفتوگـۆی دەسـتوورەکە (لـەو ئاسـتەی کـە مەرجـەکانی ئینتیـداب سەپاندوویەتی)، حکوومەتی وڵات تا ئەو کاتە بە گوێرەی دەستووری کـاتی کـە کورتەکەی لە خوارەوەیە، بەڕێوەدەچێت. واباشترە مەندوبی سامی ئەو دەسەڵاتەی هەبێت، یەکەم ئەنجوومـەن هەڵبوەشـێنێتەوە و رەوشـی دەسـتوور بخاتـە بـەردەم ئەنجوومەنی دواتر.

## مافەکانی دەوڵەتی ئینتیدابکار (المنتدبە)

ئێمە لەو باوەڕە داین، ئەو وەسیقەیەی کە شەرعییەت دەدات بە دەستوور پێویستە ئەوە روون بکاتەوە، کە دەوڵەتی ئینتیدابکار دەسەڵاتی پێویستی هەیە، بۆ جێبەجێ کردنی ئینتیداب.

بەڵام سەبارەت بە کاروباری دەرەوە و پەیوەندییە دەرەکییەکان، بە پەیماننامە و جەنگەکانیشەوە، پێویستە مافی دەوڵەتی ئینتیدابکار بێت قسەی لێ بکات. سەبارەت بە کاروباری ناوەخۆشی، دەوڵەتی ئینتیدابکار لەو کاروبارانەی کە بۆ خۆشگوزەرانی خەڵك و پێشکەوتنیان بە گرنگی دەزانی، مافی خۆیەتی لە سەر راوەرگرتنی، سوور بێت (هەروەك چۆن لە میساقی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا هاتووە).

ئەگەر ئەو دەسەڵاتانە لە دەستوور زامن کران، ئەوا زۆرێك لەو لێکحاڵێنەبوونانەی کە لە داهاتوو روودەدەن، دەکرێت وەلا بنرێن. زۆرتری ئەو ئۆپۆزسیۆنەی کە ئێستا لە میسر بوونی هەیە، بۆ ئەو رەوشە نادیاریکراوەی بەریتانیا لەو وڵاتە دەگەڕێتەوە.

## پاڵاوتنی پادشایەك بۆ عێراق

ئاسانترین ئامرازێك بۆ دامەزراندنی حکوومەتێك کە وەڵامی بەیاننامەکان و لێدوانەکانی حکوومەتی بەریتانی بداتەوە، ئەوەیە کە ئەمیرێك لەسەر ئەو حکوومەتە دابنرێت، کە حەز بە هاوکاری دەوڵەتی ئینتیدابکار بکات و لای دانیشتوان پەسەند بێت، ئەگەر بکرێت ئەو جۆرە کەسە بدۆزرێتەوە.

گومانی تێدا نییە، کە پیاوماقوڵانی وڵات سەبارەت بەوەی ئاخۆ حەزدەکەن ئەمیرێك بە سەریانەوە دابنرێت یان نا، زۆربەی هەرە زۆریان دژی دانانی ئەمیر بوون، لە وڵاتدا کەسێکی تەواو پایەبەرز و دیار لەوەتەی بۆ دوایین جار رای پیاوماقوڵان وەرگیرا بۆئەوەی وەك ئەمیر پەسەند بکرێت، نییە. ئەوانەی لایەنگری دانانی یەکێك لە کوڕانی شەریفی مەککە بوون گرنگی و هێزیان زیاد بوو، ئەمەش بە هۆی

سەرکەوتنەکانی فەیسەڵ لەو کاتەدا و داوا کردنی سوریا، هەروەها بە هۆی دوورخستنەوەی پالێوراوەکانی دیکەوە.

ئێستا ئەگەر کێشەی دانانی ئەمیرێك بۆ یەکێك لە ئەنجوومەنەکان بخرێتە روو، لەو باوەڕەداین کە وەڵامەکە بە ئەریٚ دەبێت و عەبدوڵڵا یان هەر کوڕێکی دیکەی کوڕانی شەریف هەڵدەبژێردرێت، ئەم قسەیە بە هەر بارێکی دیکەش بێت، دوای چەندین مانگی دیکەش بێت، هەر بەهەمان شێوەیە، ئەگەر کەرتبوونە ئایینییەکان لە وڵات بە هەند وەربگرین، ئەگەر ئەو ئیرەییەی لە نێوان کەسایەتییە لۆکاڵییەکان بە هەند وەربگرین. هەموو ئەوانەی وەك پالێوراو ناویان هات، ئەگەر دەوڵەتی ئینتیدابکار پاڵپشتییان نەکات، ناتوانن لە پۆستەکانیان بمێننەوە. هەروەها ئەو ئەمیرەی کە ئینتیداب بە ئەمانەت و لایەنگری وەرنەگرێت لە لایەکی دیکەوە دەبێتە سەرچاوەی تێوەگلانی دەوڵەتی ئینتیدابکار و لاوازکردنی وڵات، ئەگەر ئەو چیرۆکانەی لە بارەی پلە و پایە و دامەزراندن کە عەبدوڵڵا بەسەر لایەنگرانی سوری دابەشی کردوون، راست بێت، یان بە ناوی ئەوەوە دابەش کرابێت، ئەوا مومکین نییە ببینین یەکێ لە خانەوادەی شەریفی مەککە لە عێراق ببێت بە ئەمیر، ئەو دامەزراندنانە تا دوا ئەندازە لای ئەمیرانی نەجد و سەرجەم حاکمە عەرەبە سەربەخۆکان نەخوازراو دەبێت. بە دیدی ئێمە ئەو خاڵانە، بەهانەکانی کە پێشترباسمان کرد بە هێز دەکات بۆ پاساوی دواخستن.

لە پاشماوەی ئەو راپۆرتەدا وامان دانا، کە لە ماوەی دەستووری کاتیدا هیچ ئەمیرێك لە وڵات نابێت.

## ئەنجوومەنی دەوڵەت[1] یان ئەنجوومەنی وەزیران[2]

١- پێمان باشە ((ئەنجوومەنی دەوڵەت)) پێك بهێنرێت بۆ ئەوەی ببێتە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی سەرەکی لە وڵاتدا، هەروەها پێمان باشە ئەنجوومەنێکی یاسادانان پێك بهێنرێت، دواتر روون دەبێتە.

---

1- Council of State
2- Council of Ministers

٢- پێمان باشە ئەنجوومەنی دەوڵەت لە سەرۆكێك و نزیكەی ١١ ئەندام پێك بێت، ئەوانە لەلایەن مەندوبی سامی دادەنرێن (دادەمەزرێن) و هەر كاتێكیش بیەوێت لایان دەبات.

٣- سەرۆكی ئەنجوومەنەكە عەرەب دەبێت، یەكەم سەرۆك تا ئەو كاتەی كێشەی دەستوور دەدرێتە ئەنجوومەنەكە لە پایەی خۆی دەمێنێتەوە، پێویست ناكات پەیوەندی بە هیچ كارێكی دائیرەكانەوە هەبێت، لەبەرئەوەی سەرۆكی دەوڵەتەكە عەرەبە، بۆیە پێویستە پیاوێكی خاوەن دەسەلات و پایەبەرزی كۆمەڵایەتی بێت، كاتی ئەوەی هەبێت ئەركە كۆمەڵایەتییەكان جێبەجێ بكات، لەوانەیە دۆزینەوەی ئاوا پیاوێك، كە حەز بە كاركردن لە دائیرەكان و توانای كاركردنی لە دائیرەكان هەبێت پەیدا بكرێت.

٤- ئەندامانی ئەنجوومەنەكە یان دەبێت نوێنەری دائیرەیەك لە دائیرەكانی دەوڵەت بن یا سكرتێر بن لەو دائیرانە، ئەو ئەندامەی كە بە ناچاری ناتوانێت ئامادەبێت، جێگرێك لە بری ئەو ئامادە دەبێت.

٥- نابێت دەستوور ژمارەی ئەندامە عەرەبەكان و ژمارەی ئەندامە بەریتانییەكان دیاری بكات. ئێمە لەلایەنی كردارییەوە بە باشی دەزانین كە زۆرینەی ئەندامەكانی لە سەرەتاوە لە بەریتانییەكان بێت. ئەگەر كۆی ئەندامەكان جگە لە سەرۆك گەیشتە یانزە ئەندام، پێشنیاز دەكەین، كە ژمارەی ئەندامە بەریتانییەكان لە سەرەتاوە (٦) شەش ئەندام بێت و ژمارەی ئەندامە عەرەبەكانیش (٥) پێنج ئەندام بێت. ئەو دائیرانەی نوێنەری راستەوخۆیان لە ئەنجوومەنەكەدا نییە، ئەندامێك یان دوو ئەندام نوێنەرایەتییان دەكات، ئەگەر سكرتێری بازرگانی لە نێوان ئەندامەكان نەبن، بۆ نموونە دەكرێت سكرتێری ناوەخۆ نوێنەرایەتییان بكات.

٦- نابێت سەرۆك دەنگ بدات، تەنها لەو بارانەدا نەبێت، كە دەنگەكان یەكسان دەبن.

٧- مەندوبی سامی بۆی هەیە بڕیاری زۆرینەی ئەنجوومەنەكە رەت بكاتەوە، لەسەر ئەم بنەمایە بڕیاری مەندوبی سامی، بڕیاری ئەنجوومەنە بۆ هەموو مەبەستێك.

٨- ئەنجوومەنی دەوڵەت، دەسەڵاتی جێبەجێکاری سەرەکی دەبێت، پێویستە بڕیارەکانی دەوڵەتی جێبەجێکردن بە ناوی ئەنجوومەنی دەوڵەتەوە بێت، هەروەها بڕیارە جۆراوجۆرەکانی دائیرە جێبەجێکارەکان، کە بۆ خەڵك ئاشکرا دەکرێن پێویستە بە ناوی ئەنجوومەنی دەوڵەتەوە، دەربچێت.

٩- سەرەتا سکرتێری بەریتانی سەرۆکی هەموو دائیرەیەکی جێبەجێکار دەبێت، ئەندامانی عەرەبی ئەنجوومەنەکە دەخرێنە سەر دائیرە جۆراوجۆرەکان، سکرتێر لە هەموو کاروبارە گرنگەکان داوای راوێژیان لێ دەکات و هەموو ئەو نووسراوانەی کە بۆ ئەو دائیرەیە دەگەڕێنەوە، لە بەردەستیان دادەنێت. مافی ئەوەی هەیە هەر ناکۆکییەك کە لە نێوان رای خۆیان و رای سکرتێرەکان روودەدات، بۆ ئەنجوومەنی دەوڵەتی بگەڕێننەوە، بەڵام دائیرەکانی دیکە (جگە لە دائیرە تەکنیکییەکان وەك ئەشغال) کە لە نێوان ئەندامەکانیان، ئەندامی عەرەبیان نییە، ئەوا بە شێوەیەکی ئاسایی راوێژکارانی عەرەب یان یاریدەدەرانی عەرەبیان بۆ دادەمەزرێت.

١٠- پێویست ناکات ئەندامە عەرەبەکانی ئەنجوومەنی دەوڵەت لە نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی یاسادانان، هەڵبژێردرێن، بەڵام ئەوان دەبن بە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنەکە و مافی دەنگدانیان دەبێت. سکرتێرە بەریتانییەکانی دائیرەکان و سەرجەم سەرۆکەکان، مافی بەشداریکردنی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی یاسادانانیان هەیە و بۆیان هەیە گفتوگۆش بکەن، بەڵام مافی دەنگدانیان نابێت.

## ئەنجوومەنی یاسادانان - دەستوورەکە

١- لەو باوەڕە داین، پێویستە ئەنجوومەنی یاسادانان هەڵبژێردرێن، یان وەکو بۆی دەگەڕێنەوە، لەلایەن دامەزراوە لۆکاڵییەکان، کە خۆیان دامەزراوەی هەڵبژێردراون، دیاری بکرێن، بەڵام نابێت ئەمە لە سەر ئەندامە عەرەبەکانی ئەنجوومەنی دەوڵەت جێبەجێ بکرێت. هەروەها ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوانە پێویستە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی یاسادانان بن. لە ڕاستیدا ئەنجوومەنە لۆکاییەکان

(المجالس المحلية) ی ئێستا زیاتر نوێنەرایەتی خەڵکیان دەکرد، لەوەی کە بە هەڵبژاردن بن بە ئەندام، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستەی دیاریکراو، دامەزرابوون، بۆیە ئەو ئەندامانەی ئەنجوومەنی یاسادانان، کە هەڵی دەبژێرێت، ڕووبەرووی تانەلێدان و تاوانبارکردن دەبێتەوە، بەو پێیەی کە ئەندامەکانی لە پاڵێوراوەکانی دەسەڵاتدارانی بەریتانین. شێوازی هەڵبژاردن پێویستی بە لێکۆڵینەوە و ڕاوێژ لەگەڵ دەسەڵاتی لۆکالی هەیە- ئێمە لەو پێگەیەدا نین، کە بتوانین ڕاسپاردەی کۆتایی لەمبارەیەوە پێشکەش بکەین. بەڵام لە پاشکۆی (سی)دا ڕێگاکانی هەڵبژاردن دەخەینە ڕوو، کە پێمان وایە ڕێگای کردارین، ئەمەش دوای ئەوەی لەگەڵ بارودۆخی ناوەخۆیی دەگونجێ، هەمواردەکرێت.

٢- پێکهاتەی دروستی ئەنجوومەنی یاسادانان، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، بۆیە بە شێوەیەکی کاتی پێشنیاز دەکەین کە دەبێت ئەنجوومەنەکە ئەمانە لەخۆ بگرێت:

أ- ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی شارو دێهاتەکان، دەبێت لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانەکەیان بگونجێت. ئەمەش لە سەر بنەمای نوێنەرایەتی کردنی هەر ئەندامێك بۆ هەر (٥٠) هەزار کەس.

ب- ئەندامە هەڵبژێردراوەکان نوێنەرایەتی تایفە یەهودی و مەسیحییەکان دەکەن.

ج- ئەندامە عەرەبەکانی ئەنجوومەنی دەوڵەت، وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، دەبێت ئەندامی هەمیشەیی بن.

٣- بەپشتبەستن لە سەر ئەو بنامایانەی سەرەوە، بە گوێرەی ژمارکردنی کۆی ئەندامەکانی ئەنجوومەنی یاسادانان، بە ئەندامە هەمیشەییەکانی ئەنجوومەنی دەوڵەتیشەوە، دەبێتە نزیکەی (٥٠) ئەندام.

٤- پێویستە سەرۆکی ئەنجوومەنی یاسادانان عەرەبی بێت و لەلایەن ئەنجوومەنی دەوڵەتەوە بپاڵێورێت - مەرج نییە سەرۆك ئەندامێکی هەڵبژێردراو بێت، چونکە لەوانەیە لە نێوان ئەندامە هەڵبژێردراوەکاندا پاڵێوراوێکی گونجاو بۆ ئەم پۆستە بەدەست نەکەوێت.

٥- سەربارى ئەو بارودۆخە ڕێگرانەی کە سکرتێرە بەریتانییەکانی دائیرەکان کاری تێدا دەکەن، سەختی لە دۆزینەوەی ئەنـدامانی عـەرەبی لێهـاتوو، بـۆ ئەنجوومـەنی جێبـەجێکار، ئـەو سـکرتێرانەی مـافی ئامـادەبوون و بەشـداریکردنی گفتوگۆکـانی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی جێبەجێکاریان هەیە، هـەروەها مـافی دانـانی کارڕاییـان هەیە، بەڵام مافی دەنگدانیان نییە.

٦- پێویستە سکرتێری هاوبەشی بەریتانی بۆ ئەنجوومەن هەبێت، بـۆ ئـەوەی لـە کاروباری پەیوەندیدار بە ئیدارەی ژمێریاری و بنەماکانی یارمەتی بدات.

٧- ئەندامانی ئەنجوومەنی یاسادانان دەرماڵەی تایبەت بە هەر دانیشتنێك وەردەگرن.

## ئەنجوومەنی یاسادانان – ئەرکەکان

١- دەکرێت یاسای بنەڕەتی میسری ساڵی ١٩١٣ بە چەند هەموارکردنێك تێـدا، بە نموونەیەك وەربگرین، کە دەستی پێوەبگرین.

٢- ئەنجوومەنی دەوڵەت یاساکانی دەردەچوێنێ و باج دەسەپێنێ، ئەمەش:

أ- دوای ئەوەی ئەنجوومەنی یاسادانان پەسەندی دەکات.

ب- بەڵام ئەگەر ئەنجوومەنی یاسـادانان تێپەڕانـدنی یاسـای بـەو ڕێگایـەی کـە ئەنجوومـەنی دەوڵـەت داوای لێکـراوە، ڕەت بکاتـەوە، ئـەوا ئەنجوومـەنی دەوڵـەت دەسەڵاتی ئەوەی هەیە، بەبێ ڕەزامەندی ئەنجوومەنی یاسادانان، دوای تاوتوێکردن لە نوێوە یاسایەکی دیکە دەربکات.

ج- دەکرێت دەقێکی تایبەت بەو پرۆژە یاسـایانەی کـە پێشکەشـی ئەنجوومـەنی یاسادانان کراون، دابنرێت، ئەو پرۆژە یاسایانە بە (پەسەند کراوی) لە قەڵـەم بـدات، ئەگەر ماوەیەك لە ئەنجوومەن مانەوە و تاوتوێ نەکران، بەڵام ئەگەر بەر لە مانەوەیان ڕەتکرانەوە، ئەوا بڕیاری ڕەتکردنەوە، کاری پێدەکرێت.

٣- هەروەك لە دەستووری تورکیدا هاتووە، ئەنجوومەنی دەوڵەت بۆی هەیە یاسای کاتی دەربکات، بە مەرجێك ئەو یاسایانە بخرێنە بەردەم ئەنجوومـەنی یاسـادانان لـە یەکەم دانیشتنی ئەنجوومەن دوای دەرچوونی یاساکان.

٤- ئەندامەکان جگە لە بابەتی تایبەت بە دەستوور و باجەکان مافی ئەوەیان هەیە هەر چ یاسایەك پێشکەش بکەن.

٥- ئەنجوومەنەکە دەسەڵاتی تێپەڕاندنی ئەو پێشنیازانەی هەیە کە تایبەتن بە کاروباری ناوەخۆی عێراق، ئەگەر حکوومەت بەم پێشنیازانە رازی نەبوو، ئەوا لە سەری پێویستە هۆکارەکان روون بکاتەوە.

٦- پێویستە بودجە (الميزانیە) بە مەرسومێکی ئەنجوومەنی دەوڵەت دەربچێت، ئەمەش دوای ئەوەی دەدرێتە ئەنجوومەنی یاسادانان تاکو راوێژ و تێبینی خۆی لە سەر بدات، ئەگەر ئەنجوومەنی دەوڵەت بە راوێژە پێشکەشکراوەکان رازی نەبوو، پێویستە هۆکارەکانی ئەمە بەدەستەوە بدات. نابێت باج زیاد بکرێت یان باجی دیکە بسەپێنرێت، تەنها لە رێگەی یاساوە نەبێت.

٧- پێویستە حیساباتی ساڵانە پێشکەش بکرێت، تاکو تێبینی لە بارەیان بەدەربخرێت.

٨- پێویستە ئەندامان بە دەستنووس پرسیارەکانیان بکەن.

سەرباری پێداچوونەوەی دەستوور، کە لە سەرەوە دەقەکەی باسکرا، ئامۆژگاری دەکەین، کە پێویستە لە کۆتایی هەموو چەند ساڵێك (حەوت ساڵ بۆ نموونە)، سەبارەت بە چونیەتی بەڕێوەچوونی سیستەمی حکوومەت، زانیاری بدرێت. هەروەها ئامۆژگاری دەکەین، کە پەروەردە و فێرکردن و هەموو کاروبارێکی پەیوەندیدار بە پەروەردە و فێرکردن فراوان بکرێت، ئەمەش لە پێناو پێشکەشکردنی راسپاردە لە بارەی هەموارکردنی نیزامی حکوومی و ئەو بوارەی کە نیزامی حکوومی تەواو دەکات، هەروەها بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی حکوومی زاتی یان کوت و بەندکردنی. پێویستە حکوومەتی خاوەن شکۆ بەم کاری زانیاری وەرگرتنە هەلبستێ، ئەگەر ئەو بیرۆکەیە بڕیاری لێدرا، پێویستە رێوشوێنەکان بە شێوەی زنجیرەی بەبێ ئەوەی بخرێتە ناو وەسیقەی دەستوورەوە، بگیرێتەبەر[١].... راپۆرتەکە کۆتایی هات.

---

١- جۆرج کیرك لە پەرتووکی (کورتەی مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) سەبارەت بە پرۆژەی ئۆتۆنۆمی دەڵێت: ئەوەی کە ویلسن لە هەموو بۆنەیەکدا دڵی پێخۆشە و دەیکات بە بنەمایەك بۆ بەرگری لە

لە ٢٧ی نیسانی ١٩٢٠ بروسکەیەکی تایبەتیم لە بارەی ئەم راپۆرتە بۆ وەزارەتی هیند کرد، هەروەها داوام کرد رێگە بدەن بە دەرکردنی بەیاننامەیەکی گشتی لە بەغدا لە سەر ئەم بنەمایە لە نزیکترین کاتدا.

## چاوەڕوانی

وەزارەتی هیندی حەزی دەکرد، هەر بەیاننامەیەك بێت لە بارەی داهاتووی عێراق، دەربکات، لە بەیاننامەکەدا کاروبارە دیارەکان روون بکاتەوە، تا ئەو کاتەی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ تورکیا گرێ دەدرێت و مەرجەکانی ئینتیداب جێگیر دەبێت — بەڵام وەزارەتی دەرەوە لە بەرامبەر ئەمە سستی و تەمبەڵی نواند، لە ٧ی حوزەیران، سەرۆك وەزیرانی ئەنجوومەنی عەوام ئەم مەرامەی پێ راگەیەنرا[١].

---

خۆی و لۆمەکردنی حکوومەتەکەی ئەوەیە: هەر چەند ویلسن دەیگوت عەرەبە دیارەکانی عێراق، لەو باوەڕەدابوون کە پێشنیازەکان شۆڕشگێڕین و بە نەوەیەك بەر لە ئێستا هاتووە، لۆرد کێرزن (وەزیری دەرەوە) لە لێدوانێکی لە سەر ئەم رایەی ویلسن دەڵێت: ئەو حکوومەتەی کە پێشنیازکراوە پێکبهێنرێت بە حکوومەتێکی عەرەبی دانانرێت، کە یارمەتی و راوێژ لە بەریتانییەکان وەربگرێت، بەڵکو بریتییە لە حکوومەتێکی بەریتانی بەڵام چەند رەگەزێکی عەرەبی خراوەتە سەر.

١- ئەم هەست کردنە بە یاسا، دوای پەشێوییەکانی کە لە فەلەستین روویاندا، رێگەی لە دامەزراندنی (هێربرت سمۆئیل) نەگرت، ببێت بە مەندوبی سامی لە فەلەستین و لە سەرەتای مانگی تەموز پێش ئەوەی رابگەیەنرێت و رێککەوتننامەی ئاشتی گرێ بدرێت، حکوومەتی مەدەنی لە ناوبرد (نووسەر)

# بەشی دووەم

## پەسەند کردنی ئینتیداب و دواتر

## هەواڵەکانی ئینتیداب

لە یەکی ئایاری ساڵی ١٩٢٠ هەواڵمان پێگەیشت، کە بەریتانیای مەزن لە کۆنگرەی (سان ریمۆ) رازی بووە، ئەرکی ئینتیداب بە سەر عێراقەوە وەربگرێت. بڕیارم دا راگەیەنراوێکی فەرمی لەمبارەیەوە، دەربکەم، بۆ ئەوەی رۆژنامەکان لە هەمان کاتدا لە پاڵ بروسکەکانی رۆیتەرز کە ئاماژەیان بۆ دەکات، بلاویان بکاتەوە. نەدەتوانرا زۆر قسەی لە بارەوە بکرێت، چونکە داهاتووی موسڵ هێشتا بڕیاری لە بارەیەوە نەدرابوو، هەروەها پێشنیازە دەستوورییەکانمان هێشتا لە بواری لێوردبوونەوە بوون، بەڵام دەبوایە شتێك لە لایەنی تایبەتمەند چ بە مۆڵەتی ئەوان بێت چ بێ مۆڵەتی ئەوان، لە بارەی ئەو بەیاننامەیەی کە لە (سان ریمۆ) دەرچوو، بگوترێت. ئەمەش دەقی راگەیەنراوەکەیە:

## ئینتیداب بەسەر عێراقەوە

رۆیتەرز لە لەندەن رایگەیاند کە کۆنگرەی سان ریمۆ بڕیاری داوە کە ئینتیداب بە سەر عێراق و فەلەستین بخاتە ئەستۆی بەریتانیا، هەروەها فەرەنساش ئینتیدابی سوریا بکات، خەڵکی عێراق بەوە دڵنیا دەکاتەوە کە حکومەتی بەریتانیا بەو ئەرکەی خراوەتە سەر شانی رازی نەدەبوو ئەگەر بە تەواوی درکی بە بەرپرسیارێتیەکانی لەمبارەوە، نەکرد بێ. رەوشی دەوڵەتی ئینتیدابکراو وا دەخوازێت، داواکاری پێویست

لە پێناو جێبەجێکردنی ئامانجەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان پێشکەش بکات، کە وڵاتە ئینتیدابکارەکە لە ژێر سەرپەرشتی ئەودا کار دەکات. ئەو نموونە باڵایەی کە پێویستە بکرێتە ئامانج، دروستکردنی دەزگایەکی سیاسی تەندروستە، کە رای گشتی تەندروست بەڕێوەی ببات و بەرزەفتی بکات. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، هەر تەنها چاودێری کردنی گەشەسەندی ماددی لە وڵاتە ئینتیدابکراوەکە بەس نییە. ئەرکی دەوڵەتی ئینتیدابکارە کە رۆلی چاودێرێکی حەکیمی دووربین بگێریت و راسپاردە رادەستکراوەکە (واتە وڵاتە ئینتیدابکراوەکە) رابهێنێت و ئامادەیان بکات، بۆ ئەوەی شوێنی گونجاوی خۆیان لە جیهانی مرۆڤایەتی بگرن. عێراق بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لە حوکمی خراپ ناڵاندوویەتی، ئەمەش وایکردووە لەو ماوەیەیەدا گەشەی دانیشتوانەکەی و بەرهەمی زەوییەکەی بووەستێ یان هەروەك خۆی ماوەتەوە. ئەو پەیکەرانەی کە بەدرێژی و پانی وڵاتدا بڵاوبووتەوە، بەڵگەی رابردوون، لە سەر گەورەیی ئەو شارستانییەی کە باپیرانی دانیشتوانی ئێستا پێکیان هێناوە و ئەو دەرامەتانەی کە تا ئێستا کەمی نەکردووە. هێزە داهێنەرەکەی دانیشتوان لە لایەن حاکمە سیاسییەکانییەوە (عوسمانییەکان) لە کارکەوتووە، بە هۆی ئەوەی پشتگوێیان خستووە، گوێیان پێ نەداوە.

ئاوەدانکردنەوە و بوژاندنەوە، کاری تەنها رۆژێك نییە، بەڵام پێشکەوتن پێویستە خێرا بێت. ئەمەش بە بوونی رەگەزی عەرەبی، کە خێرا فێر دەبێت، شەیدابوونی بەرژەوەندی و سوود لە داهێنراوەکانی زانستی نوێن.

وا خەریکە ئاماژەکانی بوژاندنەوەکە لە هەموو شوێنی سەرهەڵدەدات، ئارامی شوێنی پەشێوی گرتۆتەوە، زەوییە وشك و برینگەکان، بە پیت کران، هەژار لە داپلۆسین گیانی ئارام بوو، دەوڵەمەند لە ئارامیدا چێژی لە سامانەکەی دەکرد، ئەم دەرەنجامانە بەبێ یارمەتیدانی خەڵکان و یاریدەرانی نێوانیان نەدەتوانرا بەدەست بهێنرێت، حکوومەت لەسەر ئەو گیانە یارمەتیدەرە دەژیا. دامەزراندنی ئیدارەیەکی مەدەنی بوارێکی فراوانتر و بەردەوام بە توانا لۆکاڵییەکان دەدات، لە کاتێکدا

بڵاوبوونەوەی زانیارییەکان، وا لە دانیشتوانی عێراق دەکات، کە سـوود لـەو هەڵانـە وەربگرن کە داهاتوو بـۆی هـەڵگرتوون. هـەروەها وڵاتـی ئینتیـدابکار بـە گەشـە و پێشکەوتنی (وڵاتی ئینتیـدابکراو) بـۆ وڵاتێکـی سـەربەخۆ و پێگەیشـتوو دڵخـوش دەبێت. دەوڵەتی پاسەوان هەروەها بە پەرۆشەوە سەیری ئەو پێشـکەوتنە سیاسـییەی کە ئازاد و پایەکانی چەسپاوە دەکات، لێرەوەیە بەڵگەی سەرکەوتنی ئەو کـارەی کـە وەئەستۆمان گرتووە، لێرەوە، دەبێت بنەمای رەگ داکوتاوی نیەت باشـی هاوبـەش و خۆشەویستی بەردەوام بدۆزرێتەوە. کۆتایی هات.

لە ٥ی ئایار رێنمـایی لـە بـارەی بڵاوکردنـەوەی بەیاننامـە بـەم دەسـتەواژانەی خوارەوەم، بەدەست گەیشت: لەو دانیشتنەی کە کۆنگرەی ئاشـتی لـە سـان ریمـۆ بـۆ یەکلایی کردنەوەی مەرجەکانی پەیمان بەستن لەگەڵ تورکیـا، گرێیـدا، هـەنگاوەکانی داماڵینی موڵکەکانی سوڵتان تا هەتا هەتایە لەو وڵاتانەی عەرەبی تێدا نیشتەجێیە، وەرگیراوە، ئەمەش بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی کە پێیان دراوە، عێراق بە هـۆی فەتحی سەربازییەوە لە تورکان رزگار کراوە، سوپاکانی ئیمپراتۆری بەریتانی وڵاتەکەی بە شێوەی سەربازی داگیرکردووە. حکوومەتی خاوەن شـکۆ لـە زیـاتر لـە بۆنەیەکـدا سوربوونی خۆی بۆ هاندانی پێکهێنانی جۆرێك لە ئیدارەی مەدەنی پێشانداوە، کە ئەو ئیدارەیە پشت بە دامـەزراوەیی نوێنەرایـەتی لۆکـاڵی ببەسـتێ، ئـەویش رێگـە بـۆ پێکهێنانی دەوڵەتی عەرەبی سەربەخۆ لە عێراق خۆش بکات. پێشتر هەنگاوی گرنگ بە ئاراستەی گۆڕینی بەرەبـەرەیی ئیـدارەی سـەربازی بـە ئیـدارەی مـەدەنی نـراوە، ئەمـەش بـە پێکهێنـانی ئەنجوومەنـەکانی شـارەوانی و ناوچـەییەکان، لـە سـەرجەم شوێنەکانی وڵات.

ئێستا کات بۆ عێراق خێرایە، تاکو بەرهەمی ئـەو ئاراسـتەیە بڕنـێ. لـە پێنـاو گەشەی ژیانی گەل هەنگاوێکی دیکە بۆ پێشـەوە دەگرێتـە بـەر. بۆیـە حکوومـەتی خاوەن شکۆ، ئیشارەتی بە هەموو حاکمە مەلەکییەکاندا داوە، کە ریوشوێنی بە پەلە بەراوێژ لەگەڵ ئەنجوومەنەکان و بە پەسـەندکردنی رای گشـتی لۆکـاڵی لـە سـەرجەم

بەشەکانی وڵات، وەربگرن. ئەگەر پێشنیازێکی دیاریکراو دابنرابوایە، ئەو ئامانجەی سەرەوە بەدەست دەهات، یارمەتی کۆنگرەی ئاشتی، یارمەتی ماددی بۆ هەوڵانەی کە بۆ یەکلایی کردنەوەی ئاشتییانەی کێشەکان و پێشکەوتنی وڵاتانی رۆژهەڵاتی، دەیدات پێشکەش دەکرد. کۆتایی هات.

بروسکەکە بە بڕوای من وا کۆتایی پێهێنرابوو، کە هێشتا پێشنیازەکانی لێژنەی ((پونهام کارتەر)) لە ژێر لێکۆڵینەوە دابوو، ڕێنمایی دیکە بە دوای ئەمە دا دێت، ئەو نامەیە، بەجەختکردنەوەی لە سەر خواستەکانی رای گشتی، ئێمەی لە هەلوێستێکی سەخت دانا. چونکە پرەنسیپی وەرگرتنی رای خەڵك، لەمەرجەکانی ئینتیداب دانرا. ئەمەش خۆی لەبنەڕەتەوە پرەنسیپێکی باشە، بەڵام زۆر دواخستنی، هەستی توندوتیژی لە نێوان چینی ئەو پیاوانە وروژاند کە گرنگییان بە سیاسەت دەدا و خاوەن دەسەڵات و ئیعتیبار بوون لە بەغدا. دوای ئەوەی ئاماژەم بەو شتانەی لێژنەی بونهام کارتەر کرد، روونیان کردەوە. بەم شێوەیە وەڵامی نامەکەم دایەوە:

بەشی دووەمی بروسکەکەتان، وەکو پێدەچێ، ئێمە زیاتر پابەندی راوێژ و تاوتوێکردن لەگەڵ دانیشتوانی ئەو وڵاتە دەکات، بۆئەوەی بگەینە چەند دەرەنجامێکی بەرجەستە کە یارمەتی کۆنگرەی ئاشتی لە وەختی گونجاو بدات، هەروەها من زۆر بەداخەوە خۆم بەناچار دەبینم داوا لە حکوومەتی خاوەن شکۆ دەکەم، کە چاو بەم بەشەی بەیاننامەکەی بخشێنێتەوە. تکادەکەم، بەدەربخەم کە حکوومەتی خاوەن شکۆ بەو پێیەی کە دەوڵەتی ئینتیدابکارە، شێوەی ئەو حکوومەتەی کە لە داهاتووی نزیکدا پێکدەهێنرێت، دیاری بکات. گەڕاندنەوەی کێشەکە سەرلەنوێ بۆ ((ئەنجوومەنە لۆکاڵییەکان)) و ((رای گشتی)) لۆکاڵی جگە بۆ یەك ئامانج بۆ هیچی دیکە ناچێت، ئەویش ئەوەیە، کە توندڕەوەکان، ئەوانەی حەز دەکەن بە هەمان شێوەی برادەرەکانیان لە سوریا هەنگاو بنێن، هەر ئێستا داوای سەربەخۆیی تەواوی عێراق دەکەن، لەگەڵ مانەوەی ئەمیر عەبدوڵلا یان نەمانەوەی لە سەر ئەو حکوومەتەیان، هەڕەشە و پەنابردن بۆ دەمارگیری ئایینی لە مانگی رەمەزانی داهاتوو، بۆ خۆیان رادەکێشن.

خەڵکانی میانڕەو کە تا ئێستا سەیری حکوومەتی خاوەن شکۆیان کردووە کە پرۆژەیەك پێشکەش دەکات، هەلێکی مەعقولی سەرکەوتنی هەیە و دەتوانن پاڵپشتی لێ بکەن. ئەگەر نەزانن حکوومەتی بەریتانی ئامادەیە یارمەتییان بدات و پاڵپشتی ئەکتیڤانەیان لێنەکات، میانڕەوەکان ناتوانن بەرپەرچی توندڕەوەکان بدەنەوە، زۆر لە پیاوماقولانی عەرەب چەندین جار ئەو هەستەیان بۆ من دووپات کردۆتەوە.

ئەگەر بکرێت لە ماوەی حەوت رۆژی داهاتوو، دەسەڵاتم پێبدرێت، رابگەیەنم کە حکوومەتی خاوەن شکۆ پێشنیازە دەستوورییە پێشکەشکراوەکە، بە شێوەیەکی کاتی پەسەند دەکات، هەروەها رێنماییم پێبدات، کە ئەو راگەیەنراوە بە پیاو ماقولانی عێراق بگەیەنم، بەو نیازەی تا پاییز وای لێبکرێت جێبەجێبکرێت.

پاڵپشتی کردنی کوتلەی خاوەن رای میانڕەو لەمبارەیەوە، هیوامان بە پشت بەستن بەو کەسانە بەهێز دەکات، هەر کاتێکیش ئەمانە ئەنجامدران، لە پێگەیەکی وادا دەبینین کە بتوانن کێشەکە لەگەڵ توندڕەوەکاندا چارەسەر بکەین.

هەروەها دەرکردنی بەیاننامەیەك بە گەڕانەوەی (سێر پێرسی کۆکس) بۆ وڵات وەك مەندوبی سامی، لەم بۆنەیەدا سوودێکی زۆری دەبێت. بە بەزەییەوە داوای دەرکردنی فەرمانتان لە سەر ئەم بنەمایە، بە زووترین کات، دەکەم.

من بەو پێیەی ئەفسەری سەر بە سەرکردەی گشتیم لەم وڵاتە، بەرامبەریشی بەرپرسیارم، بۆیە جگە لە پەسەندکردنی ناتوانم هیچ شتێکی دیکە بکەم، کە هێزەکان و ژمارەیەکی زۆر لە ژن و منداڵ و هێڵە درێژەکانی گەیاندن، بخاتە مەترسییەوە، بە رای من سازکردنی گفتوگۆی زیاتر لەم رەوشە، بە هەمان دەرەنجام دەگات. کۆتایی هات.

هەروەها لە بروسکەیەکدا کە بە رای ((لێژنەی بونهام کارتەر)) نێردرا، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لێژنەکە خێرا بڵاوکردنەوەی ئەو بەیاننامەیەی کە بروسکەی وەزیری دەرەوەی لە خۆگرتووە، بە شتێکی پێش وەختەی دەزانێ. چونکە ئەگەر پێشنیازەکانی وەربگرێت، ئەوا وا دەخوازێت چەند هەمووارکردنێك لە بەیاننامەکە بکەین، لێژنەکە بۆ ئەوە دەچێت،

کە یەکەمین هەنگاو کە لەمبارەیەوە دەگیرێتەبەر، پێویستە بڵاوکردنەوەی مەرجەکانی ئینتیداب بێت، بە دەقی بڕگەی دووەم و چوارەمی ماددەی ٢٢ی میساقیشەوە، تا ئەو کاتەی بڕیاری حکوومەتی خاوەن شکۆ سەبارەت بە پێشنیازە تایبەتییەکانی دەستوور، دەگات. پێویستە کورتەیەك لە دەستووری پێشنیارکراو یان لەو کاتەی کە مەرجەکانی ئینتیداب بڵاودەکرێنەوە یان دواتر، بڵاوبکرێتەوە. بڕوا وایە ئەو هۆکارانەی کە لە راپۆرتەکەدا سەبارەت بە تێکەڵاوکردنی (رای ئەنجوومەنە لۆکاڵییەکان) لە بارەی شێوەی دەستوور، دانراون خزمەت بە هیچ ئامانجێکی بەسوود ناکات، لە دیدگای لۆکاڵییەوە لەوانەیە ئەمە دەرەنجامی مەترسیداری بۆ ئاسایشی گشتی هەبێت. ئەنجوومەنە لۆکاڵییەکان بە مەبەستی ناوچەیی نەوەك لە سەر ئاستی نیشتیمانی دادەمەزرێن. دەسەڵاتی رادانیان لە کاروبارە نەتەوەییەکاندا نییە. ئەگەر ئەنجوومەنەکان رای پێچەوانەیان دا، ئەوا سەختی مەترسیدار پەیدا دەبێت. لێژنەکە سەیری ئەوەشی کردووە کە ژمارەیەکی زۆرکەم نەبێت لە ئەندامانی ئەنجوومەنە لۆکاڵییەکان، ئەوانی دیکە هیچ شارەزایی و مەعریفەیەکی سیاسی ئەوتۆیان نییە، کە دەستی پێوەبگرێت. هەروەها لێژنەکە وای دەبینی کە لەوانەیە تەقینەوەی مەترسیداری بزووتنەوەی نیشتیمانی و دەمارگیری ئایینی رووبدات، لێژنەکە سەبارەت بە رەوشی فێرکردن نموونەیەك لە وڵات دەهێنێتەوە، لە هەر شەش ئەندامی عەشایەرەکان کە لە ئەنجوومەنی (عەمارە) کاردەکەن، چواریان نازانن بخوێنن و بنووسن دواتر لێژنەکە دەستبەرداری راکەی پێشتری خۆی دەبێت، کە لە راپۆرتەکەدا باسیکردووە، ئەویش ئەوەیە، کە سیاسەتی گونجاو، کە پێویستە بگیرێتەبەر ئەوەیە کە دەستووری کاتی دابنرێت و رێگە بە ئەنجوومەنی یاسادانان بدرێت کە کەمێك شارەزایی لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا بە دەست بێنێت، بەر لەوەی داوای لێبکرێت لە کاروبارێك کە زانیاری لە بارەیەوە نییە دەرەنجامەکانی نازانێ و شارەزایی پێویستی لە بارەی نییە، را بدات. کۆتایی هات.

لە کۆتاییدا وەزارەتی هیندی لە ٢٠ ی ئایار ئەم بروسکەیەی کرد: حکوومەتی خاوەن شکۆ زۆر نرخ لەو چاودێری و لێهاتووییە دەنێ، کە لێژنەی کارتەر لە

ئامادەکردنی پرۆژەکە ناویەتی. تێبینییەکانی راپۆرتەکە بە تەواو گرنگ و ئاگاییەوە، وەردەگرێت، ئێستا حکوومەتی خاوەن شکۆ تەواو سەر قاڵی وێنەکردنی شێوەی ئینتیدابە لە عێراق. هەروەك بۆتان دەرکەوتووە، ئەگەر نەگەینە بڕیارێك لە بارەی ئەم خاڵەوە، ناکرێت فەرمانێك دەربچێت شێوەیەکی جیا لەو شێوەیەی ئێوە پێشکەشتان کردووە، دەربکات، کە تایبەتە بە پێشنیازەکانتان.

ئێوە دەتوانن بڵاوکردنەوەی ئەو بەیاننامەیەی کە لە بروسکەی رێکەوتی ٤ی ئایار پێتان گەیشتووە، دوابخەن، چونکە ئێوە لە رێکەوتی ٣ی ئایار راگەیەنراوتان دەرکردووە. هەروەها لە هەمان کاتدا پێویستە هیچ شتێکی دیکەی ناو بەیاننامەکە جێبەجێ نەکەن. هیوادارم بتوانم لە نزیکترین کاتدا، رێنماییتان پێبگەیەنم.

## چۆن راگەیەنراوی ئینتیداب قەبوولکرا

ترسام لەوەی کاتێ زانیم کە کەسانی تایبەتمەند بە دارشتنی شێوازی ئینتیداب پێوەی خەریك نەبوونە. بەڵام ئێمە لێرە لە عێراق بە مانای (میلتۆنی)[1] جگە لە چاوەڕوانی هیچی دیکەمان نەدەکرد.

ئەوەی لە دەستمان هات کردمان بۆ رووبەڕوو بوونەوەی گەردەلولی هەڵکردوو. راگەیەنراوی رازی بوونی بەریتانیا بە ئینتیدابکردن، نیشتیمانپەروەرانی[2] هاندا، کە داوای سەربەخۆیی لە سەر شێوەی سەربەخۆیی سوریا بکەن، ئەوان (نیشتیمانپەروەران) لەلایەن هەندێ لە ئەفسەرانی بەریتانی لە حکوومەتی سوری هاندران، یان وایان زانی هاندراون، کە بەرخودان لە دژی دەسەڵاتی فەرەنسی لە سوریا بکەن، بەو پێیەی کە دەوڵەتی ئینتیدابکاری سوریایە. ئەوانە تا ئێستا لە خەزێنەی بەریتانی یارمەتی ماددی

---

١ - Miltonnian

٢ - تێبینی دەکرێت، کە نووسەر ئەو وشەیە بۆ ئەو عیراقییانەی کەلە سوریا کاریان دەکرد. لە ئەفسەران و ئەوانی دیکە، بەکاردێنێ.

و مەعنەوی زۆر بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی عەرەبیی سەربەخۆ لەو ناوچەیە، وەردەگرن. ئەی بۆچی بەکەمتر لەمە لە عێراق رازی بن؟ سەرباری ئەمەش، ناڕازی بوون بەو دەستەواژانەی کەلە هەموو بەیاننامەکان و راگەیەنراوەکاندا سەبارەت بە ئینتیداب و دەوڵەتی ئینتیدابکار هەبوون. وشەی (ئینتیداب) دوومانای جیاوازی لەزمانی ئینگلیزیدا هەیە، یەکەمیان بەمانای (زاڵبوون، فەرمانی جێبەجێکردن، راسپاردەی قەزایی یان کەنیسە) دێت، دووەمیان بە گوێرەی یاسای رۆمانی بەو دەسەڵات بەخشینە دێت، کەبەو هۆیەوە رێگە دەدرێت کەسێك لە شوێنی یەکێکی دیکە بە خۆڕایی کاربکات[1]، بەڵێن دەدات کە زیانەکانی ببژێرێ، وشەکە لە یاسای ئەسکۆتلەندیش نزیکەی هەمان مانای هەیە. وشەکە تەنها بەمانای یەکەمی بەکاردێت، کەهێشتا لە زمانی دیپلۆماسی بەکاری دێنن. هەڵبژاردنی ژنەڕاڵ ((سمتەس)) بۆ ئەو وشەیە بەمەبەستی دەربڕینی بیرۆکەی ((ئەمانەت)) لە چەند رووێکەوە شتێکی داخدارە، هەرچەندە لە میساقەکە دا روونە[2]. میساقەکە بارێکی نوێی هێنایە پێش هەر چەندە رژێمی ئینتیداب ناوێکی رۆمانی هەڵگرتبوو، بەڵام چەمکێکی نوێ نەبوو[3].

ئەو مانایەش دەرهاوێشتەی یاسای ((ئەمانەتی ئینگلیز)) بوو، کە بە بەیانێکی شاژن (ڤیکتۆریە)[4] روونکرایەوە و لە ساڵی ١٨٥٨ بوو بە یاسا، ئەو یاسایە

---

١- فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ئینگلیزی، پێناسە و بەکارهێنانەکانی وشەکە ئاماژە بە دەستەواژەی ((ئەمانەت)) نادەن.

٢- بۆ بلاۆکراوەی (سی. ئێمە. دی) ژمارە (٣٤٨٠)ی ساڵی ١٩٣٠ بگەڕێوە، حکوومەتی خاوەن شکۆ، ئەو ئینتیدابەی کە حکوومەتی چینی لە ٢٨ی کانوونی یەکەم سەبارەت بە ئیمتیازە بیانییەکان دەریکردبوو، بە هەند وەرگرت. نووسەر.

٣- دکتۆر (کابل لی) ساڵی ١٩٢٠ سەردێکی تیۆری نوێی لە موحازەرەیەکدا بە ناوی (ئینتیداب بە سەر عیراقەوە)، کە لە کۆمەلەی (سیسیل رۆدزی خێرخوازی) لە کۆلیژی زانکۆ لە لەندەن، پێشکەشی کرد، بۆ پرەنسیپی ئینتیداب کرد. نووسەر.

٤- English law of trust

پرەنسیپی ئاراستە کراوی هونەری حکومڕانی بەریتانی بوو، لـەماوەی ١٠٠ سـاڵدا. ئێمەش ئەو پرەنسیپەمان لە لێوارەکانی کەنداوی عەرەبی و شوێنانی دیکە بۆ ماوەی زیاتر لە ١٠٠ ساڵ جێبەجێکرد.

لەگـەڵ ئەوەشـدا وشـەکە هـەر لەسـەرەتاوە ئۆپۆزیسـۆنی خرۆشـاند، چـونکە نیشـتیمانپەروەران وای تێگەیشـتن، کـە وشـەکە لایـەنێکی زاڵ، کـە دەسـەڵاتی فەرمانکردن بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپەی بەدەست دەبێت، لە خۆگرتووە. ئەمەش بارێکە ئەوان نـەیانتوانی لەگـەڵ ((ئەمانـەت))دا بیگـونجێنن، هـەروەها رۆژنامـەی ئەوروپی و خەڵکیش هەروای تێگەیشتن، هەروەك ئەوەی بـەردەوام پیـاوانی دەوڵـەتی بەریتانی لە پەرلەماندا بەم مانایە بەکاریان دەهێنا. هێشتا لە فەرەنسـا و سـوریاش هەمان مانا دەبەخشیٚ[1]. کەم جار دەکرێت جگە لەمە بە مانایەکی دیکە لە فەڵەستین بەکاربهێنرێت. ئەگەر دەستەواژەی ((حکوومەتی کات)) بـەکار بهێنرێـت، لەوانەیـە بتوانرێت خۆ لـە هەنـدێ لـە نارەزاییـەکانی عـەرەب لا بـدرێت و لـەو پەشـۆکاوییە گشتییەی کە لە ئینگلترا و ئەمریکادا هەیە، بە دوور بین. ئەم رایانە بـۆ گرووپێکـی بچووك کە حەزی لە رەخنەگرتنی خەڵکی چاوچنۆك بوو، کورت کرایەوە. لە کاتێکـدا زۆربەی سەرۆکەکان بە ئاشکرا هیوایان دەخواست، کە رۆڵی سەرکردایەتی لە دەوڵەتی نوێی عەرەبیدا بگرن. هەرچی زۆرینەی هەرە زۆری خەڵکی بوو، ئـەوا زۆر گرنگییـان بـەم جـۆرە گفتوگـۆ و پاسـاوانە نـەدەدا. ئیـدارەی مـەدەنی، کـە لـەوە دوور بـوو خۆشەویستی خەڵك نەبێت، هەروەك لە پەرلەمان هەندێ جار وایان پیٚ دەگوت.

(بە تایبەتی لە لایەن سێر رێـز و لـۆرد ئەیسـلیتگتۆن) ئەگـەر بیپێـوین بەهـەر پێوانەیەك کە بتوانرێت جێبەجیٚ بکرێت، ئـەم ئیدارەیـە زیـاتر لـەوەی بـەرخۆی لای میللەت پەسەند بوو. ئیدارەکە هیچ ئەرکێکی بەجیٚ نەگەیاند، هـیچ چـالاکییەك لـە چالاکییەکانی دائیرەکانی ئەنجام نەدا، تا ئەو کاتەی کـە داواکارییـەکی راسـتەقینەی

---

١- ویلسن ئەم پەرتووکەی خۆی لە ساڵی ١٩٣٠دا نووسی، کە هێشتا فەرەنسا حوکمی سوریای دەکرد.

میللی لە سەر پەیدا بــوو، لەلایــەکی دیکــەوە خــودان بەرژەوەندییــە کۆنــەکان، وەك ئەوانەی خاوەن زەوین و کاری تێدا ناکەن و ســەرۆك عەشــیرەتەکان بەرقــەوە ســەیری رووپێوی کاداستڕۆیان دەکرد، کە یارمەتی چەســپاندنی مافــە بەدەســت هاتووەکــانی جووتیارانی دەدات، بە هۆی کۆنیەوە[1]. هەروەها هەندێ لە سیاسییەکان ســۆزیان بــۆ ئەو مووچانە لێ دەدا، کە پێشتر بــە نێــردەی نوێنــەرانی عێــراق لــە ئەنجوومــەن لــە ئەستەمبۆل دەدران.

## پیاوانی ئایینی و بزووتنەوەی نیشتیمانی

پیاوانی کەربەلا و نەجەف و کازمیە (جگە لە چەند تێبینییەك) بە ئاشــکرا دژی حکوومەتی دونیایی بوون، لە هەر شێوەیەك بێت، هەر چەندە داهاتەکانیان بــە هــۆی دەستپێکردنەوەی سەردانی مەزارگەکان لە هــەموو لایــەکی عێــراق و ئێرانــەوە، زۆر زیادی کردبوو، بە شێوەیەك کە نموونەی نــەبوو. پــەنجا هــەزار گەشــتیار لــە کەربــەلا نزیکەی هەمان ژمارەش لە نەجەف، بە بۆنەی جەژنی قوربان کۆبوونەوە.

هەموو رێوشوێنێکی دابین کردنی حەسانەوە فەراهەمکرابوو، چــاودێری کاروبــاری تەندروستی و ئاسایش لەلایەن حاکمە سیاسییەکانەوە (بە تایبــەتی کــاپتن بــەری لــە کەربەلا) کرابوو، ئەو نامە و بروسکانەی کە سوپاس و پێزانینی حکوومەتی مــەدەنی هەڵگرتبوو، نێردرا بوون و لە لایەن ژمارەیەك لە زانایانی ئایینی دیار واژووکرابوو[2].

---

١- بە هۆی کۆنیە، واتە سەردەمێکی دوور و درێژ زەوییەکە جووتیارێك بە کاربهێنێت، زۆر بە کار هێنانی زەوی مافی خاوەندارێتی بۆ جووتیارەکە دەچەسپێنێ. (وەرگێڕی کوردی).

٢- ویلسن باسی ئەو زانا ئایینییە دیارانە ناکات، پێ دەچێت لەوانە بن کە پێیان دەگــوترا ((زانایــانی حەفیز))، سەرباری ئەمەش ئەرکی دابین کردنی ئاسایش و تەندروستی ئــەرکی هــەموو حکوومــەتێکی ئاساییە، حکوومەتی چاك پێویستی بە سوپاسگوزاری لە سەر بە جێگەیاندنی ئەرکەکانی، نییە.

زۆرینەی خەڵك دوور لە هەموو ئەوشتانە وەستان، بەڵام پیاوانی ئایینی بەروونی دەیانتوانی تێبینی ئەوە بکەن، کە بوونی ئیدارەیەکی ریکخراو و لێهاتوو، کە کار بۆ باشترکردنی ژیانی خەڵك بکات و پەیرەوی سیاسەتێکی فیرکردنی ئازاد بکات، بەزورترین کات دەسەڵاتیان کەم دەکاتەوە و چەمکی حکوومەتی تیۆقراتی دەخاتە مەترسییەوە، ئەوانە تا ئەو ئەندازەیە دوور بین نەبوون، کە بزانن ئاراستەی پێکهێنانی حکوومەتی مەدەنی، نەوەك ئایینی ئاراستەیەکی جیهانییە و دەرچوون لێی مەحاڵە، ئەوانە چوونە پاڵ بزووتنەوەی نیشتیمانی و دەستیان بەلایەنە زۆر پاشکەوتووخوازییەکەی گرت.

قورسایی دەسەڵاتیان بۆ داهێنانی ئەو بەڵگە و پاساوانە خستە گەڕ، کە لای نەزانترین کەس، زانراوە. بەدوای هەڵی گونجاو گەڕان و پەنابردن بۆ دەمارگیری ئایینییان بەهەلزانی. دەمێك بوو نیشتیمانپەروەران بۆیان دەرکەوتبوو، کە پێویستە لە سەریان وەك بەرەیەکی ئیسلامی یەکگرتوو، دەربکەون. بۆماوەیەکی کاتی زالبوون بە سەر ئەو دەمارگیرییە توندەی کە هەر دوو تایفەکەی (سۆننە و شیعەی) لێك جیادەکردەوە. یەکەم نیشانەی رێککەوتن لە هاوینی ١٩١٩ دەرکەوت، کاتێ کە کۆمەڵێکی سوننە لە دوو بۆنەی ئاهەنگ ئامێزی شیعی کە لە یادی سەید موحەممەد کازم ئەلیەزدی[1] سازکرا بوو، ئامادەبوون.

## ئاهەنگەکانی لە دایکبوونی پێغەمبەر

ئەو ئاشتەواییە سیاسییە، گرنگییەکی ئەوتۆی بۆ خەڵك نەبوو، تا ئەو کاتەی مانگی رەمەزان لە ١٩ی ئایاری ١٩٢٠ هات. تەواو ئاگاداری مەترسییەکان بووین، لە ماوەی مانگەکانی ئازار و نیساندا سووربوون لە سەر ئەوەی کە رێگەمان پێبدرێت، چەند بەیاننامەیەك بەر لە رۆژووگرتن دەربکەین، بەڵام رێگەدان بەم کارە

---

١- زانا یەزدی لە ١٩١٩/٤/٣ کۆچی دوایی کرد.

له سەرەتاكانی ئایاردا هات، هەروەك روونمانكردەوە، بەڵام ئەوەندە دواكەوت، تاوای لێهات بێ سوود بێت. ئاهەنگە ئایینییەكان كە بـە ((لـە دایكبـوون- مـەولوود)) ناسرابوون، بەبۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبـەر و تـەواوی ئـەولیاكان بـە نـۆرە لـە مزگەوتێكی شیعە و سوننە سازدەكران. تاكەكانی هەردوو تایفەكە بە بانگهێشـتی ئەوانەی سەرپەرشتی مزگەوتەكەیان دەكرد یان بە بانگهێشتی سـەرۆك گەڕەكـەكان ئامـادەی ئاهەنگـەكان دەبـوون. دوابـەدوای خوێندنـەوەی مەولوودەكـە، كـە لای سوننەكان رێوڕەسمێكی تازیە ئامێزە و لای شیعەكانیش شیوەن ئامێزە، كە بۆ نەمر راگرتنی شەهیدبوونی حسێنە، وتار پێشـكەش دەكـران وتـاری سیاسـی و شـیعری نیشـتمانپەروەری دیـاریترین سـیماكانی ئـەو كۆبوونەوانـەبوون، تـاكی عـەرەبیش بەرامبەر بە شیعر بە تایبەتی زۆر هەستیارە.

ئەو دروشمە حەماسییانەی كە بە نـاوی ئـایین و نیشـتیمان و مـیر عەبـدوللا داوای لێدەكرا پەلە لە دامەزراندنی پادشایەتییە پیرۆزەكەی بكـات، دەكێشـران، حەماسـەتی خەڵكیان دەبزواند، وتاربێژی دیاری یەكێ لەو مەولوودانە گەنجێكی نووسـەری دائـیرەی ئەوقاف بوو[1]، وتارێكی پێشكەش كرد. وتارەكەی بە شتێكی مەترسیدار بـۆ ئاسایشـی گشتی تێدایە بینرا. دەستگیركردنی ئەو گەنجە، بە پاساوێك بۆ گرێدانی كۆبوونەوەیـەك، وەرگیرا، كە مەبەست لێی بەخورتی ئازاد كردنی بوو، ئۆتۆمبێلی زرێپوش بۆ پاسـەوانی شەقامی سەرەكی شارەكە ناردرا، بەڵام رووبەڕووی بەرگرییەكی رێكخراو نەبووەوە[2].

---

١- ئەو گەنجە (عیسی عبدالقادر) بوو، كە دواتر بووە بەڕێوەبەری ژمێریاری دائـیرەی ئـەوقاف لـە گوتاربێژە دیارەكان نەبوو، هەروەها وتاریشی پێشكەش نەكرد، بەڵكو قەسیدەیەكی پێشكەش كرد. ئەو قەسیدەیەی لە مزگەوتی ((حەیدەرخانە)) پێشكەش كرد، كە هـەمان شـەوی دەسـتگیر كردنـی بوو، واتە شەوی ٦ی رەمەزانی ١٣٣٨(٢٤ ئایاری ١٩٢٠).

٢- سەركردەی سەربازی لۆكاڵی داوای لێكردم كە بەرپرس بم بەرامبەر حكوومەتی خاوەن شكۆ لـە هەر كارێكی سەركوتكردن، كە دەكرێت دەستی بۆ بەرم. رازی بـووم، بەمـەرجێك زیـاتر لـە پێـنج

سەرۆکەکان بە شێوەیەکی فەرمی ئاگادارکردانەوە، کە ئێمە رێگـە نـادەین ئاسایشـی پـاك، لێـڵ بکرێـت. بـەڵام مـن دوای ئـەوەی لەگـەڵ هەریەکـە لـە عەقیـد پریسـکوت (بەڕێوەبەری پۆلیس) و عەقید بەلفۆرد (حاکمی سەربازی بەغدا) یادداشـتمان گۆڕییـەوە، هەر ئەو کات بڕیارم دا رووبەڕووی رێوشوێنە سەرکوتکەرەکان ببمەوە. لـە ژێـر رۆشـنایی رووداوەکانی کە دواتر روویاندا، گەیشتمە ئەو بڕوایـەی کـە ئـەو رێوشـوێنانە هەڵەیـەکی کوشندە بـوو، لەمنـەوە لـە حـوکمڕانیم لـە دەسـتم دەرچـووە. لـە مەزەنـدەکردنی ئـەو کاریگەرییانـەی نیشـتیمانپەروەران دەینـوێنن هەڵـەم کـرد. هـەروەها هەڵـەم کـرد لـە خەملاندنی بڕی کاریگەر بوونی خەڵکی بەپروپاگەندەکانیان و کاریگەر بوونی دانیشـتوانی فوراتی ناوەڕاست بە پروپاگەنـدەکانی زانایـانی ئـایینی. دەمزانـی ئێمـە لـە سـەروبەندی پێکهێنانی حکوومەتی لۆکاڵین، بۆیە من رێگر بـووم لـە بەنـد یـا دوورخسـتنەوەی ئـەو خەڵکانەی کە سەر بە کۆمەڵێکن و خەریکە دڵنیاین دوای چەند مانگێك بانگیان دەکـەین و داوای یارمەتیدان لە پێکهێنانی حکوومەتیان لێ دەکەین.

بۆیە رێگەدرا ئاهەنگی ((مەولوود)) بگێڕدرێت، ئەوانەی کە پێیان باش نەبوو کە کۆبوونەوەی سیاسی لە مزگەوتەکان بکرێت، لەوە دەترسان خـەڵکی ئـەو بەخشـینانە رەتبکەنەوە، کە مزگەوتەکان پێویستی پێی بوو، هەروەها لە ئامـادە نـەبوونیان لـە مزگەوتەکان دەترسان، نەبادا بە کافر و خیانەتکردن لـە عـەرەب و ئـازادی عـەرەب لەقەڵەم بدرێن.

## بزووتنەوەکانی دیکە

---

(٥)گوللە نەهاوێژرێت، ئەو پێنج (٥) گوللەیەش ئاراستەی سەری هاندەران بکرێت، نەوەك بە سـەر سەری خەڵکی کۆبووە، کە لەوانەیە گیانی بێ تاوانان بخاتە مەترسییەوە. (نووسەر)

پروپاگەندەکان وا پەخش دەکران، کە پەشێوییەك خەریکە لە ڕێگەی مامۆستایان و قوتابخانەی ئەهلییە[1] بەڕێوەیە. ئەمەش دەبووە هـۆی ئـەوەی بازاڕەکـان دابخـرێن و ژیانی ئاسایی شار تێکبچێ. ئەو پوکانەوەیەی کە لە سنوورەکانمان لـە سـەر فـوراٹ چەند بارە دەبووەوە و ئەو هێرشانەی کرانـە سـەر تەلەعفـەر و ڕێگـای موسـڵ، ئـەو باوەڕەی بە هێزکرد کە ڕەوشی سەربازیمان ئەوەندە بە هێز نییە کـە بتـوانین بـە سـەر عەشایەرەکاندا زاڵ بین. عەلی سلێمان[2]، کە لە بەهێزترین لایەنگرانمان لە نێـوان ئـەو شێخانەی کە لە بەغدا نزیکن بوو، سـەبارەت بـە مەترسـیداری ڕەوشـەکە ئاگـاداری کردینەوە، هەروەها لە هەمان کاتدا شێخی (عەنزە بەرزانە)، بە ئاشکرا پێی گـوتین، ئەگەر نەتوانین کـەمێك سـەرکەوتن بەدەسـت بێـنین، ئـەوا خـۆی بەرامبـەر ئـەوەی عەشایەرەکانی ئەنجامی دەدەن بە بـەرپرس نـازانێ. ئـەو شـێخە ئێمـە بـۆ دووبـارە داگیرکردنەوەی (دێرەزور) هاندا، بەڵام پلانەکە زۆر لە تواناکانی ئێمە بۆ بـەدیهێنانی دوور بوو، هەرچەند خەسڵەتەکانی ئەو پلانە گرنگی خـۆی هـەبێت. لەهـەمان کاتـدا ئەوانەی خێریان بۆ ئێمـە دەخواسـت، لـە بەرامبـەر کەمتەرخەمییـەکانی ئێمـە لـە سـنووردار نـەکردنی پەشـێوییەکانی عەشـایەرەکان، ناڕەحـەت بـوون، هـەروەها بـە تەحەمولی ئێمە بـۆ گاڵتەجاڕییـەکانی تونـدرەوەکان نارەحـەت بـوون. ئـەوان چـەند پەرەگرافێکیان لە ڕۆژنامەکانی ئینگلیز وەردەگرت و دەیانکردە بەڵگەیەك بۆ ئـەوەی پێشانی بدەن کە چۆن لە بەغدا بە ئینتیداب ڕازی نەبوون، ئاوهاش لە لەندەنیش پێی ڕازی نەبوون، هەروەها کورتەی تەلەگرافەکان کە بـە هـۆی بروسـکەکانی ڕۆیتـەرەوە

---

١- مەبەست لێی ((قوتابخانەی ئەلتەفیزی ئەهلیە)) کە مامۆستا عەلی بازرگان دایمەزراند و کردیە مەڵبەندێکی گرنگ لە مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی نیشتیمانی، تا ئەو کاتە دەسەڵاتدارانی بـەریتانی دایانخست، قوتابخانە کە تا داخستنی هەر پێی دەگوترا ((الاهلیە))، کاتێ دووبارە دەرگای کرایـەوە بەو ناوەی ئێستا ناوبرا.

٢- یەکێك بووە لە شێخانی دلێم، کە بە درێژایی مـاوەی دەسـەڵاتی ئینگلیزەکـان، بـە لایـەنگری ئینگلیز مانەوە، پێشتریش لایەنگری حکوومەتی تورکی و نازم پاشا بوون.

دەگەیشت، کە لە بارەی گفتوگۆکانی ئەنجوومەنی عەوام بوو، لەلایەن نیشتیمانپەروەران دەقۆزرایەوە، وا لێکدەدرایەوە کە رازیبوون بە ئینتیداب لە ئینگلتراش شتێکی خوازراو نەبووە، ئەگەر ئەوان (نیشتیمان پەروەران) کار بۆ دژایەتیکردنی بکەن، ئەوا حکوومەتی بەریتانی دەست بەرداری ئینتیداب دەبێت.

## نوێنەرەکان

ئەرکی سەرشانم بوو کە لە ئاوا بارودۆخێکی نالەباردا، ئەو سیاسەتەی کە دەیگرینەبەر بە خەڵکی رابگەیەنم. لیژنەکە لە ١٥ کەس پێکدێت، هەموویان لە بەغدا بوون، بە خۆیان دەڵێن نوێنەری خۆدامەزرێنەر[١]، ئەندامانی لیژنەکە داوایان کرد، کە بیروڕایان بگەیەنمە حکوومەتی خاوەن شکۆ. نەمدەتوانی وەك نوێنەرانی ئۆمەتی عێراقی پێیان رازی ببم. بەشێکی زۆری خودان رای تەندروست گومانیان لە رێبازیان (کە دژی ئینتیدابە) و دڵسۆزییان و نیازپاکییان دەربڕی، بۆیە بەناو داوای ٤٠ کەسم کرد، کە هەموویان لە پیاوە ماقولانی بەغدا بوون، بەبێ گوێدانە لایەنی سیاسییان، کە نوێنەرانی هەر دوو تایفەی مەسیحی و جولەکەشی[٢] تێدا بوو، ببینن.

---

١- ئەوانە بە خۆیان، خۆیان هەڵنەبژارد، بەڵکو ئەو جەماوەرەی کە لە ١٩٢٠/٥/١٤ لە شەقامی رەشید نزیك مزگەوتی حەیدەر خانە کۆببوونەوە، هەڵیان بژاردوون ئەویش: جەعفەر ئەبو ئەلتمەمن، ئەلسعەیدکاشانی، شێخ ئەحمەد زاهر، عەبدولحسین جەلەبی، سەید عەبدولکریم ئەلحەیدەری، یوسف ئەلسویدی، فواد دەفتەری، عەبدولوەهاب نائیب، سەعید نەقشبەندی، موحەمەد مستەفا خلیل، رفعەت جادەی، عەلحابازرکان، ئەحمەد داود، عبدالرحمن حیدری، حاجی یاسین، خزەیری، عبدالحسین چەلەبی داوای لێبوردنی کرد و سەید محەمەد سەدر لە شوێنی ئەو هەڵبژێردرا.

٢- ئەم هەنگاوە بە توندی لە ستونەکانی رۆژنامەی تایمس (لەندەن) هێرشی کرایە سەر، لە سەر ئەو بنەمایەی کە هێنانی ئەو کەسانە بە بارگاوی کردنی ئەنجوومەنەکە دێت، بەو کەسانەی کە لاگیری ئیدارەی بەریتانی دەکەن. نووسەر. هەرچی ئەوانەی ویلسن پشتی پێ بەستابوون و بانگهێشتی ئامادەبوونی کردبوون، ٢٠ کەس بوون، نەوەك ٤٠ کەس، ئەوانیش: عبدالمجید الشاوی، السید محمود

لە پاڵ هـەموو نوێنـەرانی سـەرای لـە ڕۆژی ٢ی حـوزێران. دواتـر دانیشـتنەکە بـە خوێندنەوەی ئەو وتارە بە سەریاندا کرایەوە:

پەیوەندیم پێوەکرا، کە بەشێك لە بەڕێزتان، دەیەوێت لەم ڕۆژەدا سەبارەت بە داهاتووی عێراق داواکاریم پێشکەش بکەن، بۆ ئەوەی منـیش بیخەمـە بـەردەم حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا. پێویست ناکات دڵخۆشیم بۆ ئەو دیدارە روون بکەمـەوە، کـەماوەم دەدا، بـەخێرهاتنتان بکـەم و بـە پێـی دەسـەڵاتم کرۆکـی سیاسـەتی حکوومـەتی خـاوەن شـکۆ سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە، بـە وردی روون بکەمەوە.

پێویستە کە ئێوە لیدوانەکانی هەر دوو حکوومەتی بەریتانی و فەڕەنسیتان، خوێندبێتەوە کە پێشتر لە ٨ی نۆڤێمبەری ١٩١٨ بڵاوکرایەوە، هەروەها پێویستە ئێوە مادەی ٢٢ی پەیماننامەی کۆمەڵی نەتەوەکانتان خوێندبێتەوە، کـە زۆربـەی نەتەوەکانی جیهان مۆریان کردووە، ئەو لێدوانانە سیاسەتی حکوومـەتی خـاوەن شکۆ بەدەردەخات و نیازەکانی روون دەکاتەوە، ئەو سیاسەتەی کـە حکوومـەتی بەریتانی بە قەد بستێك لە هیچ کاتێکیش لێی لانەداوە. ئاشـکرای دەکـەم کـە حکوومەتی خاوەن شـکۆ، نیـازی وایـە حکوومـەتێکی نیشـتیمانی لـە عێـراق دابمەزرێنێ. ویستم ئەمە لە خێراترین کاتدا جێبەجێ بکـەم، لـە سـەر ئەمـەش جێبـەجێکردنی پـەکی کـەوتووە. مـن زۆر غـەمبارم بـەم دواکەوتنـە، کـە بـە هۆکارێکەوە روویانداوە، لە توانای ئێمـەدا نـەبووە خۆمـانی لێ لابـدەین. ئـەو

---

النقیب، الحاج علی الالوسـی، جمیـل صـدقی الزهـاوی، صـالح الملـی، محمـود الشـابندر، عبـدالقادر خضیری، الشیغ شکر الله، محمد حسن الجوهر، جعفر عطیفه عبدالحسین الچلبی، محمـود الاطـرقچـی، محمود الاستربادی، عبدالکریم الچلبی، مناحیم دانیال، ساسون حسقیل، عزرامناحیم، یهودا زلـوف، عبدالجبار خیاط، خسرو قیومجیان، الحاج علی الالوس سەبارەت بە بانگهێشت، داوای لێبوردنی کرد.

درێژبوونەوەیـــەی کـــە لـــە جەنگەکـــەی ئێســـتا روویـــداوە و ئـــەو رێگرییانـــە (سەختییانە)ی نەیهێشت پەیمانی ئاشتی مۆر بکرێت، تێکچوونی رژێمـی ولاّتـە دراوسێیەکانی عێراق، جا چ لای تورکیا یـان لای ئێـران یـان لای سـوریا بێـت، هەموو ئەو پەشـێوییانە رێگـر بـوون لـە بـەردەم پێکهێنـانی ئـەو حکوومەتـە پادشاییەی کە نیازمان وا بوو، دایبمەزرێنین.

هیوادارم، باوەڕ بەوە بکـەن، کـە هـەرگیز لـە توانامانـدا نـەبووە، خۆمـان لـەو دواکەوتنـە لابـدەین. دلّنیاتـان دەکەمـەوە، ئەوانـەی کـە دەیانـەوێت حکوومـەتی پادشایەتی بەپەلە بونیاد بنێن، بەکارهێنانی توندوتیژی، و روژراندنی بیری خـەلّکانی سادە، ئەوا نیشتمانەکەیان لە گۆڕدەنێن، جا هۆکارەکانی دوای ئەو کـارە هەرچـییەك بێت، چ نیشتیمانی یا شتی دیکەبێت.

هیچ هیوایەك بە دروستکردنی حکوومەتی پاشایەتی بەو شێوەیەی کە ئـەوان دەیانەوێت، بەر لە بەرقەراربوونی ئاسایشی گشـتی و چەسـپاندنی کۆلەگـەکانی رژێم، کە ولاّت بە هۆیەوە گەشەدەسەنیّ، لە ئـارادا نییـە. بـا ئەوانـەی رژێمـی ئێستای ولاّت تێکدەدەن، هەستی خەلّکی دژ بە دەسەلاّت دەورژێنن، با بزانن کە ئەو هۆکارانە دەورژێنن کە حکوومەت بەو هۆیە دەتوانیّ رێوشێنی پێویست بۆیان بگرێتەبەر. حکوومەتیش ئەگەر پێویست بکات، ئـەو رێوشـوێنانە بـەکاردێنیّ. سەرباری ئەمەش، ئـەو رێوشـوێنانە لەوانەیـە کاریگـەری لـە سـەر سیسـتەمی ئیدارەکان، کە هەر لە زووێکەوە پێشنیازی دامەزراندنیانمان کردبوو، دەبێت.

من بەو پێیەی کە سەرۆکی کاتی حکوومەتی پادشایەتی ئێستام، هۆشـداریتان دەدەمیّ کە هەر هاندانێك بۆ توندوتیژی، یان تێکدانی رژێمی ولاّت، بە توندی لـە لایەن هەردوو دەسەلاّتی سەربازی و پادشایەتی وەلاّم دەدرێتەوە. باش بزانن کە هێز لەلای ئێمەیە، ئێمە سوورین لەسەر توندکردنی کۆلّەگەکانی رژێم لەم ولاّتـەدا، تـا ئەو کاتەی ئەو حکوومەتە پاشـاییەی کـە مەبەسـتمانە دادەمـەزرێت. دەسـەلاّتی باسکراو، لەپێدانی هێزی تەواو بۆ چەسپاندنی رژێم لە ولاّتدا، کەمتەرخەم نابێـت،

هەروەها ئەو هێزە ڕێگە نادات یاری بە ڕژێمی وڵات بکرێت. هیوادارم ناچار نەبم ئەو هۆشدارییانە بۆتان دووبارە بکەمەوە، هەروەها هیوادارم کە ڕەوشی داهاتوو، وا نەکات پێویست بکات ئەو ڕێوشوێنە تایبەتییانەی بۆ پاراستنی ڕژێمی گشتی دەگیرێتەبەر، بەکار بهێنرێت.

ئێستا دەچینە سەر قسەکردن لە حکوومەتی داهاتووی عێراق. حکوومەتی بەریتانی دوای راوێژ بەڕای گشتی لەمبارەیەوە، سوورە لە سەر دانانی ڕژێمی حکوومەتی داهاتووی عێراق، لەنزیکترین کاتدا. هەروەك زۆربەتان ئاگادارن، لەسەر ئەمە هەوڵەکان لە نێوان من و حکوومەتی خاوەن شکۆ و گەورە سەرۆکانی حکوومەتی پاشایی ئێرە کراوە[1].

---

١- هەڕەشە و بەڵێندان لە گوتارەکەدا تێبینی دەکرێت. هەرچی رای فەرمی ویلسنە سەبارەت بە پێکهێنانی حکوومەتی نیشتمانی، ئەوا دەکرێت لەو یاداشتەی کە لە وڵامی یادداشتی فەرمی پێشکەشکراوی مس بێل لە تشرینی یەکەمی ١٩١٩ سەبارەت بە ئەگەری دامەزراندنی حکوومەتی نیشتیمانی بۆ لەندەنی بەرز کردبووە، دەردەکەوێت. مس بێل سەبارەت بە دامەزراندنی حکوومەتی نیشتیمانی و سوود وەرگرتن لە شارەزایی حکوومەتی دیمەشق، بەرپرسیارێتی وەرگرتنی عیراقییەکان لەو حکوومەتە رای دەربڕیووە. ویلسن لە یادداشتەکەدا دەڵێت:- ئەگەری سەرەکی کە یادداشتەکەی بێلی لە سەر بونیادنراوە ئەوەیە کە دەوڵەتی عەرەبی لە عیراق و شوێنانی دیکە لە ماوەی کورتدا کارێکی مومکینە. دانانی پلانێکی لۆژیکی بۆ حکوومەت لە سەر ئەم بنەمایە، شتێکی کرداری دەبێت و خەڵکیش لە هەموو شوێنێ پێی رازین، بەڵام تێبینییەکانم لەم وڵاتەدا، ناچارم دەکات کە دەری بخەم کە ئەو ئەگەرە، ئەگەرێکی هەڵەیە. من لەو باوەڕەدام کە پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێی موسوڵمان، خاوەن سەروەری لە نێو پاشماوەی ئیمپراتۆرییەتی رووخاوی تورکی، لەم رۆژگارەدا کارێکی ئەستەمە لەم باوەڕەدام رای گشتی عەرەبی دوای چەند ساڵێك لە سەر کار بوونی حکوومەتی نوێی عەرەبی پێی باشە تورکەکان بگەڕێنەوە. دامەزراندی حاکمانی عەرەب، یان گەورە کارمەندانی عەرەب، جگە لەوانەی کە بە سیفەتی راوێژکاری دادەمەزرێن، خێرا دەسەلات و یاسا و نیزام

ئەمەش بۆ ئەوەی بگەینە پێکهێنانی حکوومەتێکی کاتی پاشایی، کـە ئـەرکی بەڕێوەبردن تا ئەو کاتەی یادداشتەکانی حکوومەت لەگەڵ خەڵکیدا تەواو دەبـن، لـە ئەستۆ بگرێت. سیستەمێکی جێگر بۆ حکوومەتی نـوێ دابنـێ. ئیـدارەی مەلـەکی لێرە، دەستووری ئەو حکوومەتە کاتییەی، چاپکردووە، کـە بـۆ حکوومـەتی خـاوەن شکۆ بەرزکرابووەوە. نیاز وابوو ئەو دەستوورە بە سەر خەڵکیدا بڵاوبکرێتـەوە، بـەڵام حکوومەتی خاوەن شکۆ بە هۆی گرێنەدانی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ تورکیـا، بـۆی نەدەکرا رێگە بە من بدات، بڵاوی بکەمەوە، یان هـەر نـەبێ کـەمێکی لێ راپـۆرت بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا خراپ نییە کە بە گشتی پێتان بڵێم کە ئەوەی ئێمـە نیازمانـە پێکهێنانی ئەنجوومەنی ئومەتە، بە سەرۆکایەتی کەسێکی عەرەب، تـا ئـەو کاتـەی دەستووری عێراق بۆ ئەنجوومەنی یاسـادانان کـە ئـەویش بـە نیـازین دایبمـەزرێنین، بەرزدەکرێتەوە. لەو باوەڕەداین کە پێویسـتە کـاتی تـەواو بـە وڵاتەکـە بـدرێت، تـا کاروبارەکانی جێگر دەبن. خێر لە پەلەکردن دا نییە.

بە بیرتان دێنمەوە کە عێراق لە تـەواوی مەمالیکـەکان جیایـە، بـەوەی بـە کارەساتەکانی جەنگ کاریگەر نەبووە، هەرچەند جەنگیشی تێدا روویـداوە. ئـەو هەواڵانـەی کـە لـە سـوریا و قـەفقاس و بەشـێکی ئێـران و تورکیـا و هـەتاکو فەڵەستینیش بە دەستم دەگات، هەموویان ئاماژە بۆ گرانی و خراپی بەڕێوەبردن دەکەن، هەژاری بەرۆکی خەڵکی تورکیا و سـوریای گرتـووە، نـارەزایی خـەڵکی گەیشتۆتە لوتکە.

ئێمە بەڵێن شکێنی ناکەین ئەگەر لە راپەڕانـدنی کارەکـانی حکوومـەت سسـتی بنوێنین، بەرلەوەی وادەی رادەسـتکردنی بـۆ حکوومـەتی نیشـتیمانی کـە بـەنیازین لەداهاتوو پێکی بهێنین.

---

دادەتەپێنێ و ئالۆزی و پەشیوی دێنێتە ئاراوە. کە جولانەوەکە بـەم شـێوەیە دەسـتی پێکـرد ئـەوکات سەخت دەبێ لە سنوورێکدا رایبگرێت (کورتەی مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. .. کیرك).

به ڕواڵەت هەڵمەخەڵەتێن، عێراق لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتێکی بیانی بووە، بۆماوەی دوو سەد ساڵ، چەندی نیازەکان باشیش بن ناکرێت حکوومەتێکی نیشتیمانی لە چاوتروکانێکدا پێکبهێنرێت، هەر دەبێت پەیڕەوی پلەپلەیی بکەین، ئەگینا بەدڵنیاییەوە سەرنەکەوتن بە دەست دێت. بڕوا بکەن من و سەرجەم پیاوانی حکوومەت، زۆر ئارەزوومانە، ئەو بەیاننامەیەی کە بۆم خوێندنەوە، جێبەجێ بکرێت، بەڵام ئێمە ناتوانین کاری نەشیاو بکەین. ئەوەش بزانن کە ئێمە و ئێوە یەك بەرژەوەندیمان هەیە، ئەوەی بۆ ئێوە گرنگە، بۆ ئێمەش گرنگە. لە کۆتاییدا سوپاسی گوێگرتنتان دەکەم. بە پێشنیازەکانتان دڵخوش دەبم. پێشنیازەکانتان بۆ حکوومەتی خاوەن شکۆ کە گرنگی بە چارەنووسی عێراق دەدات، بەرزدەکەنەوە[1]. کۆتایی هات.

لەو کاتەدا نوێنەران بەڵگەنامەیەکیان دەرکرد و تێیدا داوای گرێدانی کۆنگرەیان بۆ عێراق کرد، کە بەپێی یاسای تورکی هەڵبژێردرێت. ئەو کۆنگرەیە دەسەڵاتی دانانی پێشنیازەکانی پێکهێنانی حکوومەتی نیشتیمانی لە عێراق پێ بدرێت، ئەمەش وەك جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەی کە لە لێدوانەکەی (ئینگلیزی + فەڕەنسی) لە ٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ دا هاتووە. من لە کاتی خۆی پێشبینی ئەوەم کرد، کە ئەو لێدوانە نارۆشنە لە سەختی ترسناك ئامێزمان دەگلێنێ، هەروەها پێش ئەمەش مەزەندەی ئەوەم کرد کە ڕەوشێکی ئاوا لە وڵات دەخولقێنێ، لەوانەیە

١- دەقە عەرەبییەکەی لە کاتی خۆی لە ڕووپەری ڕۆژنامەی ((العراق)) لە ٣ حوزیرانی ١٩٢٠ بلاوکرایەوە. حسين أفنان لە جیاتی (سیر ئارنولد ویلسن) — بریکاری حاکمی پاشایەتی — دەقە عەرەبییەکەی خوێندەوە ئەمەش لە ڕۆژی ٢ی حوزیرانی ١٩٢٠ لە دائیرەی حاکمی سیاسی و سەربازی شاری بەغدا لە سەرای بەڕێوەچوو.

خواستەکانی گەل لەبارەی هەڵبژاردنی دەوڵەتی ئینتیدابکار لەگەڵ بڕیارەکانی دەوڵەتی مەزن ناکۆك بێت[1]. ئێستا ئەو سەختییانە دەورەی ئێمەی داوە.

چونکە ئێمە نهێنییەك ئاشکرا ناکەین، ئەگەر بڵێین کە نیازی نوێنەران بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچوو کە ڕێوشوێنی پێویست بۆ دەرکردنی بەیاننامەیەك لە کۆنگرەکەوە لە بارەی سەربەخۆیی عێراق، دەربکات و ڕەتکردنەوەی ئینتیدابی بەریتانی بەدوا دابێت، هەروەك ئەوەی لە کۆنگرەی سوری ڕوویدا، کە جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێت عێراقیش چاو لە سوریا بکات.

ڕووداوەکانی دانیشتنەکە وەك سەرجەم دانوستاندنەکانی پێشتر لە کەشێکی گران و سەنگین و بەرزەفت کردنی خود بەڕێوەچوو، بەو شێوەیەی کە ئێمە (بونهام کارتەر، هاول بلفور و من) چووینە ناو سەرای، بە گەردەلولی جنێو و فیکە، کە لەلایەن کۆمەڵێ قوتابی و کارمەندانی پێشووی تورکی لێدەدران، پێشوازی کراین. ئەمە یەکەم خۆپێشاندان بوو کە بە مەبەستی جاڕدانی جەنگ ساز کرابوو. داواکارییەکانی نوێنەران دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ (٢ی حوزیران) بۆ وەزارەتی هیند بەرزکرایەوە، منیش رای خۆمم بەم شێوەیە لە بابەتەکە دەربڕی:

پێویست ناکات لێرەدا جەخت لەوە بکەمەوە کە ئەگەر ڕێگەم پێبدرابوایە هەروەك لە بروسکەکانی ٨ی ئایار داوام کردبوو، بەر لە هاتنی مانگی ڕەمەزان (واتە ڕۆژی ١٩) بەیاننامەیەکەم دەرکردبا، ئێستا پێویستی نەدەکرد ڕووبەڕووی بزووتنەوەیەکی بەم شێوەیە توند ببینەوە، کە حەماسەتێکی ورژێنەر پاڵپشتی دەکات. بە گوێرەی

---

[1]- برگەی تایبەت بەم بابەتە لە ماددەی ٢٢ی بەڵێننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان، دەڵێت:- هەندێ لەو وڵاتانەی کە پێشتر سەربە ئیمپراتۆری عوسمانی بوون گەیشتوونە قۆناغێك لە پێشکەوتن، دەکرێت بە شێوەیەکی کاتی وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ دان بە بوونیان بنرێت و ڕاوێژ و یارمەتی لە دەوڵەتی ئینتیدابکار تا ئەو کاتەی دەتوانێت لە سەر پێ ڕابوەستێ، وەربگرێت. پێویستە خواستەکانی ئەو وڵاتانە لە هەڵبژاردنی دەوڵەتی ئینتیدابکار بە هەند وەربگیرێت.

میزاجی ئێستا، لەوانەیە پێشنیازی ملکەچ کردنی ولآت ئەگەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراویش بێت بۆ دەستووری کاتی، کە راوێژیان پێ نەکراوە، لە بەرامبەریدا نیشتیمانپەروەران جاری سەربەخۆیی بدەن. ئەو پێشنیازانە بە ناکوك لەگەڵ راگەیاندنی (ئینگلیزی + فەڕەنسی) دادەنرێت، کە ژمارەیەکی کەم لە مانا راستەقینەیەکەی دەگەن و بەخراپ لە خەڵك دەگەیەنرێت، هەروەها دەبێتە هۆی توندبوونی رای گشتی لە دژمان. ئەگەر ئەو میزاجە هەر بەم شێوەیە بمێنێ، ئەنجوومەنی یاسا دانانی پێشنیازکراو کاتێ داوای کۆبوونەوە دەکات بۆ ئەنجوومەنی دامەزراندن دەگۆڕێت، ئەگەرچی ئەو دەسەڵاتەشی نییە.

بەهەند وەرگرتنی راگەیاندنەکەی (فەڕەنسی + ئینگلیزی)، من وای دەبینم، کە تاکە رێگای کراوە لە پێشمان، ئەوەیە کە بەیاننامەیەك دەربکەین و تێیدا باسی ئەوە بکەین کە دوای سەپاندنی ئینتیداب، هەنگاوی پێویست بۆ بانگهێشتی ئەنجوومەنی دامەزراندنی دەگیرێتەبەر، بۆئەوەی بیرورا لە بارەی شێوەی حکوومەتی داهاتوو وەربگرێت.

پێشنیاز دەکەم، کە سێر پێرسی کوکس چەند رۆژێك لە بەغدا لە ماوەی بانگهێشتکردنی بۆ شوێنی خۆی، بمێنێتەوە، بۆئەوەی چاویان بە سەرۆکەکانی ولآت بکەوێت و کێشە دەستوورییەکانیان لەگەڵ باس بکەن، پێویست ناکات بە شێوەیەکی فەرمی بۆ ئەم مەبەستە دائیرەکە لە من وەربگرێت، چاوەڕوانی گەڕانەوەی وەك مەندوبی سامی بۆ ولآت، هەروەك پێشتر باسم کرد زۆر یارمەتیدەر دەبێت لە گەڕاندنەوەی متمانەی گشتی بۆ دەروون، دوای ئەوەی ئەو متمانەیە شوێن لەق کرا بوو.

## رای بەشەکانی دیکەی عێراق

بەر لە هەفتەیەك بۆ پێشوازیكردن لە (ئەحمەد شاه)[1]ی خاوەن شكۆی ئیمپراتـۆر، سەردانی بەسرەم كردبوو، لەگەڵ سەرۆكی دانیشتوانە عەرەبەكەی ئەوێ، كۆبوومەوە و بینیم زۆر بە توندی خۆیان لە كارەكانی نیشتیمانپەروەرانی بەغدا، بێ بەری دەكـەن. بۆ بەیانی رۆژی دوایی بەغدام بەجێهێشت و بە فڕۆكە بۆ حیللە و كەربـەلا و نەجـەف چووم، بۆ ئەوەی لەگەڵ گەورە شێخانی هۆزەكان و سەرجەم پیـاو مـاقولان و حـاكمی سیاسی كۆببمەوە. ئەو كات هاوین لەو پەڕیدا بوو، كە ستونی هەوای گەرم بۆ بەرزی دوو هەزار پێ لە سەر دەشتە گەرمەكان بەرزدەبووەوە، فڕۆكەی (ئار، ئەی، ئایت) كە من یەكێ بووم لە سەرنشینەكانی نەیتوانی ئەو ستونە هەوا گەرمە ببڕێت.

فڕۆكەوانەكە بۆ چەند جارێك ویستی ئەم كـارە بكـات، هـەموو جارێـك گـەرمی بزوێنەری فڕۆكەكە لە گەرمی ئاسایی زیاتر دەبوو، جگە لە نیشتنەوەی خێرا بـۆ خـۆ رزگار كردن، هیچ رێگایەكی دیكە نەما. فڕۆكەیەكی دیكە تاقیكرایەوە، ئەو جارەیان سەركەوتوو بوو، یەكەمجار گەیشتمە حیللە. گیانم بە دوكەڵی بزوێنەرەكە رەش ببـوو، بە هۆی بەرزی پلەی گەرمی رەنگی پیستم ببووە، نـەوتی، دوای بەپەلـە خۆشوشـتن، شاندێكی گرنگی شێخانی هۆزەكـان و خـاوەن زەوییـەكان و بازرگانـانی لۆكـاڵی لـە دائیرەی شارەوانیم بینی. پێیان راگەیاندم كە كوڕی موجتەهیـدی گـەورەی كەربـەلا[2] هەولێكی سەختی داوە، تاكو هەستی گشتی دژ بە ئینگلیز ببزوێنـێ، بـەڕای ئـەوان هەوڵەكانی كوڕی موجتەهیدی گەورەی كەربەلا، سەركەوتنی كەمی بەدەست هێناوە. گرووپێك ئەفسەر لە سوریا و گرووپێك لە ئەفسەرانی پێشـووی سـوپای تـوركی كـە ئێستا لە خزمەت ئەمیر فەیسەڵ كاریان دەكرد، چەند كەتیبەیەكیان بۆ بەغدا نارد بۆ

---

١- ئەحمەد شاه كوڕی میر شای، دوایین پادشای نەوەی قاجارییەكانی حاكمی ئێران بوو، لـە لایـەن رەزا شای پەهلەوی، باوكی شای ئێستای ئێران لە حوكم لادرا.

٢- میرزا محمد رەزا شیرازی، كوڕی میرزا محەممەد تەقی سەركردەی روحی شۆڕشە گەورەكەی عیراقە.

ئەوەی هانی عەشایەرەکان و دانیشتوانی نەجەف بدەن، کە وەکو بەغدا بکەن و لە دژی بەریتانییەکان شۆڕش بکەن.

ئەو ئاگادارییانە (بانگکردن) بە کەمێك رازی بوونەوە، وەڵام درانەوە. گەورە شێخان، لەمەڕ بزووتنەوەکان لە شێوەی ئەوانەی لە بەغدا هەن، ئاگاداریان کردمەوە، کە ئەو بزووتنەوانە بلاّودەبنەوە، ئەگەر لە سنوورێك رانەگیرێن. ئەوان جەختیان لە سەر ئەوە کردەوە کە باشترین رێگا ئەوەیە کە تابکرێت کێشەکە بە توندی لەگەڵ هاندەران چارەسەر بکرێت و وای لێبکەین زۆر روون بێت، کە ئێمە بە ئینتیداب رازی بووینە و سوورین بۆ کارکردن لە سەر ئاستی ئەو بەرپرسیارێتییەی کە پێوەی بەندە. هەروەها پێیان گوتم کە زۆربەی نوێنەرانی بەغدا لە سەردەمی تورکەکان ئەندامی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرقی بوون، ئەو رێکخراوەی لە دوو دەیەی دوایی دژایەتی پێکهێنانی هەموو شێوە حکوومەتێکی دەکرد، زانینی ئەم راستییە وای نەکرد دژایەتی کردنیان بەشتێکی کەم مەترسی وەرنەگیرێت، بەڵکو وایکرد ئەو راوێژەی پێشکەشیان دەکرد کەم بەها سەیر بکرێت. لە راستیدا نوێنەران لەو کاتەدا، سیاسەتێکی بونیادنەریان نەبوو، ئامانج و سنووری چاوتێڕینەکانیان، لە ئاستی دژایەتی کردنی ئینتیداب دەوەستا، هەرچەندە هەندێك لەمانە قسەی لەبارەی راگەیاندی شەریف عەبدوللاّ وەك ئەمیری عێراق، بگرە وەك پاشای عێراق دەکرد، ئەوانی دیکەش بە نهێنی پەیوەندییان بە ئەمریکا و قونسوڵخانەی فەڕەنساوە دەکرد و داوایان دەکرد، تورکیا وەك دەوڵەتی ئینتیدابکار بە سەر عێراقەوە، دیاری بکرێت.

لە ماوەی مانگەکانی نیسان و ئایاردا، چەند جار لە رێگای فڕۆکەکان سەردانی هەموو مەرکەزە کارگێرییەکانی عێراقم کرد، گفتوگۆی دوور و درێژم لەگەڵ ئەو کەسانەی کە نوێنەری هەر تایفەیەك و هۆزێکی گەورە دەکەن، کرد. هەروەها گفتوگۆم لەگەڵ رای سیاسی جۆراوجۆر کرد. بیروڕاکانی کە لەم چاوپێکەوتنانە دران لە مەرکەزە زۆر لێك دوورەکان لەیەکتری، تایبەتی (شەخسی) و کۆمەڵی بوون بە یەکەوە. سەرجەم

راكان لەگەڵ بیرۆکەی پەلەکردن لە دامەزراندنی سیستەمی دەستووری ناکۆك بوون. هەندێ لایەنی داگیرکردنی سەربازی، وەك دەستگرتن بە سەر ژمارەیەکی زۆر لە خانووی نیشتەجێ بوونی سەربازان، بووە مایەی بێزاری خەڵك، بەڵام ئیدارەی مەدەنی جگە لە کەمێك رەخنە نەبێت هیچی دیکەی ئاراستەی ئەو لایەنە نەکرد. هەموو حکومەتی زیاتریان دەویست، نەوەك کەمێك لە حکومەت. وڵاتان دەیانەویست هۆزەکان بۆ بەرزەفتکردن و دەسەڵاتی خۆیان ملکەچ پێ بکەن. پیاوانی هۆزەکانیش پشتگیری مولکداریان (سندات ملك) دەویست کە بە هۆیەوە خاوەنداریێتی ئەو زەوییەی کە بە مافی کۆنێتی لە دژی خاوەنە شەرعییەکانیان، بەکاریان هێناوە، زامن بکەن. هەروەها بازرگانەکان یاسا و دادگای قەزاییان دەویست، شارەوانی و نەخوشخانەکان دەسەڵات و پارەیان لە داهاتەکانی مەرکەز دەویست. خاوەن زەوی و جووتیاران وەکو یەك داوای کردنەوەی جۆگاکانی ئاو و دروستکردنی رێگای قیر و ئاسن و تۆی باش و گامێشی زاوزێ و یارمەتی بەیتەرییان دەکرد، بەم شێوەیە پێشکەوتن و گەشەسەندن، لە هەوا دەنگی دەدایەوە، باجەکان بەبێ زەحمەت دەدران و بە بێ فرمێسك کۆدەکرانەوە.

ئەو راپۆرتانەی دوای ئەمە، بەردەوام لە حاکمە سیاسییەکانی مەرکەزە جۆراوجۆرەکان تا سەرەتای حوزیران، دەگەیشتن، هەمان ناوەڕۆکیان دووپات دەکردەوە. هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە زۆربەیان شیعە بوون، جولانەوە نیشتیمانییەکانی بەغدا و موسڵ نزیکەی هەمووی سونەی بوون، بۆیە ئەو جەماوەرە شیعەیەی کە ماوەیەکی دوور و درێژ لە لایەن تورکە سونییەکان دەچەوسێنرانەوە، حەزیان بە بزووتنەوە نیشتیمانییە سونییەکان نەدەکرد، چەندین مانگ بەسەر چاپکردنی راسپاردەکانی لێژنەی بونها کارتەر بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی تێپەریوە و، لەلایەن پیاو ماقولانی عەرەبی سەرجەم ناوچەکان زانراوە، بەڵام پەرۆشیان بۆی پیشان نەدا و لە زۆر باردا بە ترسێکی راستەقینە وەریانگرت. ئەوان ئەو پێشنیازانەیان بە شۆڕشگێڕی دادەنا و پێیان وابوو نەوەیەك بەرلە ئێستا هاتووە.

## رای موسڵ و کەرکوك و سلێمانی

دوای چەند رۆژێك بە فرۆکە سەردانی کەرکوك و موسڵ و سلێمانیم کرد، هەموو ئەو راپۆرتانەی لە بارەی شیکردنەوەی رەوشی کوردەکان دەگەیشتن، لە سەر ئەوە کۆك بوون کە هێمنن و هیچ سۆزدارییەکی تایبەتیان نییە و لە داواکارییە نیشتیمانییەکان ناگەن، تەنها کەمێك نەبێت. کەرکوك بەردەوام شوێنی چینی فەرمانبەرانی تورك بووە، بۆیە ئەو بیرانەی پاڵپشتی لێیان دەکرد، رەگەزێکی دڵەڕاوکێ بوو لە شارەکە و تاڕادەیەکیش لە شاری موسڵ. سەرچاوەی مەترسی سەرەکی پیلانگێڕی شەریفی بوو، کە لە دێرەزورەوە ئاڕاستە دەکرا و لە دیمەشق پارەدار دەکرا. هێشتا حکوومەتی خاوەن شکۆ مانگانە برێکی ئێجگار زۆر بۆ پێکهێنانی رووخساری حکوومەتی سەربەخۆی سوری پارەدەدات، لە عێراق ئەو چەك و جبەخانەیەی کە پێشتر بەرێژەیەکی زۆر بە ماوەیەکی زۆر دوای شەڕ راگرتن، بە حکوومەتی شەریف دەدرا، دەرکەوت سەرباری ئەمەش هیچ شتێك لە ئارادا نەبوو، کە ئاماژە بەوە بدات کە بیروڕای خەڵك بە شێوەیەکی ترسناك دژایەتی ئینتیداب دەکات یان حکوومەتی مەدەنی ناحەز بووە، تەنها لای کۆمەڵەیەکی بچووك لەو پیاوانەی لە بواری سیاسی کار دەکەن و مانگانە مووچەکانیان لە دیمەشقەوە وەردەگرن.

## هەواڵنێری و پاساوەکان

کاتێ لە ٩ی حوزیران لە موسڵ بۆ بەغدا گەڕامەوە، لە مستەر مۆنتیگیۆ بروسکەیەکم (بە مێژووی ٧ی حوزیران) وەرگرت، ئەگەر پێی بکرابایە پێش (٣) مانگ ئەو بروسکەیەی بناردابا، دەمتوانی زۆربەی، ئەگەر هەمووشی نەبێت، لەو گیانانەی کە لە ماوەی سێ مانگی دوایی لە ناوچوون، رزگار بکەم:

ئێستا خۆشحاڵم بڵێم کە لە بارێکی وادام بتوانم، ئەو دەسەڵاتەی بۆ جاڕدانی گەڕانەوەی سیر پرسی کۆکس داواتان کردبوو، پێیان بدەم. حکوومەتی خاوەن شکۆ، هەست دەکات، کە لەبەرئەوەی کۆکس سەردەمێکی نوێ دەکاتەوە، مافی

خۆیەتی لە بارەی کاروباری ئەنجوومەنەکان، کە ئەرکییەتی سەرپەرشتییان بکات، راوێژی پێ بکرێت، سەبارەت بەم هۆکارانە، دانانی پێشنیازە بەپەلەکانتان بۆ جێبەجێکردن بەشتێکی ناپراکتیکی دادەنرێت. بەڵام راسپاردەکانتان بە تێبینی دان لە سەر هەندێ خاڵی ورد، وەردەگیرێت، بەو پێیەی بنەمایەکی گونجاو پێشکەش دەکات، کە بە هۆیەوە ئەو دامەزراوە کاتییانەی کە چەکی (صك) ئینتیداب کردوینە مەرج، پێکدەهێنرێت.

مستەر مۆنتیگیۆ بە سۆزە لە بروسکەیەکی دیکە سوپاسگوزاری حکوومەتی خاوەن شکۆی بەم دەستەواژانەی خوارەوە بۆ ناردووم:

ئێوە زۆر نرخی ئەو مەزەندانەی کە حکوومەتی خاوەن شکۆی رێنوێنی کرد، دەگرن، لە بڕیاردان بە پێویستی گەڕانەوەی پیرسی کۆکس بۆ عێراق، تاکو سەردەمێکی بێ گومان نوێ بکاتەوە. حکوومەتی خاوەن شکۆ، پێی گونجاوە کە ئەو کەسەی کە بنەما یەکەمینەکانی ئیدارەی مەدەنی دانا، دەبێت هەر خۆی سەرپەرشتی قۆناغەکانی بونیادی دواییش بکات. بەڵام چاو لەو کارە مەزنەی کە لەماوەی ناوەندی جێبەجێکرا، ناپۆشێ. هەر ئەو کارە گەورەیە بوو کە وایکرد ئەو پێشکەوتنەی ئێستا ئێمە لێی دەڕوانین, رووبدات. حکوومەتی خاوەن شکۆ ئەو دەرفەتە هەڵدەقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی دان بە توانا نایابەکانتان و ئەو پەرۆشییە بە هێزەی کە لە ماوەی دوو ساڵ و نیوی رابردوو خۆتان بۆ ئەرکە سەختەکانتان تەرخان کردووە، بنێ. ئەو دەرەنجامە سەرکەوتوانەتان بەدەست هێناوە. کۆتایی هات.

من ئەو بروسکەیە بۆ شانازی و خۆشی دەروونی خۆم ناچەسپێنم، بەڵکو وەك بەڵگەی هاوشێوە بوونی جەوهەری و بەردەوامێتی بیرە فەرمییەکانی بەغدا و لەندەن بە یەکەوە، لەم ماوە سەختەدا، دەهێنمەوە. شتێکی سروشتییە کە سەبارەت بە چارەسەرکردنی هەندێ لایەنی تایبەت بە گرفتەکان بیروڕا ئاڵوگۆڕ نەکرێت و رای جیاواز جارجارە هەبێت. لە ماوەی ئەو ساڵانەی کە راستەوخۆ پەیوەندیم بە وەزارەتی هیندەوە دەکرد، لە پاڵپشتی و هاوسۆزی مستەر مۆنتیگیۆ بۆ من دڵنیا بووم. هەروەها لەو یارمەتییانەی کە وەزارەتی

هیند پێشکەشی دەکرد، دڵنیابووم، سەبارەت بـەو کێشـە سـەختانەی کـە لـە بەشـداری پێکردنی دامودەزگاکانی دەوڵەت لە کاردا بە پێی توانا، رووبەڕووم دەبوونەوە، لە هـەموو ئەو شتانەی کە پیاو لە گۆرەپانی کارکردنـدا پێویسـتی پێیـەتی لـە ئـازادی جولانـەوە و دەسەڵات هەمووی بە من درا. رێگەم پێ درا بێ سـنوور لـە رادان ئـازادبم. لـە راسـتیدا ناتوانم هیچ رووداوێکی وا لە ماوەی ئەم سێ ساڵە و سێ ساڵی پێشـتر، کـە نوێنەرایـەتی سێر پرسی کۆکسم[1] دەکرد، بهێنمەوە یاد، کە ئیدارەی مەدەنی ئـەو بریارانـەی وەزارەتـی هیند لە چوارچێوەی ئەو کاروبارانەی کە لە بازنەی تایبەتمەندێتی خۆیدایە، شەرمەزار یـان بەرپەرچ دابێتـەوە. ئـەو کێشـانەی کـە چارەسـەکردنیان، ئەسـتەم بـوو، لـە دواکـەوتنی دەرکردنی بەیانێکی روون لە بارەی نیازەکانمان و بێ توانـایی وەزارەتـی جـەنگ و ئـەوانی وەك ئەون لە عێراق، دابین کردنی ئەو شتانەی بـە هۆیـەوە دەتـوانن رووبـەڕووی حاڵـەتی سیاسی ببنەوە، سەرچاوەی گرتبوو.

هیچ کام لە (سێر ئارسەر هێرتزل) و (مستەر شکبرغ)، سەردانی عێراق یان ئێران یان دوورگەی عەرەبیان نەکرد، بەڵام ئەوانە لە جەوهەری شتە هیواخوازەکان و بەڵگە سەیرنەکراوەکان، دەگەیشتن. ئەمەش وایکرد یادداشـتە فەرمییـەکانیان، پشـت پـێ بەسـتراوبێت و لـە هەنـدێ یادداشـتەکانی کاروبـاری عـەرەبی رووناکتربێـت. ئـەوان بەداماڵڕاوی سەیری کێشەکانمانیان دەکرد، لەچاو کێشەکانی ولاتانی دەورووبـەر، کـە ئێمەی ئامادە لە گۆڕەپانی کارکردنـدا، چـەند زانیارییـەکی کـەم نـەبێت، هیچـمان لەبارەیانەوە نەدەزانی. کە پەنایان بۆ رەخنەی تونـد دەبـرد، بـەردەوام هاوسـۆزبوون. نامە تایبەتییە دەگمەنەکانیان، نامەی پڕشنگداری ژیان بەخش بوون. لەدوا هەوڵدا دەیانزانی چۆن پێمان بڵێن کە ئەوان ملکەچـی بڕیارەکـانی سـەرۆکە سیاسـییەکانیان بوونە. بەپێچەوانە زیرەك بوون لە بەڕووخستنی دیـدی پیـاوی ئامـادە لـە گۆڕەپـانی

---

١- سیر برسی کۆکس حاکمی پاشایەتی لە عیراق لە سەروبەندی شۆڕش بـە ئـەرکێکی تایبـەت بـۆ ئێران بە پلەی باڵیۆز نێردرا و (ویلسن)ی نووسەری ئەم کتێبە لە شوێنی دانرا.

کارکردندا، لەبەردەم وەزیرە بەرپرسەکان، بەم شیویە ئێمە لە لووتەوە ریشمەکرابووین، بەڵام تەنها هەستمان بە لووتمان دەکرد.

ماشێنی ئەو حکوومەتەی کە کاروبارەکانی وڵاتانی ژێر ئینتیدابی بەڕێوە دەبرد، ماشێنێکی هێواشی هەراسانکەر و کەموکوڕی زۆری هەبوو، بەڵام ئەو پیاوانە و یارمەتیدەرانیان وایاندەکرد، دەزگاکە بەتەواوی پەکی نەکەوێت.

## رەوشەکە لە بەغدا

دوای ئەو کورتە باسە، کە دەکرێت بەهۆیەوە پەیوەندییە تایبەتییەکانی نێوان دەسەڵاتە بەرپرسەکان لە وایت هۆڵ و بەغدا روون بکاتەوە، پێویستە کە بۆ رەوشەکە لە بەغدا لە ماوەی هەفتەی دووەمی مانگی حوزێران، بگەڕێمەوە. هێشتا مانگی رەمەزان بوو، ئەو مانگەش بە ورژێنەری ئایینی لای موسولمانەکان ناسراوە، موسوڵمانەکان لە رەمەزاندا بەرۆژوو دەبن، بەمەش دەمار و میزاج و کۆئەندامی هەرسیان دەکەوێتە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی سەخت، بەتایبەتی کاتێ رەمەزان لە وەرزە گەرمەکانی ساڵدا دێت. بۆیە بڕیارم دا پەخشکردنی بەیاننامەکە بۆ کۆتایی مانگی ئیسلامی (هەیقی) دوابکەوێت، ئەم بروسکەی خوارەوەم لە ٩ی حوزەیران بۆ وەزارەتی هیند کرد....

دەرکردنی بەیاننامەکە بە گوێرەی ئەو بنەمایانەی کەلە بروسکەکانی حەوتی حوزەیراندا فەرمانتان پێ کرد، بۆ کۆتایی مانگی رەمەزان، واتا تا هەژدەی مانگی حوزەیران دوادەخرێت. بەیاننامەکە نارەزایەتی توندی لەلایەن ئەوانەی داوای سەربەخۆیی تەواو دەکەن، لێ دەکەوێتەوە، لەوانەیە خۆپیشاندانیش بکرێت. بۆ رووبەڕووبونەوەی بارەکە، پێشنیازدەکەم، کە شاندێك لە عێراقەوە کە ئەندامەکانی لە (٨) کەس زیاتر نەبێت و لە هەموو لایەکی عێراق نوێنەریان تێدابێت بۆ بەرووخستنی بیروڕاکانتان بۆ ئێوە، بەرەو ئینگلترا بەرێ بکەوێت. لەوێ لەو باوەڕە داین، کە ئەو پێشنیازە بە چاکی وەردەگیرێت.

تا ئەو کاتەی شاندەکە بەرێدەکەوێت، یان بڕیاری پێکهێنانی دەدرێت، لەو باوەڕەدام ئێمە تا توانا هەبێت لە ڕێگای ئاشتەوایی دەچینە پێش، لەو باوەڕەشدام کە هێزێکی وام لە بەردەستە کە بتوانم ڕێوشوێنی توند دژی ئەوانەی ئاشتەوایی ناکەن، کە دەسەڵاتی روو لە زیاد بوونیان، مەترسی گشتی دروست دەکات، بگرمەبەر. پیاو ماقولانی هەموو لایەکی وڵات رۆژانە بۆ سەرکوتکردنی ئەوانە هانم دەدەن.

ئەم کارە گیان وەبەر میانڕەوەکاندا دەهێنیتەوە و پێکهێنانی پارتی میانڕەویش، کە ئێستا ئامادە نییە، ئاسان دەکات. بۆیە توندڕەوەکان بە تەنها دەستیان بە سەر شانۆکەدا گرتووە. کۆتایی هات.

دوای ئەمەش ئەو بروسکەیەی خوارەوەم بۆ سیر پرسی کوکس نارد، کە لە ڕێگەی بەغداوە تارانی بەرەو لەندەن جێهێشت. راسپاردەیەکی کۆمەڵایەتیم لە بەڕێوەبەری داد و بەڕێوەبەری دارایی و حاکمی سەربازی بەغدا لە بەر دەستەدایە، داواتان لێ دەکات، کە پێویستە بۆ دیدەنی پیاو ماقولانی وڵات، چەند رۆژێك لە بەغدا بمێننەوە، پێش ئەوەی بۆ نیشتیمان بگەڕێنەوە. دەبوو هەر لە سەرەتاوە راسپاردەی ئەمە بەبێ دوو دڵی بکەم، ئەگەر گەیشتنی ئێوە لەگەڵ کۆتایی رەمەزان هاوکات نەبوایە. ئەو کاتەش، ئەو دەرفەتەیە کە من خۆم بە ناچار دەبینم، کە ژمارەیەك لە ناحەزانی حکوومەت لە بەغدا و نەجەف و شوێنانی دیکە دەستگیر بکەم و بۆ دەرەوەی وڵات دووریان بخەمەوە. بێ گومان نارەزایەتی توند لەلایەن موجتەهیدی گەورەی کەربەلا و شوێنی دیکە پێشکەش بکرێت. به دوور نازانرێت پەشێوی لە بەغدا رووبدات. هەموو ئامادەباشییەك بۆ ئەمە ئەنجام دراوە. هەموومان کۆکین لە سەر ئەوەی کە گرتنەبەری ڕێوشوێنی توند لە دژی گەورە ناحەزانی حکوومەت، کە هەموویان پلەیەکی کەمیان لە کۆمەڵگا هەیە، وادەکات میانڕەوەکان لەلای ئێمە کۆببنەوە. هەروەها ئەمەش وادەکات هۆزەکان بە شێوەیەکی گشتی بەوە رازی بن کە پەیمانەکەی ئێمە بە دامەزراندنی حکوومەتێکی سەربەخۆ لە ژێر ئینتدابی بەریتانی، مانای نەمانی دەسەڵاتی یاسایی و بەرپابوونی پەشێوی ناگەیەنێ.

زۆرێك لەو ناوچە عەشایەر نشینانەی کە من بەفڕۆکە لە ماوەی چەند ڕۆژی دوایی، سەردانم کردوون، لەوانەیە بەهەمان شێوە بیری لێبکەنەوە. لەوانەیە ئامادەبوونتان، لەم بارودۆخەدا لە بەغدا، لە پابەندبوون لە جۆرێك لە پاڵپشتی بۆ ئەم کارایانە، بئالێنێ. بەپشت بەستن بە کۆی را بەهێزەکان، وای دەبینم، کە پێویستە ئێوە لێرەدا چەند ڕۆژێك ئارام بگرن، منیش ڕێوشوێنی پێویست لە سەر ئەم بنەمایە وەردەگرم.

## مانەوەی (سیر پرسی کۆکس) لە بەغدا

سێر پرسی کۆکس دوای گەڕانەوەی بۆ حکوومەتی خاوەن شکۆ، لە سەر ئەم ڕێرەوە رازی بوو. لە ۱۸ی حوزیران، گەیشتە بەغدا. لە ۲۰ی حوزیران لە ڕۆژنامە گشتییەکاندا بەیاننامەیەك بە واژووی من، بەم شێوەیە دەرچوو:

حکوومەتی خاوەن شکۆ، دوای ئەوەی پەیمانی ئینتیدابکردن بەسەر عێراقەوەی پێدرا. چاوەروان دەکات کە ئینتیداب بەسەر عێراق، دەوڵەتێکی سەربەخۆی پێکبهێنێ و کۆمەڵەی نەتەوەکان زامنی بوونی بکات و بکەوێتە ژێر دەستی بەریتانیای مەزن. بەمەش بەرپرسیارێتی پارێزگاری ئاسایشی ناوەخۆ و دەرەوەی دەکەوێتە ئەستۆ. هەروەها داواشی لێدەکرێت کە یاسایەکی بنەڕەتی بە راوێژ لەگەڵ خەڵکی عێراق و بەلەبەر چاوگرتنی ماف و خواست و بەرژەوەندییەکانی سەرجەم تایفەکانی عێراق، دابرێژرێت. ئینتیدابکردن پێشکەوتنی عێراق وەك دەوڵەتێکی خودان حوکمی زاتی ئاسان دەکات، تا ئەو کاتە دێت کە عێراق دەتوانێ بە تەنها لەسەر پێی خۆی بوەستێ، ئەو کاتەش ئینتیداب کۆتایی دێت. حکوومەتی خاوەن شکۆ بڕیاری داوە، ئەم ئەرکە راستەوخۆ بە سێر پرسی کۆکس بسپێرێ. پرسی کۆکس لە پاییز لەسەر ئەم بنەمایە بۆ بەغدا دەگەڕێتەوە، لە پۆستەکەی دەست

بەکار دەبێت. ئەو کاتەش کاری ئیدارەی سەربازی ئیستا کۆتایی دێت، کۆکس دەبێتە سەرۆکی نوێنەرایەتی بەریتانیا لە عێراق.

پرسی کۆکس دەسەلاتی تەواوی بۆ پێکهێنانی دەستە کاتییەکان (ئەنجوومەنی دەولەت) پێدەدرێت، کە سەرۆکێکی عەرەب سەرۆکایەتی دەکات، (ئەنجوومەنی هەلبژاردن) کە دانیشتوانی عێراق بە ئازادانە هەلیدەبژێرن و بە راستی نوێنەرایەتی تێدا دەکەن. کۆکس ئەرکیەتی کە یاسای بنەڕەتی بە راوێژ لەگەل ئەنجوومەنی هەلبژاردن، ئامادە بکات[1]. کۆتایی هات.

لە ٢٣ی حوزێراندا مستەر مۆنتیگیۆ ئەم لێدوانەی خستە بەردەم ئەنجوومەنی عەوام. هەروەها دوای دوو رۆژیش خستیە بەردەم ئەنجوومەنی لۆردات، لۆرد (ئەسلنگتۆن) رایگەیاند کە لێدوانەکە لە ژێر فشاری بەردەوامی خەلك و رۆژنامەکان بە پلەی یەکەم دەرچووە.

بە بەراورد کردنی ئەو داهاتانەی کە لە ویلاتەکانی بەسرە و بەغدا لە وشکە سالی دوای داگیر کردن لەگەل داهاتەکانی ویلاتەکانی بەغدا و بەسرە و موسل لە ماوەی سالی دوایی کۆدەکرانەوە. وای پێشاندەدا کە ئەو بڕە پارانەی کە سوپا بە ئیدارەی مەدەنی دەدا، کە ئەویش داهات بوو، بە ریژەی ٤٣٧٪ لە ماوەی یەك سالدا زیادی کردووە، بەلام ئەو لۆردە بە خستنە سەری خەرجییەکانی بەندەری بەسرە و هێلی ئاسنین و ئاودێری لە ریز بەندی خەرجییەکاندا باوەڕی بەخۆی هێنا کە (تێچوونەکان) بەرێژەی ٤٩٠٪ زیادی کردووە.

---

١- لە کاتی خویدا، بلاوکراوەی ژمارە (٧٠) لە رۆژنامە عیراقییەکاندا بلاوبووەوە ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی تێدا بوو، بەلام لە بەر ئەوەی لە چاو دەقە ئۆرگاینالەکەی شێوێنرا بوو، بە تەواو لەگەلی دا نەدەهاتەوە، بۆیە بەم شێوەیە بۆ عەرەبیم وەرگێڕا و بەم شێوەیە لێرەدا دامبەزاند.

لەم پێشەکییەوە، سەخت نەبوو، کەمکردنەوەیەك ئەنجام بدات کە لەو بانگەشەیە نزیك بێت کە دەڵێت: هۆکاری پەشێوی سیاسی بە پلەی یەکەم، باجی زۆرە. قسەی سەرۆك وەزیران لە بارەی پێشوەختە دەرچوونی بەیاننامەکە رەتکردەوە. نە ئەم و نە ئەو وتاربێژانەی کە دوای ئەو قسەیان کرد هیچ ئاماژەیەکیان بە رەوشی سوریا نەدا.

لۆرد (سیدنهام) دڵەراوکێ و پەشیوی لای ئێمەی بۆ تورکەکان و بەلشەفیکەکان گەڕاندەوە. هەرچی لۆرد (گوچن)ە، کە تاکەکەسی نێو ئەوانەی وتاریاندا، سەردانی عێراقی لە ساڵی ١٩١٩ کردبوو، زۆر بە گەرمی سوپاسی ئەفسەرانی ئیدارەی مەدەنی کرد و گوتی:

ئەوان لە بیابانەکانی عێراق بڵاوبوونەتەوە لە سەختترین و مەترسیدارترین بارودۆخ دەژین، بەبێ ئەوەی بزانن چی بەسەر داهاتووی حکومەت دادێ لە وڵاتدا. ئەوان پێشتر مەشقێکی جیا و گەشەیەکی جیایان بینیووە، بەڵام هەموویان بە ئارەزووی پێشکەوتنی ئەو وڵاتەی باوەڕیان پێیەتی، گرێدراون. ئەو گەنجانە شایەنی ئەوەن ئێمە دان بنێین بە کارە باشەکانیان لەبەرئەوەی خاوەن ئینتیما و بەپەرۆش و دڵسۆزن لە کارەکانیان......... باوەڕ دەکەم کە خەڵکی ئەم وڵاتە، ئەگەر لە بارەی ئەوەی کە ئەمانە ئەنجامی دەدەن، بزانن، ئەوا فەزڵیان لای ئەوان زیاتر دەبێت.

لۆرد (کیرزن)[1]. گفتوگۆکەی کۆتایی پێهێنا، کە لە ئەنجوومەنی لۆردات پێشکەشی کرد و، گوتی: وەزارەتی دەرەوە نەوەك وەزارەتی هیند بەرپرسی کۆتایی یە

١- ئەو کات بریکاری وەزارەتی دەرەوە بوو، مستەر ئایرلاند لە کتێبەکەیدا (عیراق لێکۆلینەوە لە گەشەسەندنی سیاسی) دەڵێت : ئەو پەشێوییە سیاسییەی کە لە ساڵی ١٩٢٠ روویدا، بەپلەی یەکەم

لە راپەراندنی کاروباری ئیدارەی تایبەت بە عێراق، کیرزن ئەگەر لە رەوشێکی باشتر بوایە، دەیتوانی بۆ لۆرد ئەیسلینگتۆن روون بکاتەوە، کە باجی زەوی کە لە ساڵی ١٩١٩ — ١٩٢٠ کۆکرایەوە، زۆر لەوەی سەردەمی تورکان کەمتر بوو. تێچوونە ئیدارەییەکان، جگە لە تێچوونەکانی بەندەرەکان و هێڵی ئاسن و ئاودێری زۆرتر نەبوو. دانیشی نا کە بۆ بابەتەکانی ژمارەدان ئامادەنییە، بەڵام بە ئاشکرا روونی کردەوە کە دوورکەوتن لە چارەسەی کێشەی عێراق، بە پلەی یەکەم هۆکارەکەی نەبوونی کاتی پێویست بوو بۆ سەیر کردنی ئەو گرفتە و گفتوگۆکردنی و

---

بە هۆی کۆکردنەوەی بەرزۆرەملێی باجەکانەوە نەبوو، هەروەك لۆرد (ئەسلنگتۆن) لە ئەنجوومەنی لۆردات قسەی لە بارەوەکرد. لە راستیدا باجەکان شتێکی هەراسانکەرە. مامۆستا (کیرك) لە کورتەی مێژووی رۆژهەلاتی ناوەڕاست) دا دەڵێت: ئەو داهاتانەی کە لە ساڵی ١٩٢٠ لە باجەکانەوە کۆدەکرایەوە گەیشتە سێ هێندە و نیوی ئەوەی تورکان لە ساڵی ١٩١١ کۆیان کردەوە. باجەکانی عیراق زۆر لەوەی هیندیش قورستر بوون، ئەمەش فشاری زیاتر بۆ سەر جووتیاران دەهێنێ و لە هەمان کاتیشدا بێزەوەریش بوون بۆ خاوەن زەوی و پیاو ماقولان و ئەو هۆزانەی کە پێشتر خۆیان لە باج دان دەدزییەوە. عیراقییەکان مافی رادانیان لە سەر ئەو لایەنانەی کە ئەو داهاتانەی تێدا خەرج دەکرا، نەبوو. لە ١٦٪ی کۆی خەرجییەکان لە ساڵی دارای ١٩١٩ — ١٩٢٠ بۆ بارەگای گشتی و خەرجییە ئیدارەییەکان تەرخان کرابوو، ١١٪ی هەر بە ناو بۆ کارپێکردنی گشتی دیاریکرا بوو. بەلاّم زۆربەی لە ئاسانکاری گوزەران و شوێنی دانیشتنی فەرمانبەرانی بەریتانی و هیندی خەرج دەکرا، ویلسن لە لێدوانیکدا گوتی کە بەرژەوەندی عیراقە کە رێژەیەکی زۆر لە فەرمانبەری بەریتانی لە سەرجەم دەزگاکان هەبێت. ئەنجوومەنە لۆکاڵییە راوێژکارییەکانی ناوچەکان، کە زۆربەی ئەندامانیان عەرەب بوون، هیچ کاریگەرییەکیان لە سەر بەڕێوەچوونی ئیدارە نەبوو. کەمتر لە ٤٪ فەرمانبەرانی پلە یەك عەرەب بوون، ژمارەی فەرمانبەرە هیندییەکانی دائیرەی هیلی ئاسنین پێنج هێندەی عەرەبەکان بوو. دوای هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی عیراق مس بێل گوتی: سەیرە کە ژمارەیەکی زۆر لەمیانڕەو لە عیراقدا هەن و منیش یەکێکم لە وان، بەلاّم سەختە ئارام بگرێت کاتێ بیر لە ژمارەی ئەو هەڵە گەورانە دەکەینەوە کە لە عیراق ئەنجامان داوە.

پەسەندکردنی لە لایەن وەزارەتەوە وەك پێویست، لەو بارەدا کارەگشتییەکان بە سەر یەکدا کەڵەکە دەبوون. هەروەها لە درێژەدا گوتی: بەیاننامەکە پشتی بە راپۆرتەکەی لێژنەی بۆنهام کارتەر (کە بەر لە مانگێك ئامادە و چاپکرابوو) دەبەست. هەروەها بانگەشەی ئەوەی کرد کە حکوومەتی خاوەن شکۆ هەرگیز بە ئەنقەست سەرپێچی پرەنسیپە دانراوەکانی قۆناغە بەراییەکانی جەنگی نەکردووە، دواکەوتن لە جێبەجێکردنی ئەو پرەنسیپانە، بۆ فاکتەرگەلێك کە لە دەرەوەی تواناکانی هاوپەیمانانە، دەگەڕێتەوە. هەروەك پێشتر روونمان کردووە، حکوومەتی خاوەن شکۆ هێشتا نیازی وایە لە دامەزراندنی شێوەیەك لە شێوەکانی حوکمی زاتی (ئۆتۆنۆمی)، کە هەموو عێراقییەکان پێ رازی بن، بەردەوام بێت. ئینجا گوتی: هیچ بەیاننامەیەك نییە لەوەی کە داوای گۆڕانکاری راستەقینە دەکات، پێشوازی لێ بکەین. بەڕای من پێمان خۆشە رژێمێکی تایبەت، تاکو خودی پاشایەتیش بێت لە عێراق هەبێت. لۆرد کیرزن وتارەکەی بە جەختکردنەوە لە بێ مەیلی پیاو ماقولانی لۆکاڵی لە وەرگرتنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن، لە ماوەی گواستنەوەدا، کۆتایی پێهێنا و گوتی:

........ کێ لە عەقلیەتی گەلانی رۆژهەڵات دەگات، دەبێت هەر ئێستا بڕیار بدرێت، کە ئەوان ئەوەی دەکرێت رووبدات، لە عەقلیان هەڵدەسەنگێنن. ئەوان بۆ یارمەتی ئێمە نایەنە پێش. ئەو دوورە پەرێزییەیان لە ئێمە بەم شێوەیە لێکدەدەنەوە: ((با وای دابنێی،کە ئێمە لێیان نەچووینە پێش و بەریتانییەکان لە عێراق مانەوە، ئەوا لەبەرئەوەی ئەوان خانەدانن، لە ئێمە خۆش دەبن، بەڵام ئەگەر لەگەڵیان بە رێگادا بڕوین و دواتر تورکەکان بۆ وڵات بگەڕێنەوە، ئەوا ئێمە رووبەڕووی تۆڵە سەندنەوە دەبین. هەر ئەمەش لە کوت روویدا، هەموو ئەوانەی چیرۆکی سزای لە سێدارەدانی خەڵکی هەژاری

کوتیان[1] له رۆژنامەکان خوێندبێتەوە، دەزانن کە دوای چۆڵکردنی شارەکە لە لایەن هێزەکانمانەوە، ئەم کارە روویدا، ئەو ترسە مێشکی خەڵکی داگیر کردبوو..

ئەمە بەرووخستنێکی جوانی رەوشی عێراق بوو، دەکرا زۆر زیاتر کاریگەری لە سەر دەروونەکان دابنێ. ئەو لۆردە سروشتی پیلانگێرییەکانی شەریفی کە سەرچاوەی یەکەمی یان تاکە سەرچاوەی ئەو پەشێویانە بوون، کە لای ئێمە روویان دەدا، باس نەکرد. هەروەها هیچ ئاماژەکیش بۆ سەختییەکانی پارێزگاریکردن لەو رەوشەی کە لە رێگەی رێککەوتننامەی (ئینگلیزی + ئێرانی)ی ساڵی ١٩١٩، مۆرکرا. هەر چەندە خەرجییە سەربازییەکانمان لە ئێران لە ماوەی ساڵی ١٩٢٠ بە بڕی پێنج (٥) ملیۆن پاوەندی ئیسترلینی مەزەندە کرا. بۆیە ئەو گفتوگۆ پەرلەمانییەم لێرەدا هێنایەوە، چونکە کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر حالەتی عێراق هەیە، من بە وردی چاودێریم دەکرد. فەرمانمدا بەکۆپیکردن و دابەشکردنی بەسەر فراوانترین دام و دەزگا، بەو پێیەی باشترین دژەتەنە، بۆ راکانی لایەنێك لە رۆژنامەکانی لەندەن.

لە ١١ ی حوزێراندا، دوای یادداشت گۆڕینەوە لەگەڵ پرسی کۆکس بەیاننامەیەکم[2] دەرکرد، کە پێش سێ رۆژ لەمبارەیەوە بە مستەر مۆنتگیۆم راگەیاندبوو، لە

---

١- پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کاتی تورکەکان لە سەروبەندی دەست بەسەر گرتنی ئینگلیزەکان بەسەر بەغدا، دووبارە کوتیان داگیرکردەوە ئەمەش دوای گەمارۆیەکی درێژ، کەوایکرد (تاوزەندی) فەرماندەی ئینگلیزی بە (١٤٠٠٠) سەربازی بەریتانی و هیندی خۆی بە دەستەوە بدات. دواتر تورکەکان بە ئەنقەست ژمارەیەك لە خەڵکی کوتیان لە سێدارە دا، لەوانە : حاجی عەباس حلی و دوو کوڕەکەی (عەلی و سەعد) و محەمەد نەجیب سەرۆکی شارەوانی کوت و ناموس شێخ جسان و عەباس زاهر الجمیعی و یاسین ئەلجەعفەری و عەبدالرزاق سەحاف. ...

٢- دەقی ئەو بەیاننامەیەی کە ئەو رۆژە دەرچوو، دەخەینەڕوو:

هەروەك دەرکەوتووە، کە هەندێ کەس پڕوپاگەندەی ئەوە بلاّودەکەنەوە گوایا حکوومەتی بەریتانی خەریکە هێزە سەربازییەکانی لە عیراق بکشێنێتەوە. هەندێ پڕوپاگەندەی دیکە کە زیان بە ئاسایشی گشتی دەگەیەنێ، بۆیە من سێر ئارنۆلد ویلسن جێگری حاکمی پاشایەتی لە عیراق بۆ

بەیاننامەکە باسی ئەوەم کردبوو، کە حکوومەتی بەریتانی لەبەرئەوەی بەرپرسی دابینکردنی سیستەم و ئاسایشی ناوەخۆی عێراق بوو، ئامادە نییە هیچ ژمارەیەك لەسەربازانی لە عێراق وەدەربێنێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە کاردەکات و بەردەوام دەبێت لە پارێزگاریکردن لە هێزەکانی، بۆ بەدەست هێنانی پابەندییەکانمان.

هیوام دەخواست کە ئەو بەیاننامەیە وابکات، نیشتیمان پەروەران واز لە کاربهێنن و وابکەن رێوشوێنی سەرکوتکردن پێویست نەبێ. بەیانەکە نەیتوانی ئەم ئامانجە بپێکێ: بزووتنەوە نیشتیمانییەکان لە دەست دەرچووبوون، دووبارە کۆبوونەوە و داوای پێویست بوونی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی کە بڕیار لە داهاتووی عێراق بدات، دووبارە کردەوە. ئەمەش دوایین هەڵ بوو کە ئەوان وەك دەستەیەکی یەکگرتوو تێیدا دەرکەوتن، ناکۆکییەکانی نێوانیان رووی لە زیادی کرد و پەرەسەندنی پەشێوی عەشایرییەکان وایکرد گرووپێکی گەورەی میانڕەویان لێ جیاببێتەوە، لەو جولانەوانەی ئەنجامیان دەدا ئاگادارم کردنەوە، دواتر نەیانتوانی بەرجەستەی بکەن، هەتاکو بانگهێشتی نوێنەرانیش، بەوەی نوێنەرایەتی عێراق بەیەکگرتوویی دەکەن، شتێك بوو نەدەکرا پارێزگاری لێبکرێت. ئەندامانی ئەنجوومەنی ناوچەی بەسرە کردەوەکانی ٢٢ی حوزێرانی نوێنەرانیان ریسواکرد و متمانەی خۆیان بۆ حکوومەتی بەریتانی پیشاندا، لە عەمارەش هەوڵێکی زۆر بۆ پاڵپشتی کردن لەو عەرزوحاڵەی کە داوای سەربەخۆیی دەکرد، درا. بەڵام نەتوانرا ئەو کەسە بدۆزرێتەوە کە عەرزوحاڵەکە واژووبکات، عەرزوحاڵەکە دڕێنرا و شاری موسڵیش نوێنەرایەتی لە نێوان نوێنەران نەبوو.

---

سوودی گشتی رادەگەیەنم : کە حکوومەتی بەریتانی، لەبەر ئەوەی لە ئاشتی و ئاسایشی ناوەخۆی ئەم وڵاتە (عیراق) بەرپرسە، هیچ نیازێکی نییە کە بەشێك یان هەموو هێزە سەربازییەکانی لە عیراق بکشێنێتەوە، بەپێچەوانەوە هێشتا هێزە سەربازییەکانمان پارێزگاری سەرجەم جۆرە چەکەکان دەکەن، کە بۆ پاراستنی ئارامی و ئاسایشی ناوەخۆ و دەرەوە بەتەواوی بەش دەکات. من لەکاتی پێویست دا کەمتەرخەم نابم لە داواکردنی یارمەتی لە دەسەڵاتی سەربازی.........

## لێژنەی یاسای هەڵبژاردن

دەرکردنی بەیاننامەیەکی دیکە لە ١٢ی تەموز، لە خستنە نـاوی رەگـەزە پشـت گوێخراوەکان بۆ ناو تەرازوو، سوودی هەبوو. ئەمە لەوکاتەدا بوو، کـە رێوشـوێن بـۆ گفتوگۆی یاسای هەڵبژاردنی تورکی گیرابووەبەر، دانیش بەوەنرا بوو کـە ناکرێـت لـە بارودۆخی ئێستا جێبەجێ بکرێت، ئەمە دەقی بەیاننامەکەیە:

حکومەتی خاوەن شکۆ رێگای بە بریکـاری حـاکمی مەلـەکی داوە، کـە گـەورە نوێنـەرانی هەرێمـە لۆکاڵییـەکان بانگهێشـت بکـات، بۆئـەوەی لـە دانـانی ئـەو پێشنیازانەی کـە بـەهۆی هەڵبـژاردنی ئەنجوومـەنی گشـتی لـەکاتی گونجـاو ئـەنجام دەدرێـت، هاوکـاری ئیـدارەی مـەدەنی بکـات. هـەروەها لـە وەرگرتنـی رێوشـوێنە پێویستەکان بۆ دیاریکردنی ناوچەکانی هەڵبژاردن و ئامادەکردنی تۆماری هەڵبـژێران و سەرجەم ئەو بابەتانەی کە بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی گشتی پێویستن، لەبەر ئەوەی کەسانێك لە عێراق هەبوون، پێشتر لە ئەنجوومەنی ئەعیانی تورکی یـان ئەنجوومـەنی نوێنەرانی تورکی نوێنەربوون، ئەوانە سەبارەت بە کاروباری پەیوەندیدار بە هەڵبژاردن و گفتوگۆی کاروباری گشتی ئەزموونیان هەبوو، بۆ هەمان مەبەست ئەوانە هەموویان لەلایەن حاکمی مەلەکی بانگهێشت کران. داوا لەو لێژنەیە دەکرێـت، سـەرۆکێك لـە ئەندامانی دابنێ، ئەندامانی زیاتریش لەو ناوچانەی کە نوێنەریان نییە، جا چ بەهۆی ئامادە نەبوون یان مردن یان هەرهۆکارێکی دیکە بێت، دیاری بکات. کۆتایی هات.

بەرێز تالیب پاشا کوڕی گەورەی نەقیبی بەسرە، دیارترین کەسایەتییەکانی بەسرە یاخود تەواوی عێراق بووبێ، کەلە نێـو ئەوانـەبوو بانگهێشـت کرابـوو. لـە شـوباتی ١٩٢٠، دوای ئەوەی ساڵانی جەنگی بە ئارەزووی خۆی لە دوورە وڵاتـی لـە هینـد و بەسەربرد، گەڕایەوە بەسرە. زۆربەی ناوبانگەکەی بـۆ جەسـارەتەکەی لـە سـەردەمی تورکەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجـە سیاسـییەکانی دەینوانـد، دەگەڕایـەوە. بـەڵام بـێ گومان بەر لە جەنگ زیاتر ناوی دەرکرد، بەو پێیەی قسەکەربوو بەناوی هیواوخواستە نیشتیمانییەکان، پارتی نیشتیمانی سوریش هەر بەم پێودانگـە حسـابی بـۆ دەکـرد،

لەوەتەی گەڕاوەتەوە، هیچ هەلێکی بۆ بەدەرخستنی باوەڕەکەی لەدەست نەداوە، بەوەی کە باشترین عێراق، ئەو عێراقەیە کە ئینتیدابی بەریتانی قەبوول دەکات. نەخۆی و نەسەرجەم نوێنەرانی پێشووی بەسرە و ئەوانەی دیکە لە خۆشویستنی ئەم بانگەشەیە، دوودڵ نەبوون، هەروەها نێردەکانی پێشووی بەغداش ئامادەبوونیان لە لێژنەکە رەت نەکردەوە، هەرچەندە دوانیان لەسەر عەرزوحاڵی ٢ی حوزێران وەك نوێنەر واژووشیان کردبوو.

لە شەشی ئابدا لێژنەکە یەکەم دانیشتنی خۆی سازدا، دوای ئەوەی لێژنەکە لەلایەن حاکمی پاشایەتی کرایەوە، بەڕێز تالیب پاشا بەسەرۆك هەڵبژێردرا. لە رۆژی دووەم لێژنەکە لە دیاریکردنی ئەندامانی دیکە بەردەوام بوو، کەلە نێوانیاندا یوسف سویدی و محەمەد سەدر و بیریارانی ناسراوی دیکەی هەبوون. لەبەرئەوەی لێژنەکە بەم شێوەیە پێکهێنرا نەدەتوانرا بەوە تۆمەتبار بکرێت کە نوێنەرایەتی را جیاجیاکانی وڵات لەخۆ ناگرێت.

## توندبوونی رەوشەکە لە بەغدا

دوو لە سەرۆکەکانی نوێنەران بانگهێشتەکەیان رەتکردەوە، لە هەمان کاتدا لێیان زانراوە کە بەنیازن بۆ دوایین جار پەنا بۆ پێخواسەکانی بەغدا بەمەبەستی سازکردنی ئاهەنگی مەولوود لە یەکێك لە مزگەوتەگەورەکان، بەرن. دواتر لە رێپێوانێکدا، خۆپیشاندان بەشاردا بکەن. ئەنجامی ئەمەش هەردەبێت توندوتیژی و پەشێوی مەترسیداری لێبکەوێتەوە. فەرمان بە دەستگیرکردنی چواریان دەرچوو[1]، سێیانیان توانییان بۆ دەرەوەی وڵات رابکەن، بەڵام بڕیاری دەستگیرکردنیان بە بڵاوکراوەیەك هاوپێچ کرابوو، کە تێدا سازکردنی ئاهەنگی مەولوود لەلایەن ئەو کەسانەوە قەدەغە

١- ئەم چوار نوێنەرە بریتی بوون لە جەعفەر ئەبو تەمەن، یوسف سویدی، عەلی بازرگان و شێخ ئەحمەد داود، کە تەنها ئەمەی دوایی دەستگیرکرا.

دەكات، ئەم كارە متمانەی بۆ دەروونەكان گەڕاندەوە. داگیركردنی شام و حەلەب لەلایەن فەڕەنسییەكان و كەوتنی حكوومەتی شەریف لە سوریا لە ٢٥ی تەموز، كاریگەری دیاری هەبوو، هەروەها ئەمە مانای وەستانی ئەو بەخشینانە بوو، كە لە خەزێنەی حكوومەتی خاوەن شكۆوە بە نیشتیمانپەروەرە بەكرێگیراوەكان لە عێراق دەدرا.

سیر پرسی كۆكس لە ٢٢ی حوزێران دا، لە نامەیەكدا كەبۆ وەزارەتی هیندی ناردبوو، ڕەوشی عێراقی بەم شێوەی خوارەوە، كورت كردبووەوە بەرلەوەی بەغدا جێبهێڵێت:

..... دوای سەردانە خێراكەم كە دوای ئامادەنەبوونێكی درێژ هات، دوو دڵم لەڕادەربڕین، بەڵام بێ گومان ڕەوشەكە زۆر سەختە، كەس ناتوانێ لەچەند هەفتەیەك زیاتر سەیری داهاتوو بكات. داواكاری هەرە بەپەلەم ئەوەیە، كە ڕەوشەكە بەرزفت بكرێت و تا سێ چوار مانگی دیكە وابكرێت هیچ ناوچەیەك لەدەست نەدرێت و ئەو ڕێوشوێنانە بگرێتەبەر، كەوا لە میانڕەوەكان بكات بە ئاشكرا لەپاڵ ئێمەدا كاربكەن و لە خەریك بوون بە توندڕەوەكان لە كاری هاوبەشدا، دووریان بخەینەوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، پێویستە ماوەی گفتوگۆیان پێ بدەین و بۆیان بسەلمێنین كە نیازە دەستوورییەكانمان شتێكی حەقیقی و قەلب نییە. هیوا دەخوازرێت، كەئەمە گفتوگۆی یاسای هەڵبژاردن، ئامادەبكات، ئەگەر ئەمەش بەس نەبێ (كە پێ دەچێ مەیلێكی گشتی ڕەتكردنەوەی ئینتیداب هەبێت) لەو باوەڕەدام تاكە ڕێگا ئەوەیە، كە ڕێ بەشاندەكە بدرێت، سەردانی لەندەن بكات.

ئەگەر حكوومەتی خاوەن شكۆ زۆر حەزدەكات، خۆی لەم ڕێگایە لابدات، ئەوا ئەلتەرناتیفەكەی ئەوەیە كە پەیمان بە خەلكی وڵاتەكە بدرێت، كە لە پاییزی داهاتوو وەزیرێك لە وەزیرەكانی دەوڵەت، یان لیژنەیەك كە كار لەبری وەزیر بكات، سەردانی وڵاتەكە بكات و لە ڕەوشەكە بكۆڵێتەوە. توندڕەوەكان لەڕووی ژمارەوە ئێستا كەمن، بەڵام سەرجەم كەسی دواكەوتوو و تووڕەیان لەگەڵدایە، ئەگەر نەتوانرێت ئەو ڕەگەزانە لە سنووری خۆیدا بەشێوەیەكی كاتی، بەڕێوشوێنی ڕازیكردن، ڕانەوەستێنرێت، ئەوا مانگرتنی چالاك كە ناكرێت بەڕێوشوێنی سەركوتكردن، كپ بكرێن. ئێستا لەخودی بەغدا هەموو هەوڵێك بۆ ڕوونەدانی ئەمە، دەدرێت، بەڵام پێ دەچێت ئەم ڕێوشوێنانە لە سەرجەم لایەكی وڵات پێویست بێ. كۆتایی هات.

## چاوپێکەوتنی نهێنی

پێش ئەوەی ئەو بەشە کۆتایی پێ بێت، پێم باشە باسی هەوڵێکی خۆم بکەم، دوای ئەوەی سیر پرسی کۆکس بەغدای جێهێشت، راستەوخۆ پەیوەندیم بە هەندێ سەرۆکەوە کرد. بەرلەوەی فەرمان بەدەستگیرکردنی هەندێ کەس بکەم. پێویست بوو، ئەو دانوستانانە بەنهێنی بمێنێتەوە، چونکە زۆر کەم لەخەلك متمانەیان بە سەرۆکەکان هەبوو. ئەوان دەیانزانی ئەگەر یەکێك گومان بەبوونی پەیوەندی بەمنەوە، ببات، ئەوا بەخیانەتکار تۆمەتبار دەکرێت. لەلایەکی دیکەوە دەبینین کە ئەوان رەگەزی ئامادەن بۆ تێگەیشتن، کەسانی وەك (میانڕەوەکان) کە ناتوانن ئەمە بکەن و نایەوێت بە تەواوی خۆی لە سیاسەتی حکوومەتی بەریتانی بگلێنن کە بەرقەوە سەیری هەموو دانوستانێکی ئاشکرا لەگەڵ کەمینە شۆڕشگێڕەکان دەکات. کۆبوونەوەکە لە نیوە شەو لەسەر زەوییەکی بێ لایەن — لە ماڵی برادەرێکی هاوبەش کە ئەویش (عبدالقادر پاشا خەزیری[1]) بوو لەگەڵ نێردراوێکی عەرەب کە متمانەم پێ هەبوو، رۆیشتم. جگە لەو دوو کەسەی دیکە، کەس بەوشوێنەی من بۆی دەچووم و بەنیازەی پێم بوو، نەیدەزانی. سێ لەوانەی پەیوەندی توندیان بەسەرکردە نیشتیمانییەکانەوە هەبوو، ئامادەبوون، لەژێر رووناکی مانگە شەو لە گۆشەیەکی بانی ماڵەکە کەبەسەر رووباری دیجلە دەیڕوانی دانیشتین، دوو کوپ قاوەمان لەسەریەك لەبەر رووناکی مۆمدا فڕکرد.

دوای ئاڵوگۆڕی چەند قسەیەکی خۆش و قسەکردن لەبارەی سیاسەتی دەرەوە، چوینە سەر کاری ئەو شەوەمان. بەرامبەرەکەم بەگرنگییەکی زۆرەوە گوێی بۆ ئەو روونکردنەوانەمان شل کردبوو، کەسەبارەت بە فاکتەرەکانی دواکەوتن کە لە ماوەی دوو ساڵی دواییدا روویاندا و بێ توانایی حکوومەتی خاوەن شکۆ لەپێشبینی کردن بە بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بە ئینتیداب، هەروەها بێ توانایی لەدانانی پێشنیازەکان، تا ئەو کاتەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا مۆر دەکرێت. وەڵامیان، ئەوەبوو کە سەرجەم قسەکانی منیان بەڕاست وەرگرت، بەڵام ئەوەشیان بۆ زیادکرد کە

---

[1] - عبدالقادر خەزیری لەماڵێکدا کەبەسەر رووباری دیجلەی دەیڕوانی لەناوچەی باب شەرقی نیشتەجێ ببوو.

(کەلێنێکی گەورە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا هەیە). هەروەك بۆ هەموو جیهان ئاشکرایە کـە سیسـتەمی ئینتیـداب بریتییـە لـە بەیەکـەوە لکـانێکی ئارەزوومەندانـە. فەرەنسییەکانیش ئەو قسەیەیان کرد، ئەوان کاریان بەقسـەکەیان کـرد، بـەلاَم ئێمـە نکۆڵیمان لێکرد. بەلاَم کردەوەکانمان لە فەلەستین لەگەڵ ئەرکەکانمان بۆیەك نەهاتەوە، تا ئێستا بەڵگەیەکی پۆزەتیڤمان سەبارەت بەنیازەکانمان بـۆ پێکهێنـانی حکوومـەتی نیشتیمانی لە عێراق بەدەستەوە نەداوە، ئەو پڕۆژەیەی کە کورتم کردبـووەوە، کـەم و کـوڕی تێـدابوو، هـەروەها پەسـەندیش نـەبوو، رازی بـوون بەهـەر شـتێ جگـە لـە سەربەخۆیی تەواو، بۆ ئەوان بەکارەسات لەقەلەم دەدرا. چونکە ئەمە واتـا رازیبـوون بوو بە پڕۆژەیەکی هاوشێوە بە سەرپەرشتی فەرەنسییەکان لە سوریا، ئەوان بەئاستێك متمانە بە فەرەنسییەکان ناکەن لەو ئاستەی متمانە بە بەریتانییەکان تێ دەپەڕێنێ.

پێم راگەیاندن کە حکوومەتی خاوەن شکۆ ناچاردەبێت پارێزگاری لە ئاسـایش بکـات، یان لەکاتی پێویست ناچاردەبێت ئاسایش بەزەبری هێـزی سـەربازی بگەڕێنێتـەوە. تکـام لێکردن، کە مەزەندی ئەو خوێنڕێژییە بکەن کە بـەهۆی ئـەو سیاسـەتەوە دێتـە کایـەوە. وەلاَمیان ئەوەبوو، ئەمە نرخێکی کەمە بەرامبەر سەربەخۆیی دەیدەن، وەلاَمم دایـەوە کـە شۆڕش بەدیهێنانی ئامانجەکانیان بۆ دەساڵ دوادەخات، وەلاَمیـان دایـەوە کـە لـەجیهانی سیاسەتدا زانراوە ((سەربەستی نەتەوەکان، دەسەندرێت، نادرێت)). شۆڕش چ سـەرکەوتوو بێت یان نا، نەوەك هەر باشترین رێگا بۆ بەرەوپێشبردنی ئـازادی، بـەڵکو بـە تاکـە رێگـا دادەنرێت، ئینجا قسـەکانیان بـەم شـێوەیە کۆتـایی پـێ هێنـا: ((نەتـەوە ئەوروپییـەکان بەردەوام لە ژێر فشاردان، بەریتانیای مەزن لە کێشـەی ئەفغانسـتان[1]، کەوتـە ژێـر هێـز، لەمیسر لاوازبوو[2]، لە هیندستانیش کەوتە ژێـر هێـزەوە، لەکۆتاییـدا واز لـە ئێرلەنـداش دێنێ، نەتەوەی بەریتانی لە جەنگ بێزاربووە و ئامادە نییە هیچی دیکـە قوربـانی زیـاتر

١- ئەو کات لیژنەیەکی ئەفغانی هەبوو، کە مەحموود بەگ تریزی لە سـیملا سـەرۆکایەتی دەکـرد، ئەوەی لێی زانراوە ئەوەیە کە لە دانوستانەکان هەڵوێستی توندی دەنواند- نووسەر.

٢- سەعد زەغلول ئەوکات بۆ دانوستاندن لەگەل حکوومەتی بەریتانی تازە گەیشتبووە ئەو ولاتە. نووسەر

پێشکەش بکات. ئەو کاتەی ئینتیداب دەسەپێ و مەرجەکانی دێتەدیٚ، ئەو کـات هـەلی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە دەست دەدەین، لە سەربەخۆیی کەمتر بە هیچی دیکـە رازی نابین، هیچ شتێکی دیکە جگە لە سەربەخۆیی شایەنی ئەوە نییە، ببرێتەوە.

پێم راگەیاندن کە جگە لە ئینتیداب هیچی دیکە لە نێوان ئەوان و گەڕانەوەی تورکیا بۆ رەوشی پێشتر، لە ئارادا نییە. ئەم زمان لووسییەم ئامانجی خۆی پێکا، یەکێك لە سێ کەسەکە دوابەدوای قسەکەم گوتی! بەهەر حال تورکەکان موسوڵمانن، ئەوان بە گـوێرەی (میساقی نیشتیمانی) کە لە ئەیلولی ۱۹۱۹ دەرچووە، ئامادەن ئۆتۆنۆمی بـە عێـراق بدەن. دواتر باسم لە کەمینە کوردییەکان و رەگەزی شیعە کە لە فورات بەهێز بوون کرد. (هەرسێ کەسە دانوستکارەکەمان لە سوننە بوون)، وەڵامیان دایەوە کە ئەو دوو گرووپە (کورد + شیعە) جووتیاری نەزانن، بە ئاسانی دەتوانرێت لە شوێنی خۆیاندا بهێڵدرێنەوە: گرووپی یەکەم (کورد) بە هۆی نانەوەی حەسادەت لـە نێـوان سـەرکردەکانیان، گرووپـی دووەمیش (شیعە) بە هەمان شێوەی گرووپی یەکەم، سەرباری پەنا بردنەبـەر ئـەو زانـا ئایینییانەی کە لەگەڵ نیشتیمانپەروەراندا گونجاون. دوای دوو سەعات لە گفتوگۆی لـەم شـێوەیە، روون بـووەوە کـە ناکرێـت هـیچ رێککـەوتنێك یـان لێکتێگەیشـتنێك بەدەستبهێنرێت. لە کۆتاییدا دڵنیام کردنەوە کە ئێمە پێویستە هەر چییەکی لە دەستمان دێت بـۆ بەرقـەراکردنی ئاسـایش بیکـەین. وەڵامیـان دایـەوە، کـە سـەرجەم سـوپا و ژەنەڕاڵەکان لە ئێرانن و ناتوانن بۆ ئێرە بگەڕێنـەوە، پـۆلیس و (شـبانە) پشـتیان پـێ نابەسترێت (بەمەش سەلماندیان کە ئەوان زۆر هەڵەن) و ئەو کاتەی فەرمانی دەردەچـێت هێڵی ئاسن تا دەگاتە فورات پارچە پارچە دەبێت و گەیاندنی ئاویش دەپچرێت (پێشبینی یەکەم هاتەدی، بەڵام هی دووەم نەهاتەدی) بە شێوەیەکی فەرمی پەرتەمان لێکـرد. بـۆ بەیانی رۆژی دوایی راپۆرتی رۆژانەی پۆلیسم وەرگرت، لیستێکی بە نـاوی ئـەو کەسـە سیاسییانەی تێدا بوو، کە لە سپێدەوە بەغدایان جێهێشتووە، کە لە نێو لیستەکە نـاوی ئەو (۳) سێ برادەرەشمی تێدا بوو، کە شەوی رابردوو چاوم پێیان کەوتبوو. ئینجا دوای ٤ ساڵ ئەوانم لە بەغدا بینییەوە، ئەو کات پێویستی نەدەکرد کەسمان لە یەکدی بپرسین کە دوایین جار لە کوێ یەکتریمان بینیووە.

# بەشی سێیەم

## ڕەوشە سەربازییەکەی[1] ١٩٢٠

## دامەزراندنی ئیلمەر هۆڵدین

پێویستە مرۆڤ باسی بە دوایەکدا هاتنی ڕووداوەکان بکات، بەو شێوەیەی کە خۆی بۆ ئەوانەی لە سەر کورسی دەسەڵات چوارمەشکی دادەنیشن، پیشان بدات. ئەمەش بۆ ئەوەی لە پەرەسەندنی کێشەکە و بارەکە لە عێراق تێبگەین، ئەگەر هێزی چارەنووس بە ڕێکخراوەیی لە بەرەیەکدا بەرەو پێش بچێ، لە لایەکی دیکەوە، مێژوونووس بە ناچاری ڕووداوەکان بە دوای یەکدا تۆمار بکات لە بەرەیەکی دیکەدا، پەرەسەندنەکانی دیکەی، کە پەیوەندی بە بابەتی سەرەکییەوە نییە، بۆ چیرۆکێکی دیکە لێ بگەڕێت.

پێشتر ئاماژەم بەو توانا ڕێکخراوەیی و سوزدارییەی کە سێر جۆرج ماکمۆن[2] لە چارەسەری کێشە جۆراوجۆرەکانی عێراق پەنای بۆ دەبردن، کرد. ساڵی ١٩٢٠ بۆ وەرگرتنی پۆستی بەڕێوەبەری خەزێنە پێویستییەکان لە هیندستان دیاریکرا. مستەر چرچڵ، فەریق سێر ئەیلمەر هۆلدین ی بۆ سەرکردایەتی گشتی هەڵبژارد، کە ئەو کات یاوەری سێر ویلیلم لوکهارت بووە لە هەیئەی ئەرکان، کارێکی سەربازی بۆ پەیدا کرد دوای ساڵێك مانەوەی لە کارەکەی لە باشووری ئەفریقیا، بە دیل گیرا، بەبێ ئەوەی ئەو ئاگاداری ئەم دیل بوونەی بێت، دواتر لە بەندێتی ڕزگاری کرد[3].

---

١- ئەمە ناوەڕۆکی بەشی ١٢ی کتێبەکەی ویلسن، لە لاپەرە ٢٧٠ تا لاپەرە ٣٠٢.

٢- سەرکردەی گشتی لە عیراق کە دوای مارشال سەرکردایەتی وەرگرت.

3- Haldane. A.L-How we Escaped from Pretorio 1900-P.3l. Also churchill.w. my early life 1930.p17

بەر لە گەیشتنی ژەنەراڵ هۆڵدین لەماوەی هەفتەی سێیەمی مانگی ئازار، کە سەرەتای وەرزی گەرمییە، ژەنەراڵ ماکمۆن بەرەو هیندستان چووبوو، بەم شێوەیە ژەنەراڵ هۆڵدین لە ئەزموون و شارەزاییەکانی ئەو لە گۆڕەپانی کارکردن، سەبارەت بەو گرفتە سەختانەی کە ماکمۆن لەماوەی سێ ساڵی رابردوو زۆر ئاگاداریان بوو، مەحروم بوو. سیر ئەیلمەر هۆڵدین بەرلەوەی لەو پۆستە دابمەزرێ، بەنیو مووچە خانەنشین کرابوو، تەمەنی ٥٨ ساڵ بوو، بەمەش لە هەموو ئەو سەرکردانەی کەلە سەردەمی سیر پیرسێ لێك خزمەتیان لە عێراق کردبوو، بەتەمەنتر بوو، لەڕووی توانای جەستەی و لێهاتووییەوە، زۆر لەوە دوور بوو ئەو پۆستەی پێ بەڕێوەبچێ، هەروەها سەرجەم خزمەتە سەربازییەکەی لەگەڵ سەربازانی ئینگلیز بەسەر بردبوو، لە کاتێکدا ٩٪ی سەربازانی سوپای بەریتانی لە عێراق لە هیندییەکان بوون، رەوشە ئیدارییەکە ئاڵۆزبوو، باری سیاسی وردبوو، ئەم دوانەش پێویستیان بەشارەزایی و لێهاتوویی هەیە، کە سەرکردەی گشتی پێشوو بێ ئەم دوانە نەبوو.

بۆیە سێر ئەیلمەر لە تێگەیشتنی سروشتی ئەو ئەرکەی پێ سپێردرا بوو، هێواش بوو. ئەو لە لاپەرە (٥)ی کتێبی ((شۆڕشەکەی عێراق ١٩٢٠)) باسێك دەکات و دەڵێت: لەو کاتەدا (واتە لە میانەی سەردانەکەی بۆ شاری بەسرە) سەبارەت بەو ئامرازەی کە بەو هۆیە عێراقی پێ حوکم دەکەین، هیچ بیرۆکەم لا نەبوو. چونکە نەدەکرا زۆر زانیاری لە بارەی کۆبکەیتەوە. کۆتایی هات.

زانیارییە پێویستەکان، لە وەزارەتی هیند بەردەست بوون. بەڵام پێ دەچوو ژەنەراڵ هۆلدین پەرۆش نەبوو بۆ بەدەست خستنی زانیاری[١] لەبەرئەوەی هاتنی بۆ عێراق دواکەوت، دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخسا کە لە چەند فایلێك بکۆلینەوە. دوای چەند مانگێك لە هاتنی بۆ سەر زەوی (خاکی عێراق)، ئینجا زانی کە بەندەرێك لە

---

١- ئەو حەزنەکردنە بۆ زانین هەر تەنها لای هۆڵدین بە تەنها نەبوو، راوێژکاری سەربازی بەریتانی لە حکوومەتی عیراقی بەرێکەوت لە حوزێراندا زانی کە ناوچەی سلێمانی لە ئێران نییە و لە لایەن کارمەندانی ئینگلیزی بەڕێوەدەبرێت. نووسەر.

رووباردا لە باکووری بەسرە بونیادنراوە، کە دوو شۆستەی دەریایی قولیان بۆ کـردووە لەگەڵ هەشت کەشتی گەورە و چەند بارەگایەکی گواستنەوەی رووباری و ناوەخۆیی.

## رەوشی گشتیی سەربازی

رەوشە سەربازییەکە و ئەوەی پێوەی ئاڵا بوو، رەوشـێکی سـەخت بـوو. ژمـارەی هێزەکانی سەر بەسەرکردایەتییەکەی (١٣٣,٠٠٠) سەرباز دەبوون، کە لەم ژمارەیـان تەنها (٤٧,٠٠٠)یان شەڕکەر بوون، لە ژمـارەی دوایـیش (٤٢٠٠)یـان بـەریتانی و (٣٠,٠٠٠)یان سەربازی هیندی بوون، کە لە بەردەست بوون کار لە عێراق دا بکـەن، ئەوانی دیکە یان لە ئێران بوون یان نەخۆش بوون یان لـە بـاری گواسـتنەوەدا بـوون. (٤٧٠٠) سەرباز لەو هێزانە، سوودێکی وایان بۆ پارێزگاری ئاسایشی مەدەنی نەبوو، بەم شێوەیە تەنها (٢٩,٥٠٠) پیاوی لە بەردەست دا بوو، کە (٢٩٠٠)یان سوارچاکی هیندی و (٢٩٠٠)یان پیادەی بەریتانی و (٣٧,٧٠٠)یان پیادەی هیندی بوون. ئەوانە دەبوو پارێزگاری لە (١٤٠٠٠) دیلی جەنگی تورکی بکەن. بەشـی زۆری سـەربازگەی پاسەوانان لە لیوای پیادە بوون، چەندین جار داوا لە وەزارەتی جـەنگ کـرا کـە ئـەو دیلانە بگوازنەوە، بەڵام دانیان بەبێ توانییان نا و هەر چاوەڕوانی رێککەوتنی ئاشتی بوون لەگەڵ تورکیا. لـە کۆتاییـدا لـە رێگـەی هینـدەوە لـە ئـابی ١٩٢٠ رەوانـەی ئەسـتەمبۆل کـران، کـە دەکـرا سـالێك لەمەوبـەر ئـەو کـار بکرابایـە. جبەخانـە سەربازییەکان لە هەمەجۆرە چەك، بەرێژەیەکی زۆر لە چەك هێشتا لە ژێر پارێزگـاری سەربازیدا بوو. هەروەها ((لێژنەکانی سڕینەوە)) هەموو رێوشوێنێکی تایبەتی کۆگـا زیاد لە پێویستەکانی گرتەبەر کە لە دەستی لێهاتووی لێژنەی فرۆشتن دا بـوون، ئـەو لێژنەیەش سوپای مەلەکی دایمەزراندبوو. ئەو لێژنەیە لە ناردنی ئەو کـەل و پەلانـەی پێویست نین بۆ دەرەوەی وڵات زۆر سست بوو، دەبوو پاسەوانی ئەو کەڵەکەبوونـە بـە تێچوونێك بکرێت، کە خەریك بـوو هێنـدەی کـۆی بـەها راسـتەقینەیەکانی بکـات. ژەنەراڵ هۆڵدین سەرباری ئەمانە لەسەری پێویست بوو کـە لەبەرامبـەر ئـەو رەوشـە

سەختەی کە بە هۆی هاتنی (٥٥٠) ژنـی بـەریتانی هاتـە ئـاراوە، خـەبات بکـات.
هەروەها بۆ ژنە ئەفسەرەکان و پیاوانی بەریتانیش هەمان شت بکات، ئەمە سەرباری ٤٠٠ منـاڵی بچـووك، وەزارەتـی جـەنگ لـە مـاوەی کـانوونی دووەمـی ١٩٢٠ سەرپەرشتی ئەوانەی دەکرد، پێشتر لە هاوینی رابردووە لەلایەن وەزارەتـی جەنگـەوە ریوشوێنی نیشتەجێکردنیان لە ئێران لە ناوچەی چیا لـە نزیـك کرنـت، گیرابووەبـەر.
ژەنەراڵ هۆڵدین هەستی بەوە دەکرد کە کارەکە زۆر لە پاسـاوەکانی نەهێشـتنی ئـەو جیاوکانە (امتیازات) ئەولاتر چووە، کە بۆتە مایەی زۆر لە رێز و شایستە بوون. من بۆ ئەوکاتەی کە بڕیاری هاتنیان بۆ عێراق درا، لە سەر بیرۆکەی ئەو کات رازی بووم، کە چاوەروان نەدەکرا بە شێوە باوەکانی وڵات بگەنە ئەو ئاستەی مەترسی بخاتە سـەر بوونی ئەوانە. لە مانگی نیسان و ئایار ئەوانـە رەوانـەی کرنـت کـران و تـا ئـەیلول مانەوە، ئینجا لە رەوشێکی نالـەباردا بـۆ دەرەوەی وڵات سـەفەریان پێکـرا. درێـژی هێڵەکانی گواستنەوە لە عێراق لە سەرجەمدا نزیکەی دوو هـەزار میـل دەبـوو، کـە چاککردنەوەیان بۆ مەبەستی سەربازی کارێکی پێویست بـوو. نزیکـەی (٥٠) هـەزار ئاشوری و ئەرمەن لە خێوەتگاکانی بەعقوبە و شوێنانی دیکـە پەنابـەربوون، ئەوانـە دەیانتوانی خۆیان لە هەر هێرشێکی چاوەڕوان نەکراو بپارێزن، بەڵام تارادەیەك ببوونە بار بەسەر رەوشەکە. بەم شێوەیە لە یەکی حوزێراندا ژەنەراڵ هۆڵدین هێزێکی گەرۆکی پێکهاتوو لە (٥٠٠) بەریتانی و (١٥٠٠ تا ٣٠٠٠) سەربازی هیندی لە بەردەست دا بوو، لەم ژمارەیەش تەنها فەوجێك لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا دەیتوانی بگاتە ناوچـەی فوراتی ناوەڕاست. زۆربەی سەربازە بەریتانییەکان بەبێ لێ هەڵاوێردن نـوێ بـوون بـۆ رەوشی عێراق و هیچ ئەزموونێکی سەربازی پێشوویان نەبوو. هێڵی ئاسنی ئەو کـات نەیدەتوانی زیاتر لە چارەگێك بار لەوەی کە هێزەکان پێویستیان پێی بوو، بار بکات.
ئەمەش وایکرد سوپا پشت بە دوو هیلی گواستنەوەی لێـك جـوودا ببەسـتێ. هێڵـی دیجلە و هێڵی ئاسنین، دەبوو هەر دوو هێڵەکە پاسەوانی بکرێت، ئەمەش وایدەخواست کە نزیکەی (١٠) هەزار سـەربازی ناشـەڕکەر لـە دائـیرەی گواسـتنەوەی دەریـایی و

بەڕێوەبەرایەتی هێڵی ئاسن، دابنرێن، دوای ئەوەی دوو مانگ بە سەر مانەوەی ژەنەراڵ هۆڵدیندا بە سەر چوو، بەلشەفیکەکان (ئەنزلی[1])یان داگیر کرد. رەوشی سەربازی لە باکووری رۆژئاوای ئێران پڕ مەترسی بوو. لە ژێر رێنماییەکانی وەزارەتی جەنگ هۆڵدین ناچار بوو دوو فەوج لە سەربازانی بەریتانی لەوانەی کە بەشێك بوون لە حامیەی عێراق بۆ قەزوین بگوازێتەوە، ئەو دوو فەوجە لە دووری ١٠٠ میل لە سەرەتای هێڵی ئاسن لە قۆرەتو لە نزیك خانەقین بوون. هەریەکە لە سێر بیرسی کۆکس وەزیری خاوەن شکۆ لە تاران و سەرکردەی گشتی سوپا لە باکووری رۆژئاوای ئێران هانیاندا، کە تۆپهاوێژ و سەربازی زیاتری عێراق بۆ جێگیرکردنی بارودۆخەکە لەو ناوچانە، پەیدا بکات. وەك ئاشکرایە، وا باش بوو، بچێتە قەزوین و لە وێشەوە بۆ تاران بڕوات، بۆئەوەی بەچاوی خۆی کاروبارەکان ببینێ و رەوشەکە لەگەڵ بەرپرسان باس بکات و پێیان رایگەیەنێ، کە ئەو بە هۆی ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ مارشاڵی هێزی ئاسمانی (سێر جوفری سالموند) سەبارەت بەو پێشنیازانەی کە ئەو کات بۆ پارێزگاری عێراق لە رێگای هێزی ئاسمانی مەلەکی سەیردەکران، ناچار بوو سەردانەکەی دوا بخات.

سێر سالموند بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، گەیشتنی دواکەوت. چەند رۆژێك دواتر سوڵتان ئەحمەد، شای ئێران لە رێگەی عێراقەوە بۆ وڵاتەکەی دەگەڕایەوە، نەدەتوانرا ئۆتۆمبێلی پێویست بۆ گەشتیارانی مەلەکی و دەست و پێوەندەکانی دابین بکرێت، ئەگەر سوپا نەبوایە، باشیش نەبوو، لەبەر چەندین هۆکار سێر ئەیلمەر هۆڵدین بەر لە شای ئێران بەرەو قەزوین و تاران بچێت. لەبەر ئەمانە ناچار بوو، سەردانەکەی بۆ ئێران بۆ ٦ی حوزێران دوا بخات. تا ئەو بەروارەش هات، رەوشی سیاسی لە بەغدا گەیشتە رادەیەك، ئاماژەی بە بوونی مەترسی دەدا. فشارم خستە

---

١- واتە بەندەری ((پەهلەوی)) ئێستا. کە لە ((رشت)) نزیکە و کەوتووتە سەر دەریای قەزوین، کە مەڵبەندی بەخێوکردنی ماسی و لە قوتونانی کافیارە.

سەری بۆ ئەوەی جارێکی دیکە سەردانەکەی دوا بخات، هەر چەندە ئەو هەستی دەکرد کە بەسەرکردنەوەکەی بۆ ئێران، زۆر دواکەوتووە، پێویست دەکات بیخاتە پێش هەر دوخێکی دیکەوە، دیدێکی گەشبینی سەبارەت بە رەوشی عێراق، لەوەی کە من دەمتوانی هەمبێ، هەبوو. لەڕووی تەندروستییەوە پێویستی بە کەش گۆڕی هەبوو، ئەو کەش گۆڕینەش دەکرا لە دیمەنی بانەکانی ئێراندا بە دەست بێت. لەوەی لە نووسینەکەیدا هاتووە، روونی دەکاتەوە کە هیوا و ئاواتەکانی کاریگەری لە سەر بەلاریدا بردنی تواناکانی ئەو لە حوکمکردن و حساب بۆ کردن کردووە. ئەفسەرانی هەر دوو لقی ((جولانەوە)) و ((هەوالگری)) لەگەڵ گەشبینییەکەی ئەودا نەبوون، هەروەها سەرکردەی فیرقەکەی خۆشی لەگەڵیدا نەبووە، بەڵام ئەوەی ئەوان روونیان کردۆتەوە، لەمبارەیەوە، ئاوڕی لێنەدراوەتەوە.

## هێرشکردنە سەر تەلەعفەر و لاکانی موسڵ

لە ٢٦ی ئایار بۆ یەکەمجار راپۆرتی یەکلاکەرەوەمان لە بارەی بوونی هێزەکانی شەریف (هێزی حکوومەتی عەرەبی سوری) لە دەوروبەری خاپور، بەدەست گەیشت. ئەو هێزە بە سەرکردایەتی جەمیل بەگ مەدفەعی بوو، کە مەلیك فەیسەڵ دواتر پایەیەکی بەرزی پێ بەخشی. دواتر راپۆرتمان لە بارەی بوونی بزووتنەوەی عەشایەری لە(شەرگات) کە لەسەر رووباری دیجلەیە بەدەست گەیشت، هەروەها لە بارەی پێشڕەوی سوپای تورکی بەرەو زاخۆ، راپۆرتمان بەدەست گەیشت. موسڵ مەڵبەندی پیلانگێری ناکۆتا بوو، کە بە پلەی یەکەم فەرمانبەرە پێشووەکانی تورکیا ئەنجامیان دەدا، بەڵام نەمان دەزانی ئاخۆ ئەو پلانگێرییە لە خۆوە ئەنجام دەدرێت یان بەدەست تێکەڵاوکردن لەگەڵ تورکان؟!

کاپتن (جی. ئەی. بارلۆ) ئەفسەری سیاسی لە ناوچەکە، لە سەر باوەری خەڵکەکە، ئێمەی ئاگادار کردەوە، کە تەلەعفەر، ئەو ئامانجەیە کە جەمیل بەگ

مەدفەعی[1] مەبەستییەتی- دواتر حاکمی سیاسی لە موسڵ پاڵپشتی لە کاپتن بارلۆ کرد و داوای پاڵپشتی سەربازی کرد، منیش لە بارەگای گشتی پالپشتیم بۆ داواکە زیاد کرد. ئەو هێزەی ئەو سریەیەك دەبوو، بەس بوو، بۆ چارەسەری کێشەکە. هیچ رووی نەدا. ئەم رووداوە بە نموونەیەکی باش لە سەر دروستی دروشمەکەی ژەنەراڵ هۆڵدین لە کارکردندا جێبەجێ دەکات، دەڵێت: بە هێواشی پەلەبکە.

دوو ئۆتۆمبیلی زریپۆش لە موسڵەوە بە درەنگەوە بەرەو تەلەعفەر نێردران بەر لەوەی دوو ئۆتۆمبیلەکە بگەن لە چواری حوزیراندا، عەرەبەکان کاپتن ستیوارت و دوو یاریدەدەرکەیان (سارجنیت لاولر و سارجینت ۆکەر) یان دوای بەرگرییەکی مەردانە، بە نارنجۆکێك، بەر لە گەیشتنی شەریفییەکان کوشت. شەریفییەکان هەموویان لەو ئەفسەرانەی پێشووی تورکیا بوون، کە لەماوەی دوو ساڵی دواییدا لە خزمەتی حکومەتی دیمەشقدا کاریان دەکرد، ئەوانە لە خەزێنەی حکوومەتی خاوەن شکۆ لە چوارچێوەی ئەو بەخشینەی بە حکوومەتی دیمەشق دەدران، مووچەیان وەردەگرت. ئینجا راکردنی کاپتن بارلۆ[2]، کە شەوی پێشتر بەدیل گیرابوو، توانی خۆی رزگار بکات، بەڵام بە دوای کەوتن و لە دووری دوو میل لە رۆژئاوای شارۆچکەکە کوشتیان، بۆسە (کمین) بۆ دوو ئۆتۆمبیلە زریپۆشەکە دانرا بوو دەستی بە سەراگیران، سەرنشینەکانی کە دوو ئەفسەر و ١٤ سەرباز بوون بە ئازار کوژران.

---

١- ئەو پیاوە، دواتر پۆستی چەند وەزارەتێکی وەرگرت، هەروەها بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنەکانی (ئەعیان) و (نوێنەران) هەڵبژێردرا لە ١٩٢٠/٦/٢٥ بە سەرکردایەتی هێزێك گەیشتە ((فەدغەمی)) لە سەر زێی خاپور.

٢- کاپتن بارلۆ (یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە تەلەعفەر) هەستی بە بزووتنەوەی گوندی (قەبق) کردو، بە بێ ترس چوو رەوشەکە بەسەر بکاتەوە، لەوێ بەدیل گیرا، بەلاّم توانی رابکات، بەلاّم شۆڕشگێڕانی عەشیرەتی (کەرکەرییە)، توانییان دووبارە دەستگیری بکەنەوە، لە رێگادا دەورییەکی ئینگلیزیی بینی، خۆی دۆزییەوە و بۆ لای ئەوان رایکرد، ئەوانیش سێرەی تفەنگەکانیان ئاراستە کرد و کوشتیان.

ناکرێت جگە لەو ناوە (کوشتارگەی پاڵـەوانئامێز)، بەمـە بگـوترێ ڕووداو، لـەو کارەی هێزەکانی شەریف، کـە خـەڵکی ناوچـەکە بـۆ ئەنجامـدانی یارمـەتییان دان. بەشداربونی سەرەکی دواتر بە خاپور کردنی خانووەکانیان لەسـەر ئـەم خیانەتکارییـە سزادران. لە ٥ی حوزێران ڕەتلێکی سەربازی لە موسڵەوە بەرەو تەلەعفەر جـولا. لـە ٩ی حوزێران هێزەکە گەیشتە تەلەعفەر، کە ٣٥ میـل لـە موسـڵەوە دوورە. هێـزە بەریتانییەکە تا گەیشتە تەلەعفەر زۆربەی بەرووبومی دانەوێلەی سەر ڕێگـای خـۆی تێکدا، کە حامیەی موسڵ بۆ گوزەرانیان پشتیان پـێ دەبەسـت، خـەڵکی تەلەعفـەر هەمووی (تاوانبار و بێ تاوان) بۆ ناو بیابان ڕاوەدوونا، بەڵام نەیتوانی هیچ سـزایەکی بکوژە ڕاسیتەقینەکان بدات.

لە ١١ی ئابـدا، کـاتێ ڕەتلێکـی بچـووکی سـەربازی لـە موسـڵەوە دەردەچـوو، ڕووداوێکی دیکە ڕوویدا، ئەو ڕەتلە لە دووری ١١ میل لە شارەکە گرووپێکـی یـاخی عەشیرەتی شەمەڕی بینی (یاریـدەدەری حـاکمی سیاسـی، کـە سـریەیەکی سوارچـاك پاسەوانی دەکرد، بۆ ماوەی نزیکەی سێ میل چووە پێش، لـە کاتێکـدا تـەواوی ڕەتلـە سەربازییەکە وەستان، بۆ ئەوەی ببینی هێزیکی بەم قەبارەی نەبێتە هۆی سـەرنەکەوتنی دانوستاندنەکە) (هولڵدین لاپەڕە ٣٣-٢٣٢)[1]. لەوانەیە ئـەو هۆکـارەی کـە بـۆ پاسـاو هێنانەوەی ئەم ڕێبازە نامۆیە خراوەتە ڕوو، بـۆ تێگەیشـتن سـەخت بـێ. ئەمـە بەقـەد تێگەیشتنی خوێنەریش سەختە کە لـە هۆکـاری پاشەکشـەی ڕەتلەکـە (سـێ سـریە و تۆپهاوێژیك) و گیان لە دەست دانی ئەفسەرێکی بەریتانی، کە ژەنەڕاڵ هۆڵـدین هیچـی لە بارەیەوە باس نەکرد، تێ بگات، لە بەرامبەر هۆزێـك کـە بـە نزیکـەی ٧٠ ڕەشمـاڵ مەزەندە دەکرێ.

ئەو تاکتیکە پێشتر ڕەمەزان شەللاش لە دێرەزورەوە بە سەرکەوتوویی جێبـەجێی کردبوو، چاوەڕوانیم دەکرد ئەو تەکتیکە دووبارە بکرێتەوە. لەسەر داواکەی تەلەعفەر سوور بووم، بە دانانی حامیەیەکی بچووك کە پاڵپشتی هێزەکەی ئەوێ بکـات، بـەڵام

1- The Insurrection in Mesopotamia.1920.

نه ژەنەڕاڵ هۆڵدین و نە ئەوەی پێش ئەو لەسەر داواکەم رازی نەبوون. لەو باوەڕەدا بوون کە دەرهاوێشتە سیاسییەکان بە درێژی و پانی ولات، سیاسەتێکی دروست نەبوو، پێیان باش بوو پارێزگاری لەو هێزانە بە شێوەی رەتلە ئۆتۆمبێل بکەن. بەم شێوەیە ئێمە کەوتینە بەردەم کارەساتێکی وا، کە نە حاکمە سیاسییەکان و نە ئەفسەرانی مەڵبەندە دوورەکان، دەیانتوانی لێی دەرباز بن.

ژەنەڕاڵ هۆڵدین لە کتێبەکەیدا بەدەست بڵاوی بەشان و شکۆ و ئازایەتی ئەوانەی هەڵدا، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێکیان هەڵاوێرێ. فشار لەسەر ئەوان زۆر توند بوو، دەبوو خۆیان بەرگەی ئەو فشارە بگرن، بە هەمان شێوەی رووبەڕووبوونەوەی ژیان رووبەڕووی مردن بوونەوە ولاتەکەیان بەدەستەوە گرتبوو، شێوازی مردنیان تیشك و شکۆی زیاتری بەو ناودەنگەی ولاتەکەیان دا، لە شوێنە زۆر دوور لەیەکەکان، نەوەك لە پێناو ولاتەکەیان بە تەنها، بەڵکو لە پێناو نموونەی بالای دادپەروەری، کە رۆژێك دێت، جیهان لەوە تێدەگات کە ئەمەی دوایی بە سەر نموونەی نیشتیمانی دەکەوێت، ئەو سەربازانە پارێزگارییان لە ناوی باشی ئینگلیز لە نێوان نەتەوە وەحشییەکان کردووە.

## گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرکردەی گشتی

لە ٢٩ی حوزێراندا، سێر ئەیلمەر هۆڵدین لە ئێران بە هۆی تکاکانی من گەڕایەوە، بە توندی داوای یارمەتیم لێکرد، ئەو کاتیش ئەو مەیلی ئەوەی هەبوو، کە ئەم کارە بکات. ئەمەش نووسراوەکەی خۆیەتی:

..... لەبەرئەوەی ئەو کاتەی هیچ هۆکارێکم بۆ ترس، نەبوو، چونکە من نەمدەزانی دەزگا حکومییەکەمان بە ئەنقەست کار بۆ ئەو کۆتاییە دەکات، لە بەرئەوەی باوەڕم وا بوو کە ((پەرستگای یانوس))ی لەندەنی، تا شتەکە بە تەواوی ئەنجام نەدرێت، دەرگای نابێتەوە.

له پارێزگاریکردن له هەلوێستی نزیك له گەشبینی بـەردەوام بـووم، سـەرباری ئەمەش، هەروەك پێشتر روونم کردەوە، زۆر متمانەم بەو راپۆرتانەی کە گەورە و زۆر بێ خەوش بوون، نەبوو. ئێمە گەرچی هێڵی ئاسـنی فـوراتیش لـە دەسـت بـدەین، دەتوانین بیگەڕێنینەوە، لە کاتێکدا رووباری دیجلە کە ناکرێت یاری لەگەڵدا بکرێت، هەر بە هێڵی گواستنەوە دەمێنێتەوە. لە راستیدا ئەگەر هۆزەکان تا ئـەو ئاسـتە گێل بن و هێڵی ئاسن بچرێنن، ئـەوا تونـدڕەوەکان کـە تارادەیـەکی زۆر بەرپرسـی پەشێوییەکانن لە پاڵ دانیشتوانی ناوچەکە لە پێشەوەی زیان لێکەوتوانی ئەو کـارە دەبـن، چـونکە ئێمـە بـۆ گـوزەرانی سـەربازەکانمان پێویسـتیمان بـە سـەرجەم کەشتییەکانی رووباری دیجلە دەبێت. لەم بارەشدا توندڕەوەکان هۆکارێکی بـەهێزی فشار خستنە سەر هۆزەکانیان بەدەستەوە دەبێت، بەمەرجێ ئـەو گەردەلولـەی کـە بەنیاز بوون هەڵی بکـەن لـە دەسـت دەرنەچـووبێ. بانگەشـە شـاراوەکان ئـەوەیان بەدەردەخست، کە کەشتیوانی لە ئاوی دیجلە تاڕادەیەك کوسپ لە بەردەم سـەرکردە نیشتیمانییەکان دادەنێت یان خەڵکی سڤیل هەراسـان دەکـات، ئەمـەش کـارێکی تەواو هەڵەیە، لە بەغـدا بڕێکـی تـەواو لـە بەرهەمـە هاوردەکـان هـەبوو، هـیچ ئەگەرێکی واش لە ئارادا نەبوو کـە نیشـتیمانپەروەرەکان و هۆزەکـان کـارێکی وا بکەن کە سەرئێشە بۆ دانیشتوان دروست بکەن. جگە لەمە، شتێکی ئاسایی بـوو، کە ئەو راڤانەی کـە سـێر ئەیلمـەر هۆڵـدین لـە پـەراوێز راپۆرتـە رۆژانەییـەکانی دەینووسی، لە راڤەی من و سەرکردەی فیرقەکەی و ئـەو گـەورە ئەفسـەرانەی کـە لەگەڵیدا کاریان دەکرد، جیا بێت. من سەرجەم پەیوەندییە تەلەفۆنییە گرنگـەکانی نێوان بەغدا و وەزارەتی هیندیم بە چاپکراوی خستە بەردەستی، ئەو پەیوەندییانەی کە لە ماوەی سێ ساڵی رابردوو ئـەنجام دراون، لەگـەڵ هـەموو راپۆرتـە ئیـداری و رێنماییە رەچاوکراوەکان، ئەوانەی بە حاکمە سیاسی و سەربازییەکان راگەیـەنراون، ئەمەش لەوانەیە کاریگەری بە سەر رەوشی سیاسی و سەربازییەوە بـە شـێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەبێت. ئەو پیاوە سوودی لـە شـارەزایی عەمـەلی ئەوانـەی بـەرخۆی

وەرنەدەگرت، توانای کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری حاکمە سیاسییەکانی شوێنە دوورەکانی نەبوو، ئەگەر کۆششی بکردابوونایە لە چەند دەقیقەیەك زیاتر لەگەڵیان کۆنەدەبووەوە، ئەوەی لە نووسینەکەیدا هاتووە، ئەوە دەردەخات کە ئەو (زۆربەی جاران بە سەرەتایی و کەم شارەزایی سەیری ئەو حاکمانەی دەکرد). سەرباری ئەوەش من پێشتر پشتم بە هەموو ئەوانە، بە بێ لێهەڵاوێردن، دەبەست. ئەوانە پیاوانێك بوون لە شوێنەکانی خۆیان خودان شارەزاییەکی زۆر بوون. لە راستیدا ئەوانە شارەزا بوون، ئەوانە هەموویان یان دووبارە بۆ بەردەوامی لە خزمەتی عێراق وەك راوێژکاری حکوومەتی تازەی عێراق هەڵبژێردران یان ئەوەتا بۆ ئەو بەرژەوەندییانەی کە پێشتر لێیان خواسترا بوون، گەڕانەوە، بۆ ئەوەی پایەی گرنگ کە بەرپرسیارییەتی گەورەی تێدا بێت, وەربگرن.

## ئاگاداربوونەوەی پەشێوییەکان

لە ماوەی هەفتەی سێیەمی مانگی حوزێراندا، زنجیرەیەك رەشبگیری لە کەربەلا و حیللە، ئەنجام دران، میرزا موحەممەد رەزا کوڕی موجتەهیدی گەورەی کەربەلا لە نێوان دەستگیرکراوەکاندا بوو. راپۆرتە بەدەست گەیشتووەکانی هەمەجۆر سەنتەر، ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە سەرۆکە بەرپرسەکان پێشبینی بەرزبوونەوەی پەشێوی و نیگەرانی لە نێوان عەشایەرەکان کردبوو، خۆشیان بۆی ئامادە کردبوو، ئەمە بەرلەوەی ئەو پرۆسەی دەستگیرکردنە ئەنجام بدرێت. باج دان دەستی پێکردبووەوە و کۆی پارە وەرگیراوەکان تا کۆتایی مانگی حوزێران یەکسان بوو بە کۆی پارەکانی هەمان ماوەی ساڵی ١٩١٩، کۆکردنەوەی پارەکانیش بە زەبری هێز نەبوو، هەروەها هیچ فشارێکی ئاساییش بۆ ئەم مەبەستە پیادە نەکرا. حاکمە سیاسییەکان هەموو ئامرازێکی ئیغراکردنیان لە بەردەست بوو، بۆ ئەوەی هەرچی بیانەوێت بیکەن تاکو رێگە لە روودانی هەر کارێك بگرن، کە جێگەی مەترسی بێت. هۆزەکانی ناوچەی مەنتفەك، کە سوپا نەدەگەیشتە شوێنەکەیان،

نیگەران بوون، بەڵام برترام تۆماس[1] کە بـۆ ئـەوێ نـاردرابوو، تـاکو دووەم سـوڕانەوە لـە چوارچێوەی ئەو ئەرکەی خرابووە سەرشانی ئەنجام بدات.

ئەو سەردەمە بە سوڕانەوەکەی گەشبینبوو[2]. ئەو گەشبینییەش هۆکاری خۆی بـۆ پاساودان هەبوو، (خیون ئەلعەبید)[3]ی شێخی گەورەی ناوچەکە، ورەی بەرز بوو، بەڵام بەڵێنی دا ئاشتی ناوچەکە بپارێزێ، ئەم ئەرکەشی لـە بـارودۆخێکی سـەختدا ئـەنجام دا، هەموو شتێك لە ناوچەکانی دیکە هێمن بوو، هەرچی کوردسـتانیش بـوو، هـیچ وشەیەك لە بارەی بوونی نیگەرانی لەوێ بە دەست نەگەیشت، کاروانـە گـەورەکان تـا کۆتایی مانگی حوزێران لـە نێـوان سـلێمانی و بانـە و سـەقز بـە سـنووری ئێرانـدا هاموشۆیان دەکرد، هەروەها لە هەولێریشەوە لە ڕێگەی ڕەواندوز و ڕایاتـەوە بـۆ نـاو ئێران دەچوو، تا ئەو کاتەش هیوامان وا بوو کـە لـە گەردەلولەکـە ڕزگارمـان بێـت، بەڵام هێشتا ڕەوتێکی شۆڕشگێڕی بە هێز، بە نهێنی لە بەغدا کـاری دەکـرد. بەغـدا مەڵبەندی ڕق و نارەزایی ڕێکخەرانی بوو، لەوەتەی هەفتەی دوایی مانگی ئایار هێرش بۆ سەر ئەفسەران و پیاوانی تەنیا دووبارە دەبووەوە. ترسێکی لەناکاو چەندین جار بە سەر بازاڕەکاندا هات و خاوەن دوکانەکان، دوکانەکانی خۆیـان داخسـت، دڵـەڕاوکێی

---

١- هەمان ئەو برترام تۆماسەیەکە دواتـر لـە عـەدەن دامـەزرا، برتـرام دوای ئـەوەی بـە ناوچـەی مەنتفەك سەرقاڵ بوو، بۆ حیللە وەك یاریدەدەری حاکمی سیاسـی (دیلسـۆن) گوازرایـەوە، تۆمـاس برترام لەو گرووپە بوو کە دژی دانانی فەیسەڵ بوون بە مەلیکی عیراق، سەرباری ئەمـەش ئینگلیـز تا ساڵی ١٩٢٤ وەك پشکنەری ئیداری هێشتیەوە.

٢- بۆ کتێبی نووسەر پەراوێزی Alarms and Excursions in Arabia بگەڕێوە.

٣- شێخانی عەشیرەتی عەبودە لە (شەترە) نیشتەجێ ببوون، لایەنگری دەسەڵاتی بـەریتانی بـوون، تێبینی دەکرێت کە سەرباری لاگیرییان بۆ ئینگلیز، بـەڵام ڕۆڵێکـی دووفاقییـان دەگێـڕا، ئامـادەی کۆبوونەوەی (المصیفی) لەگەڵ سەرجەم سەرۆکەکانی دیکە بوون و پەیماننامەیان لەگەڵ مـۆر کـردن، دواتر داوای لێبوردنیان کرد و بەشداری شۆڕشیان نەکرد و ڕۆلی میانگیرییان لە نێوان شۆڕشگێڕان و ئینگلیز دەگێڕا.

گشتی زیادی کرد. سازکردنی ئاهەنگی سیاسی لە مزگەوتەکان شەوانە بووە کـارێکی ئاسایی، بەڵام جولانی سوپا بەرەو چیاکانی ئێران هێشتا بەردەوام بوو. سـێر ئەیلمـەر هۆڵدین و یەکی لە ئەفسەرە روکنە پێشکەوتووەکانی سـڵیان لـە جـاڕدانی ڕاکانیـان نەکردەوە، سەبارەت بەوەی کە من زیاد لە پێویست لە بارەی رەوشەکە رەشبین بـووم، ئەم دوانە بەخواست و بڕوای خۆیان لە ٢٤ ی حوزێراندا چوونە بارەگـای شـاخاوی لـە ((کرنت)) کە زۆربەی زۆری ئەفسەرانی روکنی بارەگای گشتی پێشتر لەوێ بوون.

پێشتر من زۆر بە توندی دژایەتی دامەزراندنی ئەو بارەگا شـاخاوییەم کـرد، کـە ئـەو سـوودە سـەربازییە، یـان ئـەو خۆشـییە تەندروسـتییەی، ئەوەنـدەی خراپییـە سیاسـییە روونەکانی لێی دەکەوێتەوە، بەدەست ناخات. تکام لە وەزیری هینـد کـرد، کـە وەزارەتـی جەنگ بۆ رەتکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە رازی بکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم. خەرجییەکانی زۆر گەورە بوون، دەستکەوتە تەندروستییەکانی شتێکی بەرچاو بـوون، چـونکە هەرچـەندە پلەی گەرمی لە مانگەکانی هاوینی عێراق بەرزە، بەڵام رێژەی نەخوشـییەکانی ئێـران لـە ماوەی وەرزە گەرمەکاندا لەوەی عێراق بەرزترە. هەروەها ئەمە بە بەراورد لەگـەڵ رێـژەی خەواندنی سەربازەکان لە نەخۆشخانەکانی عێراق لە ماوەی سـاڵی ١٩١٩ زۆر باشـترە لـە رێژەی خەواندن لە تەواوی هیند. ژەنـەڕاڵ هۆڵـدین (هـەر قسـەکانی خـۆی دەگوازینـەوە) نەیشاردەوە کە (رقی لە بیرۆکەی مانەوەیە لە بەغدا، بەتایبەتی لـە کەشـێکی گـەرم کـە ئاسان نییە بۆ ماوەی سەعاتێك یان دوو سەعات دوای نیوەڕوو لـە دەرەوە بمێنێتـەوە، بـۆ ئەنجامدانی وەرزشی تەواو بۆ پارێزگاریکردن لە تەندروستی).

باری تەندروستی وەك پێشتر روونم کردەوە، باش نەبوو، هەر چەندە من لە دڵـەوە هاوسۆز بووم لەگەڵی، بەڵام هەستم بەوە دەکرد، کە ئەو هۆکارانە پاسـاوی رۆیشـتنی ئەو نین. من تەواو لە بارەی مەزەندە کردنـی روودانـی نیگـەرانی و پەشـێوی لەگـەل ئەودا ناکۆك بووم، هەرچەندە هەمان ماوەش لە بەردەسـتی ئـەودا بـوو، بـۆ ئـەوەی هەمان رای منی هەبێت. شاراوە نییە، کە هۆکـاری کەسـی، شـتێکی گـرنگ بـوو، جیاوازییەکانی میزاج و ئاراستە و تەمەن، وا بە ئاسـانی ناتوانرێـت بـە سـەریدا زاڵ

بێت. من کاتێ بە چاویلکەی ئێستا سەیری پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی ئەو رۆژانە دەکەم، زۆر شتی باشتر لەوەی گوتراوە، دەتوانرێت بگوترێت، زۆر شتی باش کە دەبوایە باسکرابایە، وەلانراوە. سێر ئەیلمەر هۆڵدین لە کتێبەکەیدا رەخنەی توندی لە زۆر لایەنی هەمەجۆر لەو سیاسەتەی کە ئیدارەی مەدەنی لە ماوەی جەنگ و دوای جەنگ کە گرتیەبەر، گرتووە. لە بۆنەیەکی دیکەدا گفتوگۆی ئەو رەخنانە دەکەم، لەو باوەڕەشم کە خوێنەر وا تێدەگات کە من ئەو کارە بە بێ رق و کینە دەکەم، لەگەڵ رێزی دادپەروەریم بۆ سەختییەکانی سەرکردەی سەربازی ئەو رۆژگارە.

## تەقینەوەی شۆڕشەکە لە رومێسە

دوای گەڕانەوەی ژەنەڕاڵ هۆڵدین بە هەفتەیەك، لە شاری رومێسە تەقینەوەیەکی نوێ روویدا. رومێسە شارۆچکەیەکی بچووکە لە ناوچەی دیوانییە. هۆکاری راستەوخۆی تەقینەوەکە زۆر پڕوپوچ بوو، یاریدەدەری حاکمی سیاسی کاپتن (پی تی هیات) داوای لە (شێخ فەریق)[1] لە عەشیرەتی (الظوالم)ی سەر بە (بەنی حضیم) کرد، ئامادە بێت، چونکە لە گەڕاندنەوەی پێشینەی کشتوکالی کە بە ١٠٠ پاوەند مەزەندە دەکرا، کەمتەرخەمی کردووە، کاپتن هیات سوور بوو لە سەر ئەوەی کە دەبێت شێخ ئەو پارەیە بدات. شێخ ئەوەندە نەگریس و سەرکێش بوو، کاپتن هیات چاری نەما بە پاسەوانییەوە لە ئێوارەی ئەو شەوەدا بۆ دیوانییەی گواستەوە. لە دوای نیوەرۆی هەمان رۆژدا، دواکەوتوانی شێخ هاتنە ناو سەرایی و شێخیان ئازاد کرد و هەمان رووداوی سەماوەیان دووبارە کردەوە[2].

هۆزەکانی دەوروبەر لە باکوور، زۆر هەوڵیاندا تاکو (ظوالم) نەیەتە ناو گوندەکانیان، بەڵام ئەوان (ظوالم) لە لایەن ناوچەی شامیە (نەجەف و کوفە) فەرمانی توندیان پێدرا بوو،

---

١- ئەویش شێخ شەعلان ئەبوجۆن بوو.

٢- بۆ وردەکاری ئەم رووداوە بۆ راپۆرتی مس بیل (بەرووخستنی ئیدارەی مەدەنی) بگەڕێوە (نووسەر). نووسەری ئەم پەرتووکە لە ژێر ناوی (فصول من تاریخ العراق القریب) بلاویکردۆتەوە. (وەرگێڕ)

کە رووبەڕووی حکوومەت بوەستنەوە. ئەوەی لە سەر ئەم کارەش هانیدان بیستنی قسەی دڵنیاکەرەوە بوو سەبارەت بەوەی کە بەریتانیا مەزن بە گوێرەی مەرجەکانی ئینتیداب نابێت هێزی سەربازی بەکاربهێنێت. سەرجەم هێزە بەردەستەکانمان یان بۆ ئێران یان بۆ هیند پاشەکشەیان کردبوو. ئەم هەواڵە زەوییەکی بە پیتی بۆ رەخسا. هێڵی ئاسن لە سێ شوێن پچڕا، سەماوە و رومێسە لە باقی شوێنەکانی دیکە دابڕان. ٥٦٠ سەرباز لە کەتیبەی (مەهرەتا) لە سەماوەوە لە رۆژی یەکەمی مانگی تەموز گەیشتنە رومێسە، دوو هێندەی ئەمەش بۆ رۆژی دووەم بۆ دیوانیە گەیشتن. دواتر سریەیەك لە کەتیبەی (٩٩) بە سەرکردایەتی کاپتن (براگ) کە سەرکردایەتی حامیەی دەکرد گەیشتنە شارۆچکەکە، سریەکە لە چوار ئەفسەر و (٣٠٠) سەربازی هیندی و نزیکەی (٢٠٠) هیندی نا شەڕکەر کە زۆربەیان سەر بە هێڵی ئاسن پێکهاتبوو.

لە چواری تەموزدا سەماوە گەمارۆدرا، عەشایەرە عەرەبەکان لەم تەکتیکەدا چالیان هەڵکەن، ئەمەش هیچ گومانێکی نەهێشتەوە کە ئەو عەشایەرانە لە لایەن ئەفسەرە تورکەکانەوە رێنوێنی دەکرێن. لە ٢٠ی تەموزدا رەتلێکی بە هێز لە بەغداوە بە سەرکردایەتی ئەمیر (کۆنینگهام) توانی لە کاتی گونجاودا گەمارۆکە بشکێنێ، چونکە هێزەکانی حامیە خەریك بوو لە ناو دەچوو.

ژەنەڕاڵ (کۆنینگهام) نەگەیشت، سیر ئەیلمەر هۆڵدین بە گەرمی سەبارەت بە سەرکردایەتی کردنەکەی بۆ رومێسە بەبێ رووبەڕووبوونەوەیەکی توند، ستایشی کرد. رەتلەکەی لە فەوجی (سیك)ی ٤٥ بە سەرکردایەتی عەقید (ماك ڤین) و فەوجی (ئەلگۆرکا) ١٠/١ بە سەرکردایەتی عەقید (ئێچ ئێل سکۆت) پێکهاتبوو. ئەو زیانانەی کە بەر هێزەکە کەوت بریتی بوو لە (٣٥) کوژراو و (١٥٠) بریندار کە پێنجیان ئەفسەری بەریتانی بوون. حامیەی رومێسەش نزیکەی سێیەکی ژمارەکەی لە دەستدا، سێر ئەیلمەر هۆڵدین باس لەوە دەکات کە مستەر (ئەی دەبلیو ئێچ هارپەر) کە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی هێڵی ئاسن بوو لە میانەی گەمارۆکەدا پاڵەوانێتییەکی تایبەتی نواندووە.

لەوانەبوو، گەمارۆکە دەرەنجامی مەترسیدار و ناخۆشی لێبکەوتابایە، ئەگەر سەرکەوتنی هێزی ئاسمانی پاشایەتی نەبوایە، لە خستنە خوارەوەی جبەخانە و خواردن بە سەر حامیەکەدا. هەروەها لە بۆردوومانی ئەو عەرەبانەی کە شوێنەکەیان گەمارۆدابوو. هەروەك ژەنەراڵ هۆڵدین دەڵێت، یاریدەدەری حاکمی سیاسی مولازم (تی. پی. هیات) لە ماوەی گەمارۆکەدا هەولێکی زۆری بە (ئازایەتی و عاقلانە) داوە. لە یازدەی مانگدا سەرجەم هێزەکە بۆ دیوانییە کشانەوە، لە ٢٥ی تەموز دوای زنجیرەیەك پێکدادان لەگەڵ عەرەبەکان گەیشتنە دیوانییە. لە کاتێکدا ئەو رووداوانە بە خێرایی روویان دەدا، چەند خالێکی دوورە دەست هێرشیان کرایە سەر، کاپتن (بریستلی ئەیفانز) لەگەڵ ژمارەیەك سەربازی عەرەب لە (خان جەدوەل) گۆشەگیر کران، لە جەرگەی شەڕدا کوژرا. ئەمەش دوای ئەوەی کاپتن (ویات هیوز) کە سەر بە دائیرەی ئەشغالی سەربازی بوو، نەبەردانە بەرخۆدانی کرد.

## شەڕگەی رارنجیە

ژەنەراڵ هۆڵدین[1]، ئەو رەوشەی لە وڵات لە ئارادایە بە پارچە پێستەیەکی چواندووەکە لاکانی لەو دامێنانەوە بەرزدەبنەوە کە گرانیان لە سەر لادەبرێت. بەرێخستنی سوپا لە حیللە بۆ دیوانییە وایکرد شۆڕش لە ناوچەی حیللە رووبدات.

گرووپێك لە عەشیرەتی (بەنی حەسەن)[2] شارۆچکەی (ئەلکەفل)یان لە ٢٠ی تەموزدا داگیرکرد. بڕیارێکی دروست سەبارەت بە دەرخستنی هێز لەو بەرەیە درا و

---

١- لە نامەکەی بە مێژووی ١٩٢٠/١١/٨ کە بۆ رۆژنامەی لەندەن کازیت ی ناردووە، لە ژمارە ٣٢٣٧٩ بلاۆکراوەتەوە. نووسەر

٢- سەرچاوە عەرەبییەکان روونی دەکەنەوە کە عەشایەرە شامیەکان بە سەرکردایەتی حاج عبدالواحد سکر و السید علوان الیاسری کەفلیان داگیر کرد، لە هەمان کاتدا عەشایەری (بەنی

ڕەتلێکی سەربازی کە لە (٣) سریە پێکهاتبوو بۆ ئەوێ بەرێ خرا، ئەوانیش کەتیبەی (مانشستری سێیەم) و سریەیەك لە کەتیبەی (سیخ رواد ٣٢/١) و دوو سریەی سوارچاك لە کەتیبەی (پالێشتی ٣٥)، سەرباری سریەیەکی تۆپهاوێژ.

پلەی گەرما زۆر بەرز بوو، ڕێکخستنی ئیدارەی ڕەتلەکە کارێکی سەخت بوو، ڕێوشوێنی ئامادەکردنی بڕی پێویست لە ئاو بۆ سەربازەکان نەگیرابووەبەر.

ڕەتلەکە شەوی یەکەمی لە دووری شەش میل لە باشووری حیللە بە سەربرد. ژەنەڕاڵ (لیزلی) کە لە دیوانییە بە چالاکی فریاکەوتنی رومێسە خەریك بوو، ئاگاداری ڕەتلەکەی کردبووە کە لەو خاڵەی بۆیان دیاریکراوە زیاتر نەچنە پێش. بەڵام ڕەتلەکە (٩) میلی دیکە لە ڕۆژی دیکە ڕۆیشتن و گەیشتنە خاڵێك[1] کە (٥) میل لە (کەفل) و (١٥) میل لە حیللە دوور بوون، لە شوێنێکی قایم مۆڵگەیان کرد، تا سەعات (٩)ی بەیانی جولەیان نەکرد. کاتێ سەرایای (مانتشستر) گەیشتە سەربازگەکە پێش سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ، ئەو سەرایە زۆر هیلاك ببوو. دوای نیوەڕۆ هێرش کرایە سەر سەربازگەکە، بە هۆی دابەشکردنی هەڵە و ئیدارەیەکی پەشێوەوە دوژمن توانی پێش ڕۆژئاوا بوون بگاتە نزیکترین سەربازگە. لەوکاتەدا سەرکردەکە، بڕیاری دا بۆ حیللە پاشەکشە بکەن، چونکە پێشتر فەرمانی ئەوەی پیکرا بوو، لە کاتی پێویست ئەو کارە بکات، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هێزێك نەبێتەوە کە لە ژمارەوە لە خۆی زیاترە، بەڵام هێزەکەی لە بارێکی وادا بوو، نەیدەتوانی پاشەکشە بکات. سەربازە هیندییەکان هەرچی لە دەستیان هات بۆ رزگار کردنی هاورێ بەریتانییەکانیان کردیان. تۆپهاوێژەکانیش پارێزگارییان لە ڕێوڕەسمە باوەکانیان کرد، پاشەکشەکە بۆ دۆڕان، گۆڕا[2]. هەندێ لە سەربازانی کەتیبەی (مانتشستر)

---

حەسەن) بە سەرکردایەتی (الحاج سعدون) کوفەی گەمارۆدا و حامیەکەی سەرقال دەکرد، کەفل لە ٢٢ی تەموز نەوەك ٢٠ داگیر کرا.

١- واتە (رارنجیە) کە کوتۆتە (ڕۆستەمیە) لە سەر ڕێگای حیللە — کوفە.

٢- ئەو عەشایەرانەی کە لە (رارنجیە) شەڕی ئینگلیزیان کرد و سەرکەوتن ئەمانە بوون (ئال فتلە، العوابد، الحمیدات، ئەلبوعارصنی لە بەنو حەسەن).

لە شەودا ڕێگایان ون کرد، بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر جگە لە نیوەی ژمارەکەیان ئەوانی دیکـە بۆ حیللە نەگەڕانەوە. ئەم پاشەکشەیە (١٨٠) کوژراو و (٦٠) بریـنـدار و نزیکـەی (١٦٠) دیلی زیان لێداین، ئەمە سـەرباری زیـان کـەوتن بـە هۆکارەکـانی گواسـتنەوە. دیلـەکان مامەڵەیەکی خراپیان لەگەڵدا نەدەکرا، لە کۆی (٧٩) دیلی بەریتانی تەنها یەك دیل نـەبێ بەدەستی عەرەبەکان نەمردن. سێر ئەیلمەر هۆڵدین نووسیویەتی و دەڵێـت: ((ئـەو ڕووداوە ناخۆشە لە ناسکترین کات و نەگونجاوترین کاتدا ڕوویدا، هەر لە سەرەتاوە بردنی هێزێکـی بچووکی وا چاوەڕوان دەکرا هیچ سـوودێکی ئـەوتۆی نـەبێت[1])) لـە ڕەتلەکـەدا کەسـانی وانەبوون کە زانیارییان بە شێوازەکانی شەڕکردن لەگەڵ عەرەب و وڵاتـی عـەرەبان هـەبێت ژمارەیەك بەڵگە هەن، کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کـە سـەرکردەی گشـتی لـە عێـراق لـە بزاوتەکانی کە ژەنەڕاڵ ((لیزنی)) ئەنجامی دەدان ڕازی نەبوو، ژەنـەڕاڵ ((لیزنـی)) شـوێنی ((هۆڵدین))ی دەگرتەوە، ئەگەر ئەوەی دوایـی شـتێکی لێبەسـەربهاتابایە، دوای ڕووداوی سەربازەکانی مانشستر، پێدانی دەسـەڵاتی جولانـدنی هێزەکـانی بـە کەسـانی دیکـە زۆر بەرتەسك کرایەوە، پاشەکشە و کشانەوەی هێزەکان لە دیوانییە بەوردی لە لایـەن بەغـداوە لە ڕێگەی بروسکەوە ئیدارە دەکرا.

لـە لاپـەرە ١٣٧ی پەرتووکەکەیـدا نموونەگـەلێك، کـە ئامـاژەن بـۆ نـەگونجانی سیستەمی کۆنترۆل و لاوازی سیستەمەکە هەیـە. پڕەنسـیپی ئـەو ئەفسـەرانەی کـە سەرکردایەتی بزووتنەوە لێکدابڕاوەکان دەکەن، پێویستە بە وردی هەڵبژێردرێن، دواتر ئازادی کارکردنیان پێ دەبەخشرێت، ئەمەش لە داهاتووشدا بێ گومـان هـەروەك لـە ڕابردوودا کاری پێکراوە، کاری پێدەکرێت. لە ڕووی تیۆرییەوە قەبوول دەکرێـت و لـە

---

١- لە سەر فەرمانی سەرکردەی حیللە (ئەمیر لیزنی) ئەو ڕەتلـە برایـە ئـەوێ، ئەمـەش دوای لـە ڕێگەی تەلەفۆنە پەیوەندی بە بارەگای گشتی لە بەغداوە کرد ژەنەڕاڵ هۆڵدین هەر تەنها ڕۆیشـتنی ڕەتلەکەی پەسەند نەکرد، بەڵکو شوێنێکیشی دیارکرد، کە پێویست بوو ڕەتلەکە بـوی بچـێت. پـێ دەچـێت هۆڵـدین ئـەو ڕاسـتییەی لـە یـاد چـوو بـێ کـە لـە بەڵگەنامـەی خـۆی (بـە مێـژووی ٢٣/تەموز/١٩٢٠) هەیە. نووسەر.

رووی عەمەلیشەوە رەتدەکرێتەوە، ئێرە شوێنی ئەوە نییە، کە بزانین تەنگ پێ هەڵچنینەکانی هۆڵدین بۆ سەر لیزنی لە سەر بنەمایەکی مەعقولانەیە یا خود نا؟ بەڵام تێبینی ئەوە دەکرێت کە ژەنەراڵ هۆڵدین کاتێ دەستپێشخەری خۆی بۆ کارکردن بایکۆت دەکرد، ناوە ناوە ژەنەراڵەکانی دەگۆڕی، تا وایلێهات کوفە لەسەردەستی ئەو سەربازانەی کە ژەنەراڵ لیزنی سەرکردایەتی دەکردن رزگار کرا و شۆڕشەکەش سەرکوت کرا. هیچ پاساویك بۆ ئەو کەموکوڕییەی کە بارەگای گشتی لە هێشتنەوەی ژەنەراڵ لیزنی نییە، لیزنی لە رووداو و رەوشەکە ئاگادار نەبوو. لە ٣ ی ئەیلول لە نامەیەك بۆمنی نووسی: (من زۆر لەوەی کە بگوترێت مەمنوونی تۆم، سەبارەت بەو زانیارییانە و چاپەمەنییە نهێنییانەی بۆ منت دەنارد، ئەگەر ئەمە نەبایە من هەر بە نەفامی سەبارەت بەو رەوشە سەربازییەی کە لە ئارادابوو، دەمامەوە).

## پاشەکشەکردن لە دیوانییە و چەند رووداوێکی دیکە

کاریگەری راستەوخۆی ئەو شکستە، توندبوونەوەی پەشێوییەکان بوو، کە کارلێکی هەوێنەکەی لە ناوچەی فوراتی ناوەڕاست بوو. پێشتریش کوفە زۆر بە توندی گەمارۆ درابوو، خێوەتگای سەربازی لە حیللە بە شێوەیەکی چەند بارە لە لایەن عەشایەرەوە هێرشی کراوەتە سەر و وەڵامی دراوەتەوە، ئەوانی تووشی زیانێکی زۆر کرد، (شبانە)[١] عەرەبەکان بە سەرکردایەتی مێجەر بۆیل، هێشتا لایەنگیری ئێمەیان دەکرد، هەر چەندە کوڕانی عەشیرەتەکانیان هەوڵیان دەدا، لە ئێمەیان دابڕێنن، ناوبانگی ژنەکانیان زڕێزان، هەروەها دەست درێژی سێکسییان کرایە سەر، دواتر بە خراپ مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیان کرا، هەڕەشەی مەرگ و دەست درێژی سەر ژنەکانیان کرد، لە حاڵێکدا ئەگەر سەرکەوتن، گومانی تێدا نییە ئەوان و پۆلیسیش

---

١- شبانە، هێزێکی نیمچە سەربازین، سوپای داگیرکەر لە هاوڵاتییانی ئەو شوێنەی داگیری دەکات دروستی دەکات. (وەرگێڕی کوردی)

به شێوەیەکی یەکلاکەرەوە لە پاڵ ئێمەدا لە شوێنەکانی خۆیان دەمانــەوە، جگــە لــە چەند هەلاوێردنێکی پڕوپوچ نەبێ، ئەمەش باشترین بەڵگەیە، ئەگەر پێویست بکات، لە سەر توانا و لێهاتوویی تاکەکانی (شبانە) و ئەو حاکمە سیاسـییانەی ئـەوانی بـە سەرباز کردووە و مەشق و راهێنانی پێ کردوون.

لە بەرامبەر ئەمەدا، جگە لە پاشەکشەکردن، هیچ نەما تەنها کشانەوە نەبێت لە دیوانییە، ژەنەراڵ کۆنینگهام، ئەم پرۆسەی پاشەکشەکردنەی بە سەرکەوتوویی ئـەنجام دا. جولانەوەی رەتلەکە هەر بەند بوو بە هێڵی ئاسن، کە چـەندین میـل لـە هێڵەکـە وێـران کرابـوو، کـەمی لـە ڤارگۆنـەکانی هێڵـی ئاسـن، رەتلەکـەی ناچـار کـرد، پاشەکشەبکات. سەرجەم ماشێن و گالیسکەکانی کـە کـۆی هـەموویان ٦ ماشـین و نزیکەی ٢٥٠ گالیسکە بوو، ئەمــەش شــەمەندەفەرێکی بــە درێــژی یــەك میــل لێ دروست بوو. ژەنەراڵ هۆڵدین وەسفێکی زیندووی بزووتنەوەی رەتلەکـە و هەسـتەکانی خۆی لەو رۆژانەدا دەکات، دڵەراوکێی من لە هی ئەو کەمتر نەبوو. پێویست بوو بـیر لە داهاتوو بکەمەوە، هەروەها بیر لە ئێستای بەپەلەش بکەمەوە و رەوشەکە لە کۆی شوێنە جیا جیاکان بپێوم، ئەو شوێنانەی کە حاکمە سیاسییەکان لە لایەن (شـبانە)وە پاڵپشتی دەکرێن و هێشتا شێتی شۆڕشی دوژمنکارانە، سەرکەوتوو نەبوو. ئەگەر ئەو حاکمە سیاسییانە بیانتوانیبـا لـە شـوێنی خۆیـان جـێگیربن و سەرپەرشـتی بـەرەی ئیدارەی مەدەنی ناوچەکانیان بکەن، ئەوا هەر یەکێکیان بەقەد فەوجێکی سوپا بوون. لە کاتێکدا سوپا بە چارەسەرکردنی ناوچە راپەریوەکان سەرقاڵ دەبوو. لێرەدا هــەموو فاکتەرێك، کە وامان لێ دەکات باوەڕ بکەین،کە دەتوانین کارێکی وا بکەین، شـۆڕش لە هەموو لایەکی وڵات هەڵنەگیرسێ، تا ئەو کاتــەی یارمــەتییان پــێ دەگـات، کـە ئێستا لە رێگادایە لە هیندەوە بۆ ئێمە.

هەموو ئاگاداری کوشتنی مولازم (ستیوارت) بوون لە تەلەعفـەر، سـەرجەم ئـەو حاکمە سیاسییانە لە هەمان رەوشی (ستیوارت) دەژیـان، واتـا ئـەوان دەسـتیان بـە مەلبەندە دوورەکانەوە گرتووە، کە هیچ یەکەیەکی سوپا تـا دووری (٥٠) میـل لێـی

نزيك نييه. كاپتن (دەبليو ئيف وێب) لە (عەفك) لە ميانەی گەمارۆدانەكەی رومێسە و دواتريش، مايەوە. عەفك شارۆچكەيەكە كەوتۆتە رۆژهەڵاتی ديوانييە، جگە لە كەمێك (شبانە) نەبێت، هيچ كەسی ديكە پاڵپشتی ناكات. مانەوەی (وێب) لەوێ، وايكرد لاباڵێكی رەتلەكە لە ديوانييە پارێزراو بێت. هەروەها ئەو ئاگای لەو پيلانانەش هەبوو، كە بۆ دەست بە سەركردنی خۆی و ئامێرەكانی، لە رێگادا، لە ئارادا بوون. هيچ فڕۆكەيەكيش بۆ گواستنەوەی بۆ شوێنێكی ئارام، لە بەردەست نەبوو. پێی گوترا بە هەر شێوەيەك دەتوانێ با رابكات. نەدەتوانرا پشت بە هەموو ئەو پياوانەی لەگەڵياندا كاريان دەكرد، ببەسترێت. ئەو پياوانە ژن و خێزانەكەيان لەگەڵيان دەژيا، ئەوەيان لێ چاوەڕوان نەدەكرا دوژمنداری شێخە بە هێزەكانی دەوروبەری شارۆچكەكە بكەن، تاكە هۆكاری پەيوەندی پەيامبەرانی (رسل) عەرەب بوون، كە يەكێكيان كوژرا.

لەگەڵ ئەوەشدا كاپتن (وێب)، توانی را بكات و پەيوەندی بە رەتلەكەی ديوانييە بكات، بەر لە پاشەكشەكردنەكە بە ٤٨ سەعات. برترام تۆماس لە شەترە بوو، كرۆفرد لە قەلايی (سكر)دا بوو، كرۆفرد لە رێگەی گەڕانەوەی لە ماڵی شێخێكی دۆست، بۆسەی بۆ دانراوە، بەڵام بەبێ هيچ زيانێك لێ قورتار بوو. برترام ناچار بوو دوای دوو هەفتە بە رێگەی فڕۆكەوە بەرەو شەترە بچێت. ئەمەش دوای ئەوەی حكوومەت و دەسەڵاتی ئەو ناوچەيەی بە (خيوب ئەلعەبيد) سپارد كە سەلماندبوويان جێی متمانەن، ئەمەش بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ئاسايشی ناوچەكە بكەن.

لێرەدا دەتوانين بە شێوەيەكی سەر پێی باس لە قسەيەكی هۆڵدين بكەين كە لە كتێبەكەی هاتووە، سەبارەت بە دڵەڕاوكێيەكانی شەترە[1]، كە هۆزەكەی لە بنچينەوە جێبەجێكردنی شێوازێكی تازەی كۆكردنەوەی باج بوو. بەروبوومەكان بە زنجيرەيی دەپێوران، ئەمەش قسەيەكە لەسەر خراپ تێگەيشتن بونياد نراوە، نەدەكرا ئەو شێوازە سەركەوتن بەدەست بهێنێ، هەتاكو ئەگەر كەسێكش بيری لێ نەكردبێتەوە. باجەكان

1- Thomas , Betram – Alarms and Excursions in Arabia. 1931

ئەو کات بە گوێرەی یاسای تورکی یان بە کاش (پارە) یان بە کاڵا دەدران و بە گوێرەی کەمی بەروبوومەکە- ئەمەش پێشتر بە شێوەیەکی رەمەکی مەزەندکارانی عەرەب دیاریان کردووە. لە هەندێ شوێن شێوازی تازەی هاتۆتە سەر ئەویش بە رێککەوتن لەگەڵ شێخەکان. ئەو شێوازە تازەیەش بریتی بوو لە پێوانەکردنی پارچەیەکی نموونەیی لە چێنراوەکە، کە لەسەر زەوی یەك مەتر چوارگوشە بێت، دواتر دەڕندرێت و دەدورێتەوە و بەرهەمەکەی دابەش دەکرێت، ئینجا بەهای بەروبوومەکە لە بەرهەمەکە دیاری دەکرێت، دواتر مافی حکوومەتی تێدا هەژمار دەکرێت. ئەم شێوازە شێوازێکی نموونەیی نەبوو، بەڵکو ئەنجامی باشتری لەوەی پێشوو بەدەست دەهێنا، هەروەها لە لای هەموان بە شێوازێکی باشتر دادەنرا.

هەرچی بزووتنەوەکانی دیکەی فوڕات بوو، کە لە کتیبەکەی هۆڵدین بەوردی باسکراوە، هەموویان بە بێ هەلاوێردن سەرکەوتوو بوون، سەرکەوتنەکانیان بە شکست نەشێوێنراوە.

لە ١٢ی ئاب موسەیەب (المسيب) داگیر کرا، بەنداوی هیندیە لە ١٤ی ئاب داگیرکرا، ژەنەڕاڵ لیزنی زنجیرەیەك جولانەوەی تەمبێکردنی سەرکەوتووی ئەنجامدا، تا کۆتایی ئاب رەوشە سەربازییەکە دەستی بە سەرداگیرا، دەستمان بەسەر چەند رووبارێکدا گرت، ئێمە لە بارێکدا بووین، دەمانتوانی رێگە لە پەشێوی بگرین، هەر چەندە کوفە هێشتا گەمارۆ درابوو بەڵام پێویستی بە هاناوەچوون نەدەکرد.

## شۆڕشی دیالە

بە شێوەیەکی کردار نەدەتوانرا رەتلێکی سەربازی بۆ ئەو لایە ببرێت، چونکە تەقینەوەی پەشێوییەکان باقوبە و شەهرەبانی گرتبووەوە، ماوەیەك رێگەی گەیاندن بە ئێرانەوە پچڕا. لە ٩ی ئابدا هێڵی ئاسن لە نزیك باقوبە پچڕا. لە ١٨ی ئاب حاکمی سیاسی ناچار بوو ناوچەکە بە جێبهێڵێت، ئەمەش دوای ئەوەی پەشێوی بە هۆی پێکدادانی رەتلێك لەگەڵ گرووپێك کە ژمارەیان (٥٠) تاڵانکەر بوون، هات.

فەرمانبەرە مەدەنییەکان لە پۆستەکانیان تا دوایین سات مانەوە، کاتێ رەتکرایەوە یارمەتی سەربازی بدرێن، زۆر بەزەحمەت لە شارۆچکەکە رایان کرد و، عەرەبەکانیش تالآنیان کرد.

یەکێ لە ئەفسەرە کۆنەکانی عێراق، پرۆسەی چۆلکردنی سوپا لە بەعقوبە ئەو کات زۆر بە وردی نووسیووە، لەبەرئەوەی پرۆسەیەکی ((قیێزەونە)) و هیچ هۆکارێك بۆ دژایەتی ئەو حوکمە نابینم، کە زۆربەی خەلّك هاوڕان لە بارەیەوە. ئەوەی لە بارەیەوە نووسراوە، بۆ داننان بە دابەشکردنی بەرپرسیارێتی لە نێوان بارەگای گشتی و سەرکردەی لۆکالّی بەس نییە، لەبەرئەوەی سەرکردەی لۆکالّی بەشیوەیەکی لە ناکاو پاشەکشەی کرد، ئاساییە ئەو ئەنجامە رەشەی لێبکەوێتەوە، هەروەها هیچ رێوشوێنێکی بەرزەفتکردن بە دوای ئەم پرۆسەی پاشەکشەیە نەهات، مەسەلەیەکی لۆژیکییە کەوا دابنرێت، کە ئەوەی روویداوە لەو فەرمانانەی دەرکراوە سەرچاوەی گرتووە. گومانی تێدا نییە کە بارەگای گشتی دوای رووداوەکە ترسی لێنیشیبێ (ئەو ترسەی کە ئیدارەی مەدەنی هیچ کاتێك بە خۆوەی نەدیبێ) ترس لەوەی کە بەغداش لە ژێر کۆنترۆڵی دوژمنانمان بێت. ژەنەراڵا هۆڵدین ماوەیەکە گوێی بەو هۆشدارییانە نەدەدا، کە پێشکەشی دەکران، کاتێکیش چاوی بە کێشە دیارەکان کەوت، پەرچەکردارەکەی بە پلەیەکی گونجاو توندبوو.

بیرۆکەی چۆلکردنی ولآت لە عەقلی پیاوانی هۆزەکاندا گەورە دەبێت، ئەم بیرۆکەیە لەلایەن نوێنەر و پەیامبەرانی نیشتیمانپەروەران بێوچان پەخش دەکرا، دواتر بۆ حەقیقەتێکی واقعی گۆڕا.

شەهرەبان، کە ٢٧ میل کەوتۆتە باکوور، بووە شارۆچکەیەکی دابڕاو، هیچ هێزێکی سەربازیشی لە نزیك نییە، تەنها لە بەغدا و کرنت نەبێ، کاپتن (دەبلیو تی رێگلی) یاریدەدەری حاکمی سیاسی بەرپرسی ئەوێ بوو، کاپتن (براد فلید)یش لەگەلّیدا، سەرکردایەتی (شبانە) عەرەبەکانی دەکرد. کە نزیکەی (٥٠) کەسیان لە بارەگا دابوون و دوو ئەفسەری بەریتانی (نیوتن و نسبیت) مەشقیان بە (شبانە)کان

دەکرد، هەروەها لە شەهرەبان ئەو کات کاپتن (ئەیی ئێڵ بۆکانان) کارمەندی دائیرەی ئاودێری هەبوو. ئەو پیاوە ژنەکەشی کە بەرەگەز ئینگلیزی بوو لەگەڵ خۆی بۆ ئـەوێ بەبێ ئاگاداری من بردبوو، ناوی ئـەو ژنـە لـە هـیچ یـەکێ لـەو لیسـتانەی کـە لـە بەڕێوەبەری ئاودێری بە نووسینگەی من دەگەیشتن و ناوی فەرمانبەر و خێزانـەکانیان و شوێنی حەوانەوەیان تێدا دیاری کراوە، تێدا نەبوو. مـن هـەرگیز چاوم بـە کـاپتن (بۆکانان) نەکەوتبوو. کاتێ لە سەرەتاکانی مانگی ئـاب سـەردانی شـەهرەبانم کـرد، ریکلی بە ستایشەوە باسی کارەکانی بۆکانانی کرد، بـەڵام هیچـی لـە بـارەی بـوونی ژنەکەی نەگوت، ئەگەر ئەوەم بزانیبا، سووردەبووم لە سەر چوونی بۆ بەغـدا. ریکلـی لە ٤ی ئابدا بۆی روون کردمەوە کە هۆزەکان و خەڵکی شارۆچـکەکە خەریکـە بێـزار دەبن. بەڵکو بەو تەوژمە پەشێوەیەی کە وڵاتی گرتبووەوە، کاریگـەر بـوو، هـەروەها کاریگەر بوو بەزانینی شکستە چەند بارەکانی هێزەکانمان، پێم گوت، هەروەك بـەوانی دیکەشم گوت، کە تا پێیدەکرێت لە شـوێنی خـۆی بمێنێتـەوە، رەوشـەکە رۆژانـە بـە بروسکە بە من و سەرکردەی سوپا لە باقوبە رابگەیەنێ.

تا ١١ی ئاب ئەو کارەی کرد، لە ١٢ی ئاب عەرەبەکان هێڵی تەلەگرافیان پچڕاند و حامیەی بەریتانی بەپەلە و خێرا بەبێ هیچ هەوڵ دانێك بـۆ پاراسـتنی سـەلامەتی فەرمانبەران لە شەهرەبان، باقوبەی بەجێهێشت، لـە ١٣ی ئابـدا خـەڵکی شـەهرەبان شۆڕشیان کرد، عەشایەرەکان شارۆچـکەکەیان داگـیر کـرد، (شـبانە)کـانیش دەسـت بەرداری ئەرکەکانیان بوون و هەر پێـنج ئینگلیزەکـە کـوژران، بـەڵام خێزانـی کـاپتن (بۆکانان) بۆ ماڵی یەکێ لە خاوەن مولکەکانی شارۆچکەکە برا، تا رۆژی ٩ی ئـەیلول پارێزگاری لێکرا. کاتێ رەتلێ لە بەغداوە بە سەرکردایەتی (کونینگهام) و رەتلێکـی دیکە لە سەعدیە بە سەرکردایەتی عەقید (گریر) هاتن رەوشی شەهرەبانیان بۆ بـاری ئاسایی خۆی گەڕاندە، لەم پرۆسەیە (جۆن پینیز) کە سەرپەرشتی کشتوکالی ئـالیکی سەربازی لە شەرەبان دەکرد، زۆر بە سەختی بریندار بوو، دواتر بە دیـل گـیرا. بـەڵام تەنگی پێ هەڵنەچنرا. خاتوو (بۆکانان) چیرۆکی ئەم مەرگەساتە لـە کتێبەکەیـدا بـە

ناوی (له دەستی عەرەبانـدا)[1] بـەوردی بـاس دەکـات. سـێر ئەیلمـەر هۆڵـدێن لـە کتێبەکەیدا باسی ئەو میراتە نووسراوە ناکات، ئەوەی هۆڵدین لە بارەی ئەو هێرشە و ئەوەی لێی کەوتۆتەوە، هەروەك روون دەبێتەوە لە سەر ئەو چیرۆکانەی کە عەرەبەکان دواتر گێراویانەتەوە، بونیاد ناوە. ئەمەش بە بڕوای من لەوەی خاتوو (بۆکانان) کەمتر جێی متمانەیە. بەڵام ئەوەی خاتوو (بۆکانان) لە بارەی (شبانە) ئاماژەی پێدەدات لەو بەلگانەی کە بە شێوەیەکی فەرمی نووسراون جیاوازە.

لە چیرۆکەکەی خاتوو (بۆکانان) روون دەبێتەوە کە سـەرجەم ئەفسـەران و راهێنـەرانی (شبانە) و جۆن پینز، ئازایەتییەکی بێ وێنەیان نواندووە. لە چیرۆکی هۆڵدینیش بەهـەمان روونی دەردەکەوێت کە ئامادە نەبووە لە بەغداوە هێز بۆ رزگار کردنی ئەوان رەوانە بکات، بەڵام ئاخۆ بۆچی دەڵێت کە ئاگای لە بوونی ئەو ئەفسەرانە لـە شـەهرەبان نـەبووە. ئەمـە شتێکە ناکرێت روون بکرێتەوە، ئەوانە نەوەك هەر ناویان بە شـێوەیەکی رێـك لـە لیسـتە چاپکراوەکانی حاکمە سیاسییەکان و ئەفسەرانی (شبانە) و ئاودێری، بـە دەردەکـەوت بـە تەنها، بەڵکو بڕیاری هێشتنەوەی (شبانە) لە باقوبە و شەهرەبان و سەعدیە و خانـەقین بـە سـەرکردایەتی ئەفسـەرانی بـەریتانی، پـێش چـەند مانگێـك دراوە. ئەمـەش دوای گفتوگۆیەکی تەواو لەگەڵ دەستەی ئەرکانی گشتی، کە قەرزێکی گەورە لە خەزێنەی سوپا بۆ ئەم مەبەستە دیاری بکات، ئەمەش بۆ ئەوەی کاروبارەکانی سوپا لە ماوەی ١٢مانگی داهاتوودا رابپەڕێنێ و ئەرکـەکانی سـەلامەتی هێڵـی ئاسـن جێبـەجێ بکـات. هەرچـی (ریگلی و براد فیلد) بوو، زۆر چاوم پێییان دەکەوت، هەردووکیان تایبەت بۆ پڕکردنـەوەی ئەرکەکەیان لە لایەن سەرکردەی ناوچەکە هەڵبـژێردرا بـوون. هـەر یـەکێکیان تۆمـارێکی نایابیان لە بواری ئەفسەری هەبوو، ریگلی نیشانەی ئازایەتی (خاچی ئاسـن)ی لـە عێـراق وەرگرتبوو، هەروەها کاپتن بۆکانانیش تۆمارێکی باشی لە هێزی ئاسمانی پاشایەتی هەبوو، هەرسێکیان گەنج بوون، بۆیە مردنیان کاریگەرییەکی قولی بۆ من دروست کرد و زیانێکی گەورەشی بە ئیدارەی مەدەنی گەیاند.

1- In The hand of The Arabs.

## جووڵانەوەکەی کفری

عەشایەرەکان شارۆچکەی کفرییان داگیر و تالآن کرد، دواتر کاپتن (جی. ئێچ. سالمۆن) حاکمی سیاسییان دەستگیر کرد و دوای چەند رۆژێك لە بەندیخانە کوشتیان. پێشتر داوای لێکرابوو، کە بارەگای خۆی بۆ ویستگەی ئاسن لە (کنکربان)، کە دوو یەکەی پیادەی هیندی لێ بوو، بگوازێتەوە. بەڵام ئەم کارەی نەکرد، هەروەها ژنەکەشی ئەو کارەی نەکرد، چونکە وا هەستی دەکرد، کە مانەوەی لە نێو خەڵکی شارۆچکە کاریگەری دەبێت، لەمەشدا لە سەر هەق بوو.

رەگەزی عەشایەری دوژمندارییەکی گەورەی دەکردن، ئەرکی خۆی بوو لە پۆستەکەی تا دوا سات بمێنێتەوە، لە ٢٢ی ئابدا بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ چەند پیاوێکی هۆزەکان بۆ سەر گردێکی نزیك رۆیشت. دەستبەسەر کرا و رێگەیان پێ نەدا بۆی بگەڕێتەوە، خەڵکی شارۆچکەکە ژنەکەیان گەیاندە خیوەتگایەکی سەربازی کە چەند میلێك لە شارۆچکە دوور بوو. دوای دوو رۆژ لە ٢٨ی ئابدا عەشایەرەکان هاتنە ناو کفری و کاپتن (سالمۆن)یان کوشت، هەرچەندە ئەوان هیچ رق و تووڕەییەکیان لە بەرامبەریدا نەبوو، تاکو بیکەنە بەهانە بۆ کوشتنی، بەمەش بڕیاری مانەوە لە شارۆچکەکە تا دوا سات، نرخەکەی گیان سپاردنی بوو. بەڵام لەوانەیە بەم کارەی هەڵوێستی سەربازی ئەو بەرەیەی رزگار کردبێ. رەوشی سەربازیمان بە مەترسی دەورەدرابوو، هەر رۆژێك درێژەی بکێشابا بۆ ئێمە گرنگ بوو، دوای دوو رۆژ مەفەرزەیەك کە لە کەرکوکەوە هاتبوو کفریی داگیر کرد، هیچ نیگەرانی دیکە لە ناوچەکە رووی نەداوە.

کوشتنی (سالمۆن)، کە هۆڵدین بە ئاماژەیەکی بچووك نەبێت، ناوی ناهێنێت، زۆر لێدوانی لە کاتی خۆی لێکەوتەوە، هەر چەندە فەرماندەی سەربازگەکە بێ تاوان کرا، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو فەرمانەکانی جێبەجێ کردووە، بۆیە یارمەتی دانی فەرمانبەرە مەدەنییەکانی کفریی رەتکردەوە، بەڵام هێشتا ئەو پرسیارە ماوە، تا چ ئەندازەیەك ئەو رێنماییانە مەعقولن. ژەنەڕاڵ هۆڵدین لە

١٧ی ئابدا باسی ئەوەی کردووە کە حامیەی (کنکربـان)، کـە لـە نزیـك کفرییـە، کەمی کردووە، لە دوو سریە و چەند پاشـکۆیەك بـۆ تـەنها دوو فەسـیلّ (فصـیل) کەمبۆتەوە. ئەم هێزەش بۆ پارێزگاری لە کەرتی سەربازگەکەش بەس نەبوو، بـاقی هێزەکەی دیکەش ئەو کات بۆ پارێزگاریکردن لە دوو خالّ کە دەکەونە سـەر هێلّـی ئاسن تەرخان کرابوو، بەلاّم پێ دەچێ مێژووی ١٧ی ئاب ئەو مێـژووە نـەبێت کـە پەیوەندی بە باسەکەوە هەبێت. هەرچەندە ژەنەڕالّ هۆلّدین، ئەو رۆژە دیاری ناکـات کە (سالمۆن) براوەتـە بەندیخانـە، هـەروەها ژمـارەی تالاّنکـەرانیش کـە هێرشـیان هێناوەتە سەر شارۆچکەکە دیاری ناکات، کە دەکرا بە ئاسانی بـەرگری لێبکرێـت، بەتایبەتی لەو لایەی کە هێرشیان بۆی هێنا.

لە راستیدا، ژەنەڕالّ هۆلّدین کاتێ چارەسەری کێشەکەی کردبێ، پـێ دەچـێ لە هەلویستێکی بەرگریکردن لە خۆدا بووبێ و پێی خۆش بووە لە بەرپرسیارێتی هەلّبێ، بەلاّم کێشـەکە پێویسـتی بـە چارەسـەری تـەواوتر هـەبوو، جـا ئەگـەر بەرگریکردن لە کفری شیاو بایە یا خود نـا؟! ئـەوەی روویـدا، وایکـرد بیرۆکـەی دەسەلاّتی سەربازی کە ئامانجیەتی حکوومەتی مەدەنی بپارێزی و جێگیری بکات بـە خـۆی ببێتـە هـۆی ئـەوەی سـەربازگەکان و پێداویسـتییەکان و هێلّـەکانی گواستنەوەی ببنە ئامانجی سەرەکی دوژمنانی، لەم رووداوەدا وامـان لێ دەکـات کە باوەڕ بەوە بکەین کە دەکرا کفری رزگار بکرێت، بەلاّم ئاگایی ئەفسـەران بـە پلەیەك بەرتەسك بوو لە بیرکردنـەوە و چـالاکی نوانـد، وایکـرد دەستپێشـخەری لەلای ئەوان دروست نەبێ، تەنها لای ئەوانە نەبێت کە پێیان وایـە سـەربەخۆیی روحی یەکسانە بە یاخیبوون. لێرەدا پێویستە بلاّوکراوە ژەنەڕالّ هۆلّدین کـە لـە بەرواری ١٣ ئابدا نووسیویەتی و لە کتێبەکەیـدا بلاویکردۆتـەوە بخوێندرێتـەوە، هـیچ یـەکێك لەوانـەی بـەرخۆی، دەیتـوانی زاتـی ئـەوە بکـات ئـەم جـۆرە بەلّگەنامانە دەربکات.

## ڕەوشەکە لە هەولێر

دواتر پەشێوییەکە لە لیوای هەولێریش بڵاوبووەوە، لە ١٢ی ئابدا کاپتن (دەبلیو. ئاڕ. هی) لە تەنگەبەر (دۆل)ی ڕەواندوز (گەلی عەلی بەگ) هێرشی کرایە سەر، خەریك بوو گیانی تێ بچێ. لە ٣ی ئەیلول کاپتن (ئێف. س. کیرك) ناچار بوو کۆیە جێبهێڵێت. ئەو دوو ئەفسەرە بە درێژایی هێڵ، لە ڕەوشێکی زۆر سەختدا، ئازایەتی و بۆیری خۆیان سەلماند. پەشێوییە باوەکانی وڵات هیچ پەیوەندییەکی بە سیستەمی حوکمی وڵاتەوە نەبوو، کوردەکان هیچ هاوسۆزییەکیان بۆ ئەو بیروڕایانە نەبوو کە نیشتیمانپەروەرانی عەرەب مژدەیان دەدا، بەڵام گرووپێکی بچووك لە ئەفسەرانی پێشووی تورکی و خاوەن زەوییەکان لە هەولێر، بڕوا بوون بە گەڕانەوەی تورکەکانیان بەهێز دەکرد، لە ماوەیەکی کورتدا، هەرچی خودی عەشایەرەکانە، بەوە ناسرابوون کە دژی هەر شتێکی لەو چەشنەن. سەختییەکانی ئێمە لەو ناوچەیە یەکجار زیادی کرد، دوای ئەوەی نەمان دەتوانی هیچ لێدوانێك لە بارەی داهاتووی ویلایەتی موسڵ یا کوردستانی باشوور دەربکەین، حکوومەتی خاوەن شکۆ لەمبارەیەوە زۆر سەرسەخت و کەللەڕەق بوو، ڕاستی نیازەکانی حکوومەت هەر چییەك بێت، بەڵام ئامادە نەبوو دەسەڵات بە هیچ کەسێك بدات کە لەم بارەیەوە هیچ جۆرە زانیارییەك دەربکات، هەر چەندە من پێش دوو ساڵ، لە تشرینی دووەمی ١٨ ١٩، ڕێنماییم وەرگرت، کە دڵنیا بین لە ڕای دانیشتوانە لۆکاڵییەکان، کە ئاخۆ دەوڵەتێکی عەرەبی لە ژێر ڕاوێژکاری بەریتانیایان پێ باشترە یان نا، ئەو دەوڵەتە هەر لە ویلایەتی موسڵەوە تا کەنداوی عەرەبی درێژ دەبێتەوە. سەرجەم ڕاکان لە ساڵی ١٨ ١٩ و ١٩١٩ لە سەر یەك ڕا سەبارەت بەم بابەتە وەستا: هەموو ڕێککەوتن کە پێویستە ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر سنووری عێراق. (شبانە)ی لیوای هەولێر بە سەرکردایەتی کاپتن (لیتل دێڵ) هەروەك هۆڵدین باسی کردووە ڕەفتارێکی نایابیان نواند و توانییان زیانێکی زۆر لە ئەستۆ بگرن، بەبێ ئەوەی ورەیان دابەزێ. ئەوان هیچ ڕێگا چارەیەکی دیکە جگە لە پاشەکشەکردن بۆ ڕەواندوز و باتاس، لەوێش بۆ

هەولێریان لە بەردەم نەمایەوە، بەڵام زۆرینەی هەرە زۆری هەرگیز لەلایەنگیری کردن بۆ ئەفسەرانی بەریتانی دوو دڵ نەبوون. لەم ڕۆژە سەختەدا بەفرۆکە بۆ هەولێر چووم، هەم سەردانی کاپتن هیمانمان کرد، هەمیش دوو مەڵبەندی شۆڕشگێڕانمان لە دوو گوندا بە بۆمب بۆردوومان کرد و بە ئاگری ڕەشاشەکانیش سووتاندمان، تا ئەوەی هەموو جبەخانەی خۆمان تەواو کرد. لە هەولێر چاوم بە چەند (شبانە)یەکی کورد و ئەفسەرەکانیان کەوت، هەموو قسەیەکیان هەر باسکردنی ئەفسەرە بەریتانییەکانیان و ڕۆیشتن بە دوایاندا بۆ هەر شوێنێ کە ئەوان دەیانەوێت، بوو. ئەوانە وەفاداری بۆ بەجێگەیاندنی ئەرك، باوەڕی (شبانە)ی کوردی بوو، کاپتن (لیتل دێڵ) مەدالیای (M.C) وەرگرت و یاریدەدەرەکەی بەڕێز عەلی مەدالیای (سەربازی) لە بڕی ڕێزگرتن لە خزمەتەکانی پێ بەخشرا.

کاپتن (هی) سەبارەت بەم هەفتە ناخۆشانە، چیرۆکێکی زیندوو لە کتێبەکەی، کە پێ دەچێ هۆڵدین پێی نەزانی بێ، چونکە هیچ ئاماژەیەکی پێ نەکردووە، دەگێڕێتەوە. خۆڕاگری و هەوڵە لەبن نەهاتووەکانی کاپتن (هی) بەقەد لیوایەك سەرباز بوو لەو ڕەوشەدا بۆ ئێمە، ئەو زۆر باش ئاگای لەوە بوو کە حاکمە سیاسییەکانی خانەقین و باقوبە دەرکراون و نووسینگەکەیان سووتێنراوە، پەشێوی لە دەرگای دیالە دەدات، حاکمە سیاسییەکانی کفری و شەهرەبان کوژراون، لوید لە دەلتاوە (خالس) دەست بەسەر کراوە. بەخۆم پێم گوت ئەگەر هەر پەشێوییەك لە هەولێر رووبدات، ئێمە بە فڕۆکەیەکیش ناتوانین یارمەتی بدەین، هەروەها بە مەفرەزەیەکیش ناتوانین یارمەتی بدەین. پێشتریش لە هەولێر هەوڵی کوشتنی درا بوو. خەڵکانێکیش لە بۆنەیەکی دیکە هەوڵیان دابوو ئاگر لە ماڵەکەی بەربدەن. دوای چەند ڕۆژێك لە گەلی عەلی بەگ بۆسەی بۆ دانراوە، گەلی عەلی بەگ شوێنێکی دمۆر[1] بوو، بۆ بەریتانییەکان، زۆر جار ببووە شانۆی مردنی لەناکاو، یەکێ لە پیاوانی کاپتن (هی) بەڕێز (سارجنت میتوین) هەر لەو شوێنە بەر لە دوو مانگ تەقەی لێ کرا و گیانی لە دەست دا،

---

١- دمۆر= مشئوم

ئەمەش لە میانەی هەوڵدان بۆ دەستگیرکردنی ئاغایەکی ناوچەیی کە دەستی لە نیگەرانییەکاندا هەبوو، روویدا.

هێشتا کاپتن (هی) تەمەنی نەگەیشتبووە (٢٧) ساڵان، بەڵام سەبارەت بە یاریدەدەرەکانی بە تەمەنتر دیار بوو، چاوەڕوان دەکرا، لە میانەی ئەو تەنگژانەی پیایدا تێ پەڕی ورە بەر بدات و عاقلانە لەگەڵ کارمەندەکانی بۆ نزیکترین شوێنی پارێزگاری سەربازی لە کەرکوك پاشەکشە بکات، بەڵام هیچ شتێکی لەم بارەیەوە نەکرد، هەڵسا بە گرتنەبەری رێوشوێنی ناردنی (خەزێنەی مەدەنی) کە بیست هەزار پاوەنی ئیسترلینی تێدا بوو، بۆ کەرکوك لەگەڵ فەرمانبەرانی کەتیبەکەی. ئینجا خورشید ئاغا، کە یەکێ بوو لە سەرۆکە لۆکاڵییەکان بە خۆی بە شوێنکەوتوانی هاتنە ناو شار و هێزی بچووکی (شبانە) و پۆلیسیان تۆقاند، کە هێشتا بە لایەنگیری ئەفسەرە بەریتانییەکان مابوونەوە، هەروەها خورشید ئاغا هەموو کاروباری شاری گرتە دەست، لەگەڵ ئەوەشدا تا کاپتن (هی) لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە و کاپتن (دیڵ)یش لە سەرای لەگەڵ گرووپێکی بچووك بمێنێتەوە، دەکرا پارێزگاری لە روخسار و شێوەی دەرەوەی حکوومەت بکرێت.

ئەمە رەوشی شاری هەولێر بوو، کاتێ من لە رۆژی ٨ی ئەیلول بە فڕۆکە چووم بۆ ئەوێ. بەو هیوایەی لەم سەردانە کورتەدا متمانە لە دەروونی پیاوماقولانی ناوچەکە بچەسپێنم، لەلایەن کۆمەڵێ سوار چاکی کوردەوە، پێشوازی کرام، سەرکردەکانیان بە سۆز و ملکەچ بوون، ئەوانە بەر لە چەند رۆژێك دەستیان بەسەر جبەخانەکانی هێزی (شبانە) داگرتبوو. دواتر منیان بۆ خانوێك لە نزیك فڕۆکەخانە برد، هەرکە نانی بەیانیم خوارد، لە بڕی ئەو برینە گەیشتم کە لە جەستەی رەوشەکەدایە. دڵەراوکێیەکە لە ئاستێکدایە، پڕوپوچترین رووداو، لەوانە بوو وا بکات دوو سوپا تێوە بگلێ، هەروەك لە شەهرەبان و شوێنانی دیکە روویدا. کاتێ سواری فڕۆکە بووم دانەیەك لە پەرتووکی ((نامەکانی بیکون))م لە گیرفاندا بوو[١].

کاتێ کتێبەکەم کردەوە لە یەکێ لە لاپەڕەکانیدا ئەم رستەیەم بینی:

---

١- Bacon's Essays

((ئازایەتی لەگەڵ راوێژکردن باش نییە، لەگەڵ ئەوەی لە جێبەجێکردندا باشە... چونکە راستترین کار لە راوێژدا ئەوەیە کە مرۆڤ مەترسییەکان ببینێ، بەڵام لە جێبەجێکردندا ئەگەر مەترسییەکان گەورە نەبێت نەیبینی باشە.))

ئاشکرایە، لە هەولێر ساتە وەختی جێبەجێکردن بوو، نەوەك وەختی راوێژ، لە سەرای چاوم بە شاندی سەرۆکە کوردەکان کەوت، ئەو متمانەیەم بە دەرخست، کە زۆر دوور بوو لەوەی خۆم هەستی پێ بکەم، ستایشی پاراستنی ئاسایش و ئارامی ئەوانم کرد. هەروەها هوشداریم بە سزای داهاتوودا. دوو قسەکەر بە ناوی ئەوان وەڵامیان دایەوە، ئەوانیش (خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی) بوون، بە کورتی لە وەڵامەکەیان منیان دڵنیا کردەوە کە لە پاراستنی ئاسایش و پاڵپشتی کردن لە ئیدارەی مەدەنی بەردەوام دەبن.

بەڵام ئەوان ئەوەشیان بۆ سەر قسەکانیان زیاد کرد: ((ئێمە دوو شتمان لە تۆ دەوێت: یەکەم زامنی ئەوەمان بۆ بکە، کە رێگە بە گەڕانەوەی تورکەکان نادرێت و رێگە بەوە نادرێت کە عەرەب حوکمی ئێمەی کورد بکات، دووەم هێزێکی سوپا بەپەلە بۆ هەولێر بنێردرێت بۆ ئەوەی بەوانەی ئاژاوە دەنێنەوە پیشان بدرێت کە دەستی حکوومەتی بەریتانی هێشتا درێژ و بە هێزە.)) ئەو وەڵامانەی بەو شاندانە دەدران، بریندارکەر و لەکەدار بوون، چونکە من لە توانامدا نەبوو هیچ دڵنەواییەك لە بارەی داهاتووی لیوای هەولێر پێشکەش بکەم. بەڵام دەفتەرێکی تایبەتیم لابوو، هەموو بەیاننامەیەکی گشتی یان لێدوانێك کە وەزیرێکی بەرپرس شتێکی لە بارەی عێراقەوە گوتبێ تێیدا نووسراوە، لەم دەفتەرەدا وەرەقەیەکم دەرهێنا، دوای وەرگێڕانی ئەوەی تێیدا نووسراوە، دامە دەست ئەحمەد ئەفەندی، ئەمەشی تێدا بوو:

((٢٥ی تەموز- مستەر لوید جۆرج، لە وەڵامی مستەر (لە مبرت) لە ئەنجوومەنی عەوام، گوتی: گرفتەکانی ئێستامان لە عێراق گرفتی کاتین. باوەڕیشی وا بوو کە دەتوانرێت بە سەریدا زاڵ بێت. حکوومەتی خاوەن شکۆ هیچ هۆکارێك بۆ دەست بەرداربوون لە ئینتیدابی بەریتانی بەسەر عێراقەوە نابینێ.))

دواتر من وەڵامم دایەوە گوتم: ((لەمــە زیــاتر مــن نــاتوانم هیچــی دیکــە بڵــێم، پێویستە بایی ئەوە بکات قەناعەتان پێی بێت. من خۆم قسەم لەگــەڵ مســتەر لویــد جۆرج (پیاوی دەوڵەت، کە زیاتر لە هەر کەسـێکی دیکــە لــە ســەرکردایەتی کردنــی هاوپەیمانان بەرەو سەرکەوتن، کاریکردووە. ئەو پیاوە لۆمە و سەرزەنشت رێگەی پــێ ناگرێت و رووداوی کوشتنیش کاری تێ ناکات) دا کردووە، من قســەی ئــەو دووبــارە دەکەمەوە کە گوتی (ئێمە دەست بەرداری ئەوەی پێمان راسپاردراوە، نابین).

بۆ ئەوەی خۆم لە دەمەتەقێی دیکە رزگار بکەم، لە داواکەیان سەبارەت بە ناردنی هێزێکی سوپام کۆلییەوە، پێم گوتن کە هێزەکــە دەگــات، بــەڵام نــاتوانم بڵــێم کــەی دەگات، دواتر قسەم لە بارەی ئــەو تەمبێکارییانــە کــرد، کــە لــە ناوچــەی فــوڕاتی ناوەڕاست و دیالە لە ئارادیە، تکام لێکردن، کە رێگە بە پیاوانی هۆزەکان نەدەن ببنە نێچیری ئەو تەوژمە شێتییەی کە عەرەبە شیعەکان لە ناوچــەی فــوڕاتی ناوەڕاســت و دیالە پێی کاریگەر بوون، هیچ پەشێوییەك لە دیجلەدا لە بەغداوە تاکو بەسرە، نەبوو، بەڵام لە بەغدا نەدەکرا هیچ تەقینەوەیەك روویدات.

سلێمانی لە ناو دەستە بــەهێزەکانی مســتەر (ســون)دا، هــێمن بــوو. ئــەو پێــی راگەیاندبوون کە کاتی تەنگانە بەسەر چووە، ئەوانەی پەشێوییان ناوەتەوە وەکو رێوی کاتی بەیانیان لیکاویان بە گڵ دا دەچێ (رێوی لە ئێــران و کوردســتان بــە فیلبــاز و بەلارێدا بردنی ئاژەلی سادە بە ناو بانگە)، خەلك بەم قسانە نیمچە دڵنیا بوون، بەڵام رەوشەکە بە ئاگاتر بوو لە پێشتر.

دوای ئەوەی شاندەکە شوێنەکەی جێهێشت، لەگەڵ هەر یەکە لــە رەشــید ئاغــا و ئەحمەد ئەفەندی بە جیا کۆبووەوە و لە ســەر ئــەو خزمەتانــەی پێشکەشــی ئیــدارەی مەدەنی دەکەن، سوپاسم کردن. لە بارەی ئەو یارمەتییانەی کە بــەنیاز بــوو بگــەن و چالاکی تەمبێکردن، ئازادانە قسەمان کرد، دووبارە کێشەی ویلایەتی موسڵ سەر لە نوێ ورژێنرایەوە، ئەوان پێیان گوتم : ((ئەگەر تورکــەکان بگەڕێنــەوە، دەمــانکوژن و ژنانمان هەتك دەکەن و میراتمان دەدزن، ئایا ناکرێت دڵنیامان بکەی، کە رێگەیان پــێ

نادرێت بۆ ئێرە بگەڕێنەوە؟)) دووبارە دەفتەری گیرفانم دەرهێنا و لێدوانێکی مستەر لوید جۆرجم بینی کە لە ٥ی کانوونی دووەمی ١٩١٨ دابووی، ئەمەش قسەکانیەتی: ((... ئێمە لە کاتێکدا، کە بەڵێنی پارێزگاریکردن لە ئیمپراتۆری تورکی لەو وڵاتانەی کە نەتەوەی تورکن، بە پایتەختی ئەستەمبۆلیش، ناکەین، باوەڕیشمان وایە کە دوورگەی عەرەبی و ئەرمینیا و عێراق و سوریا و فەڵەستین، مافی ئەوەیان هەیە هەر یەکەیان دان بە قەوارەی نەتەوەییان دابنرێت. بەڵام نابێت باس لە شێوەی وردی ئەو داننانە بکرێت بۆ هەر یەکێك لەو حاڵەتانە، تەنها ئەوە نەبێت کە ناکرێت دەسەڵاتی پێشوو (عوسمانی) بۆ سەر ئەو وڵاتانەی ئاماژەی بۆ کراوە بگەڕێتەوە...)

من ئاوا لێدوانم لە سەردا گوتم: ((ئەو پیاوەی ئەو قسەیەی کردووە، تا بۆی بکرێت قسەی خۆی دەباتە سەر، لە ئەنجوومەنی عەوامیش زۆرینەی هەیە، سەرجەم لۆردەکانیش لەمبارەیەوە لایەنگری ئەو دەکەن، ئەویش لێرەدا مەبەستی لە عێراق هەر سێ ویلایەتەکانی بەغدا و بەسرە و موسڵە)). دواتر ئەو دوانە چوونە دەرەوە، تا ڕادەیەك مێشکیان ئارام بوو. بۆ نان خواردن بۆ ئەو خانووەی نزیك فڕۆکەخانە گەڕامەوە، لە سەر بانی خانووەکە گرووپێکی گەورە لە پۆلیس و (شبانە) بە ڕەشاشی لویس کۆببوونەوە، چونکە چاوەڕوانی هێرشێکیان دەکرد، لەمیانەی نان خواردن ڕاپۆرتێك گەیشت، گوایا کۆمەڵێ پیاوی هۆزەکانی بەنیاز بوونە ماشینەکانمان تیکبشکێنن، دواتر روون بووەوە، ئەمە ڕاپۆرتێکی هەڵەیە، بەڵام ئاماژە بوو، بۆ پەشێوی روو لە زیاد بوون. دواتر داوای مۆڵەتم لەو کۆمەڵە نەبەردە کرد و هانی کاپتن (هی)م دا چەندی بۆی دەکرێ و هەرچەندە ئەمەش پڕ مەترسییە، ئارام بگرێت. بەڵام کاتێ بۆ دوایین جار کە سەیری ئەو کۆمەڵەیەم کرد، کە تۆز دایپۆشیون، بێ ئومێدی دایگرتم لە نێوان حاکمە سیاسییەکانی ناوچەکاندا، لە نێوان من و ئەواندا نەوەك هەرپەیوەندی برادەرایەتی بەڵکو هاوڕێیەتیش هەبوون، کە ئەمەش بەهۆی لێکتێگەیشتنی هاوبەش و مەترسی و ئازاری هاوبەش، پەیدا ببوو. لە هەندێ بۆنە دەگەیشتە ترۆپکی هەست لای هەر دوولامان، کە ئەمە لای برادەرایەتییەکی رووت

(داماڵڕاو) ناکرێت درکی پێبکرێت. ئەو پەیوەندییە، بە گوێرەی پێویستی سروشتی شتەکان، نەیدەتوانی بۆ دوای نەمانی ئەو حاڵەتەی کە بۆتە هۆی پەیدا بوونی بەردەوام بێت. لەو ماوەیەی کە ئەوانەم هەمووی بە سەرچاوەی هێز بۆ ئیدارەی مەدەنی دەزانی، هیچ بەرژەوەندییەکی تایبەتیم تێدا نەبوو، بەڵام زۆر خۆنەویستن و هەست کردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر عێراق نەوەك بەریتانیای مەزن و دڵسۆزی بۆ ئەو راسپاردە نوێیەی کە بە دەرەنجامی جەنگ وەئەستۆمان دراوە.

ئەمەش نەریتی سوپای کۆنە، لە خزمەتی نوێی سەربازی جێبەجێکراوە. ئەو یەك ئامانجییەی کە وای لە گرووپە بچووکەکانی حاکمە سیاسییەکان دەکرد، لە شوێنی دوور کار بکەن، کەمتر کاریگەری بە سەر دەروونەوە هەبوو. زۆربەی جار ئەفسەرانی دەزگاکان، ئەوانەی تازە گواسترابوونەوە لە دۆزینەوەی شوێنی گونجاو لە نێوان چینی فەرمانبەرە لۆکاڵییەکاندا، سەختییان دەدیت، بەڵام پرۆسەی هەموارکردنی ئاسایی و چەورکردن و هەندێجار گۆڕینەوە، بۆ دووبارە گونجاندن، بەس بوو. ویلایەتی موسڵ[1] دامودەزگای جۆراوجۆری تێدا نەبوو، حاکمە سیاسییەکەی، تاکە دەسەڵاتی لیواکە بوو، بۆیە رێژەیەکی گەورەتر لە بەرپرسیارێتی لەئەستۆدا بوو. کاپتن (هەی) لە کتێبەکەیدا باسی لەو گواستنەوانە کردووە کە بە سەریدا هاتوون، بۆ پارێزگاریکردن لە مانەوەی لە هەولێر، تا گەیشتنی سوپا لە موسڵەوە. سوپا لە ١٤ی ئەیلەل گەیشت[2] و خوشی بە لایەنگرانمان (ئەحمەد ئەفەندی خورشید ئاغا) بەخشی.

---

١- رەوشی ویلایەتی موسڵ تا کۆنگرەی ئاشتی کۆتایی پێ نەهات، یەکلایی نەبووە، ئیدارەیەکی تایبەتی بە شێوەیەکی کاتی بۆی دیاریکرا بوو سوپا لە ١٤ی ئەیلول گەیشت و خۆشی بەخشی بە لایەنگرانمان (ئەحمەد ئەفەندی و خورشید ئاغا).

٢- لە رێگەی کەلەکەوە هێزی سوار چاك دەتوانێ لە ماوەی ٤٨ سەعات بگاتە شاری هەولێر، بەڵام ژەنەراڵ هۆڵدین هیچ کارێکی وای نەکرد، تاکو هۆکاری ئەو دواکەوتنەی کە خوریك بوو گیانی ئەفسەرانی بەریتانی لە هەولێر و دانیشتوانە لایەنگرەکەی بکاتە قوربانی، روون بکاتەوە. تەنها

ئەحمەد ئەفەندی بۆ ماوەی دوو ساڵ لە پۆستی سەرۆکی شارەوانیدا مایە، خۆی سەراپا بۆ خێر و خۆشی شارۆچکەکە و پارێزگاریکردن لە چینە هەژارەکان لە ستەم و چاوچنۆکی خاوەن زەوییەکان تەرخان کرد، ئەو خەڵکانەی کە گرنگی پێدەدان، لە خاوەن پیشە و دوکاندار و بێ دایك و باوك و بێوەژنان، وای دەبینین کە خەریکن دووبارە دەکەونە ناو چالاییی نەهامەتی کە دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی لێی دەرچوون. هەرچی خورشید ئاغا بوو، هەر بە زگماك سەرکردەیەکی کەللەڕەق بوو، ئەو پارێزگاری لەو بەڵێنەی کە لە سەر دەستی ئیبراهیم ئاغا (ئەو کات لە سەرەمەرگدا بوو) سەبارەت بە پاڵپشتی کردن لە حکوومەتی نوێ بۆ بەرژەوەندی دانیشتوانە کوردەکان دابووی، کرد. کاپتن (هی) لە بارەی ئەو نووسیویەتی و دەڵێ: ((لە هیچ تاکێکی کوردم نەدیووە، ئەو جەسارەت و یەك ئامانجییەی هەبێت، کە خورشید ئاغا لەو رۆژە رەشانەدا لە خۆی نیشانی دەدات. هیچ پەشێوییەکی دیکە لە لیوای هەولێر رووی نەدا، نەهامەتی و وێرانکاری کە شۆڕشەکان بەدوای خۆیاندا دەهێنن، بە هۆی ئازایەتی و نەبەردی و هێزی دوو پیاو (هی و لیتڵ دێڵ) و گرووپە بچووکەکەیانەوە لە یارمەتیدەرانی بەریتانی و کوردەکانەوە، هەولێر بە دوور بوو لێیان.

## رەوشەکە لە سلێمانی

کاتێ لە مانگی ئەیلول سەردانی سلێمانیم کرد، رەوشەکە ئارام بوو، ئەو پەندەی کە ساڵی ١٩١٩ وەریان گرتبوو کاریگەری خۆی هەر مابوو، بەبێ ئەوەی لە بیربکرێت[1]. هەرچەندە مێجەر سۆن سوپایەکی لە ژێر دەستدا نەبوو کە پاڵپشتی

---

ئەوە دەڵێت کە ((ناوچەکە رووی لە ئارامی کرد)) کاتێ سوپا گەیشت ئەوە لە بیر خۆی دەباتەوە کە رەواندوز هەرگیز داگیر نەکرایەوە، ئەمەش وایکرد رێگای بە دەست خستنەوەمان نەبێت و سلێمانیش ببێتە شانۆی نیگەرانی نوێ، لە کاتێکی دواتردا. نووسەر

١- مەبەست لە پەندی ساڵی ١٩١٩، ئەو هەڵمەتە بوو، کە ژەنەراڵ فریزر کردیە سەر شێخ مەحموود و لە دەربەندی بازیان بە سەری سەرکەوت و بە دیلی گرت. بۆ بەستی پێنجەم (هەڵکەوتی دەربەند) بگەڕێوە.

بکات، بەڵام خـۆی و یاریـدەدەرە لیهاتووەکـانی لـە بـەڕێوەبردنی کاروبارەکانیـان ڕێچکەیەکی هاوسەنگی ماقوڵیان گرتەبەر. کە هەولێر بووە خۆراکی دزی و تـاڵان، نەدەتوانرا پارێزگاری لە رەوشەکەی لای خۆیان بکەن. چەندی ئاماژەکانی روخساری حکوومەت، بۆ خەڵکی دیار بێت لەوێ و لە کەرکوك، ئەوەنـدە سـەرۆك هۆزەکـان دەیانتوانی چارەسەری کێشەی ئاژاوەگێرە شوێن گۆڕەکان بکەن. زۆرێك لەوانە لێرە و لەوێ شوێنی خۆیان دەگۆڕی لەو ماوەیەدا. هەندێك لەوانە سـیخوری بەلشـەفیك بوون، لەژێر پەردەی بەرگری کردن لە مافەکانی مرۆڤ دڕندەترین رقیان لەبەرامبـەر بیانییەکان کـۆدەکردەوە. ئەوانـە بـە شـێوەیەکی تایبـەت پشـتگیرییان لـە یاسـا دەرچووەکان دەکرد , ئەوانە توانییان ئەو ئامرازانە ئامادە بکەن، کـە بـە هۆیـەوە چەك و جبەخانەی تورکیـان بـە بڕێـك کـە بـە کـەم ناگرێـت، بەدەسـت بهێـنن و بازرگانییەکی قازانج بەخشیان پێکهێنا.

هەروەها ئەوانی دیکە، لە شوێن کەوتوانی شێخ مـەحموود، کـە هیواخوازبـوون بـە گەڕانەوەی دەسەڵات سودێکیان پێ بگات، بەڵام سەبارەت بە لاگیریان، یـان ئارەزوویـان بۆ دەسەڵات بەدەستەوە گرتن و دزی و تاڵان و تۆڵە سەندنەوە، ناکرێت هیچ شتێکی لـە بارەیەوە بگوترێت، دەتوانرا لە نێـو هۆزەکـانی (هەماوەنـد) کـە هـۆزێکی زۆر ئـازا و ڕێگرە، ئەو هـۆزە شـانازی بـەوەوە دەکـات کـە گـورگی کوردسـتانن، ئـەو هـۆزە لـە هاوشێوەکانی لە فلێکردن و سەختی مامەڵەکردن لەوانی دیکە کەمتر نەبوون.

## کوردەکانی موسڵ

شێخانی نەقشەبەندی[1] هەمان ڕێچکەی نەقیبی بەغدا و خانەوادەکەیان گرتەبـەر، هەموو قورسایی خۆیان خستە تای تەرازوو، بۆ بەرژەوەنـدی ئیـدارەی نـوێ، فـەزلی

---

١- سوننەی شافعی بە شێوەیەکی گشتی بۆ سەر دوو تایفە دابەش دەبن ١- نەقشبەندی ٢- قادری نەقشبەندییەکان شوێنکەوتووی شای نەقشبەندی (الیاس شاه بوخاری) ن، لـەو خەلیفانـەی کـە لـە

ئەمەش بە پلەیەك بۆ خۆیان لە دابین کردنی ئاشتی و ئارامی لـە مـاوەی سـالێکدا، دەگەڕێتەوە. هەروەها بۆ ئەو ڕێوشـوێنە تەمبێکارییانـەی کـە لـە مـاوەی هـاوینی رابردوو بە پلەی یەکەم و بۆ جۆری ئیدارەی لۆکالّی دەگەڕێتەوە.

هـۆزە کوردییـەکانی، ئەوانـەی لـە رۆژهـەلاّتی موسـلّ و بـاکووری رۆژهـەلاّتی نیشتەجێن، نیگەرانییەکی زۆریان بۆ دروست کردین، بەلاّم ئەوانیش لـە مـاوەی سـالّی ۱۹۱۹ پەندیان وەرگرتبوو، ناوچەی ئاکرێ جگە لە عەشـیرەتی سورچـی هـۆزی دیکـە شۆڕشیان رانەگەیاند. بە هێنانی رەتلێکی سەربازی لە موسلّەوە لـە میانـەی هەفتـەی دووەمی مانگی ئەیلول، چارەسـەری کێشـەکەیان بـە شـێوەیەکی ناکاریگـەر کـرا، تـا ئەوکاتەی (٦٠٠) چەکداریان هێرشیان کـردە سـەر خێوەتگایـەکی ئاشـوورییەکان، کـە دەکەوێتە دووری ۳۰ میل لە باکووری رۆژهـەلاّتی موسـلّ، بـە تـەواوی تێکنەشـکان. ئاشورییەکان، زۆر دانیان بە خودا نەگرت، هەرچەندە سورچییەکان ژمارەیان زیاتر بـوو، بەلاّم (٦٠) هێـرش بـەریان سـەربڕی و ئـەوانی دیکەشـیان ناچـار کـرد بـۆ پشـت زێ بکشێنەوە، کە (١٤٠) کەسیان غەرقی ئاو بوون[1]. ئەمـە لـە کاتێکـدا، ئاشـوورییەکان

---

دوازدە ئیمامەکە کەوتوونەتەوە، شێخانی ئێستایان لە نەوەکانی ئـەوانن. هەرچـی قادرییـە شـوێن کەوتووی رێساکانی (شێخ عەبدالقادر گـەیلانین) کـە گۆرەکـەی لـە بەغدایـە، نەقیبـەکانی بەغـدا راستەوخۆ لە نەوەکانی ئەو شێخەن. نووسەر

١- مەبەستی لە هێرشی سورچییەکانە بۆ سـەر سـەربازگەی (جـوجر) لـە ١٥ی ئـەیلولی ١٩٢٠. ئینگلیز ئاشورییەکانیان بە تەواوی چەکدار کردبوو دواتر فڕۆکەکانی ئینگلیز لە میانـەی هێرشـەکە بۆ بەهانەوە چوونی ئاشورییەکان هـاتن، شـەهیدەکانی هـەر دوو لا نزیکـەی (٤٠بـە٤٠) دەبـوون. سورچییەکان لە زۆر شوێن پەلاماری ئینگلیزیان داوە لە ٢ی نیسانی ١٩٢٠ شێخ رەقیب پـەلاماری هێزێکی ئینگلیزی لە نزیك گوندی (مام خەلیفە) دا و ژمارەیەکی زۆری لێکوشتن، لە یەکی ئـەیلول هێرشیان کردە سەر باتاس و سەرجەم حامیەکەیان کوشت، دواتر کـاپتن (لیتـلّ) لـە هـەولێرەوە بـە هێزیکەوە بۆیان هات و لە شەڕێکدا ژمارەیەکی زۆریان لە هێزەکە کوشت، ئەمەش هانی دان لەسەر شەڕ بەردەوام بن، بۆیە هێرشیان کردە سەر رەواندوز.

تەنها چوار کوژراو و هەشت برینداریان دا[1]. لە پرۆسەکانی تەمبێکردن، لەمیانەی هەڵمەتەکاندا لە ساڵی ١٩١٩-١٩٢٠ بەڕێوەدەچوو، کوردەکانی باکوور گەورەترین زیانیان لەبەرامبەر سوپای نیزامی، بەرکەوت. ژەنەڕاڵ هۆڵدین دەڵێت ((ئەگەر ئەو پاڵپشتییە نەبایە کە بە ڕێکەوتێکی تەواو بۆمان هات، لەوانە بوو تەواوی ناوچەی موسڵی تووشی نائارامییەکی بێ کۆتا دەکرد)). پێ دەچێ مەسەلەکە وابێ، بەڵام پاڵپشتی ئاشوورییەکان، بەرێکەوت نەبوو، چونکە پێشتر چەکدار کرابوون و لە سەر پێشنیازی ئیدارەی مەدەنی مەشقیان پێ کرابوو، دواتر سەرکردایەتیکردنیان درابووە دەستی ئەفسەرانی بەریتانی، ئەگەر دەسەڵاتی مەدەنی نەتوانی بۆ یارمەتیدانی هەولێر یان بۆ پارێزگاریکردن لە سیستەم لە ناوچەی موسڵ هانا وەبەر ئەو هێزەی ئاشوورییەکان بەرێت، کەواتە ئەوانە لە ژێر کۆنترۆڵی خودی سەرکردەی گشتی دابوون. پێ دەچێ ژەنەڕاڵ هۆڵدین هەروەك (وباینگتۆن) لە شەڕی واترلۆ بەشێك لە هێزەکانی لەیاد چووبێ، بۆیە دەبینین هانا بۆ ڕێکەوت و بەخت دەبات، لەو کارە کە هۆکارە ڕاستەقینەکەی، کورت بینی کوردە سورچییەکان بوو لە هێرش کردنە سەر سەربازی کەم جوولە و ئامادەباش بۆ بەدیهێنانی بیروباوەڕەکەی بەبێ ئەوەی چاوەڕێی ڕێنمایی تایبەتی بارەگای گشتی سوپا بکات، کارەکەی خۆی ئەنجام دەدات. ئەو گورزە کوشندەیەی ئاشوورییەکان کە لە ساتێکی هەستیار دا هات، گرنگییەکی گەورەی هەبوو. هیچ تەقینەوەی دیکە رووی نەدا، وایکرد ژەنەڕاڵ هۆڵدین ئاوڕ لە ناوچەکانی فوراتی ناوەڕاست و دیالە بداتەوە و جەختیان لە سەر بکاتەوە، کە دووبارە سەرنجی خوێنەریان بۆ رادەکێشین.

## لیجمەن و ناوچەی دلێم

تا رۆژی دوانزدەی ئاب هیچ باخیبوونێك لە نێوان بەغدا و رومادی یان لە فوراتی دەوروبەری فەلوجە، رووینەدا. عەلی سلێمانی شێخی دلێم هەر بە خۆڕاگری مایەوە،

---

١- بۆ کتێبەکەی هۆڵدین، لاپەرە ٢٤٧ بگەڕێوە، نووسەر.

عەشیرەتی زەوبەعیش بە سەرکردایەتی شێخ زاری بە کەللەڕەقی مایەوە، بەڵام ڕۆڵێکی ناچالاکی هەبوو. لیجمەن لە یازدەی ئاب بە ئۆتۆمبێلێك بۆ تاوتویکردنی ڕەوشەکە، هاتە لام، ئەو زۆر دڵنیا بوو لەوەی کە هیچ پەشێوەییەکی ترسناك لە نێوان بەغدا و فەلوجە یان لە باکووری بەغدا روونادات، تا عەلی سلێمان دەسەڵاتی بە سەر دلێم دا بمێنێتەوە. لە دەوروبەری سەعات یازدەی بەیانی رۆژی دووەم، لای من رۆیشت و دەیگوت لە سەعات ٣ دەگەمە فەلوجە. بە بروسکە رەوشەکەم بەوردی بۆ باس دەکات. دواتر گوتی بە شێخ زاریم راگەیاندووە کە لە ( خان نوقتە) چاوم پێ دەکەوێت، خان نوقتە، کەوتۆتە ناوەڕاستی رێگای نێوان بەغدا و فەلوجە، داوای کرد چاو لەو ماوەیە بپۆشرێ کە بۆ شێخ زاری دانراوە تاکو پێشینەی کرێنی تۆی پێ بدات،کە ساڵی رابردوو وەریگرتبوو. بەڵام ئەوەی لە چاوپێکەوتنەکەدا روویدا، ئەوا سێر ئەیلمەر هۆڵدین لە کتێبەکەیدا (لاپەرە ١٧١) بەم شێوەیە باسیکردووە:

((.... لە سەعات ١٢/٣٠ بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی، کە تەنها خزمەتکارێك و شوفێرەکەی لەگەڵدا بوو بەرەو خان رویشت، لە دەروازەی خان چاوی بە زاری کەوت، تا سەعات ٢/٠٠ بەردەوام گفتوگۆی کاروباری بەروبووم و باجەکانیان دەکرد، هەر لەو سەعاتەدا بوو، ئۆتۆمبێلێك کە کۆمەڵێ عەرەبی هەڵگرتبوو، گەیشتە خان. باسکرا، کە ئەوانە لە دووری دوو میل بە ئاراستەی بەغدا راوەستێنران و تالان کران، دەرحاڵ، لیجمەن ئەفسەرێکی (شبانە) و دە پیاو لەگەڵ پێنج پیاوی زەوبەعی بۆ دەستگیرکردنی دزەکان دیاریکرد، بەڵام فەرمانی بەو کۆمەڵەیە کرد، کە زیاتر لە دوو میل لە خان دوور نەکەونەوە. لە میانەی رۆیشتنی کۆمەڵەکە، زاری و پیاوانی دوای گفتوگۆیەکی گەرم، خانیان جێهێشت. لە سەر ئەوەی گوترا، گفتوگۆکە لەبارەی ئەو رووداوی دزییە بوو، کە زەوبەع بە بەرپرس تێدا دانرا. بەڵام هێندەی پێ نەچوو زاری گەڕایەوە و داوای لە پاسەوانەکە کرد، کە رێگەی پێبدات بۆ قسەکردن حاکمی سیاسی بینێ فەرمانی رێگەدانی پێدرا، لەو کاتەدا دوو لە شوێنکەوتوانی زاری کە یەکێکیان (سلێمان)ی کوڕی بوو، هەڵسان تەقەیان لە لیجمەن کرد و زۆر بە سەختی

برینداریان کرد، کاتێ بە برینداری بە سەر زەویدا کەوت، زاری لێی هاتە ژورێ و لیجمەن لێی پرسی بۆچی فەرمانی تەقەکردنی دەرکرد، لە کاتێکدا من پێشتر هەرگیز ئازاری تۆم نەداوە؟! بەڵام زاری شمشێرەکەی دەرهێنا و کوشتی[1]... کۆتایی هات.

مردنی لیجمەن بۆ کەسایەتی من گورزێکی بەهێز بوو، چونکە من هەر لە ساڵی (١٩٠٤)ەوە دەمناسی و لەوەتەی نیسانی (١٩١٥)ەوە پەیوەندی توندمان بە یەکەوە هەبوو، لیجمەن کەسایەتییەکی دیاری هەموو ئەو ناوچانەی عێراق بوو، کە بەزمانی عەرەبی قسەیان دەکرد.

ناوەکەی ئازایەتییەکی شەخسی هەبوو، نەرمی لە جولانەوە و ناسینی ئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات لە خەڵك، لای عەرەبەکان شتێکی ئاشنا بوو، تا وایلێهاتبوو، هەر هۆزێك لە هۆزەکانی دیجلە ناوی منداڵەکانیان بە ناوی ئەوەوە دەکرد. مردنیشی ئاماژە بوو، بۆ رووداننی زنجیرەیەك رووداوی یاخیبوون لە ناوچەی فوڕات لە نێوان فەلوجە و هیيت، لەوانەیە ئەمە ئەوەی لە شەهرەبان کە دوای چەند رۆژێ روویدا، خێرا کردبێ. چەند رەتلێك سەرباز بۆ تەمبێکردن لە مانگی ئەیلول هێنرایە شوێنەکە، هەروەك ئەوەی لە کتێبەکەی هۆڵدین بەوردی باسکراوە. بەڵام ئێستا ئەوا (٨) ساڵ بە سەر رووداوەکەدا تێ دەپەڕێ بە بێ ئەوەی شێخ زاری دەستگیر بکرێت، تا شوفێرە عەرەبییەکەی کە دەیزانی هێشتا خەڵات بۆ سەری شێخ زاری هەیە، بە گرتنی دا. لە بەندیخانە مرد، لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ دڵی وەستا، ئەمەش دوای ئەوەی ((دادگای گەورە)) دوو رۆژ بەر لە مردنی، بەندی هەتا هەتایەی بۆ دەرکرد. ناشتنی تەرمی ناوبراو بووە، بۆنەیەك بۆ سازکردنی خۆپێشاندانێك کە نزیکەی هەشت هەزار خەڵك بەشدارییان تێدا کرد. لاشەی لیجمەن بۆ لەگۆڕنان برایە فەلوجە، بەڵام لە گورستانی سەربازی لە بەغدا نێژراوە.

---

١- بۆ لاپەرە (٤٩-٥٥)ی کتێبی ((شێخ زاری)) سەبارەت بە چیرۆکی رووداوی کوشتنی ((لیجمەن)) هەروەك سلێمان زاری دەیگێڕێتەوە، بگەڕێوە.

## پەرەسەندنە نوێکانی شۆڕش لە سەماوە

پەشێوییەکان ئێستا بە دوای یەکدا، خێرا و چڕ ڕوودەدەن. هەوڵەکانی دەستگیرکردنی سەرۆکی بزووتنەوەکان لە بەغدا، سەری نەگرت، جڵەوەکە لە دەست دەرچوو بوو. لە ١٠ی ئاب کەشتی گەلی بەرگری (گرین فلای Greenfly) لە فوراتی خوار و لە دووری (٥) میل لە باکووری (خەزەر) وەستا، بەڵام ئەو هەوڵانەی کە بۆ دەرهێنانی لەو تەنگژەی تێکەوتبوو، بێ سوود دەرچوو، ئەگەر دەستبەرداری کەشتییەکە ببوونایە و کەشتیوانەکانی بگوازرابوایە، ژیانی زۆر کەس رزگار دەکرا، بەڵام رای دیکە بە سەر کێشەکە زاڵ بوو. کاتێ کاتەکەی دواکەوت، هەوڵ و ماندبوونەکان بۆ رزگارکردنی کەشتیوانەکان ئەنجامێکی سەرکەوتووی بەدەست نەهێنا، لە کۆتاییدا کەشتیوانەکان ناچار بوون خۆبەدەستەوە بدەن، لە ٣ی تشرینی یەکەم لە لایەن عەشایەرەکان کوژران. ژەنەراڵ هۆڵدین نووسراوێك بە مێژووی ٣٠ی ئەیلول، لە لاپەرە ٣٢٧ی کتیبەکەیدا لە زاری کاپتنی ((گرین فلای)) مولازم (ئەی. سی. هیجر)، گواستۆتەوە، هیجر کە سەر بە دائیرەی گواستنەوەی ئاوی بوو، هەر دێڕێکی ئەو نووسراوە هەناسەی ئازایەتییەکی بێ وێنەی لێ دەهات. سێر ئەیلمەر هۆڵدین دەڵێت: ((... ئەوان لەو گەرمییەی هاویندا نقوم بوون، کە تەحمول نەدەکرا، جگە لە ئاوی گەرم و لێڵی رووبار نەبێت هیچیان نەبوو بیخۆنەوە، بەبێ ئەوەی ئاگایان لەوە بێت هەموو هەوڵەکان بۆ رزگارکردنی ئەوان دەدرێت، ئەوان لە سەرەخۆ لە برسان دەمردن، چارەنووسی ئەوانەی لەسەر پشتی کەشتییەکە بوون، بەم شێوەیە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەی کەشتییەکە ٣ رۆژ بەر لە کۆتایی، نووسیویەتی و دەڵێت: ((هەموو ئەوانەی لە کەشتییەکەدا بوون، بەراستی ئەو نرخاندنەی کە سەرکردەی گشتیم (ئەمیر هیوز— سەرۆکی دائیرەی گواستنەوەی ئاوی) کردی، بەرز را دەگرن و سوپاسی دەکەین، لەبەرامبەر رێزگرتن لەو ئەرکەی کە ئێمە پێی هەڵدەستین، ئێمە ئەگەر پێشتر بەرگەمان گرتبێ، ئێستاش بەرگە دەگرین تا سوپا دەگات، ئەوەی زۆر دڵمان پێی خۆشە، ئەوەیە کە دەزانین یارمەتی بۆ ئێمە لە رێگادایە. دەکرێت خۆڕاگر بین، زیاتر خۆڕاگر دەبین چونکە دانیشتوانی گوندی (باب) دوستی ئێمەن، بە مەرجێ خۆراکمان

چنگ کەوێت و تووشی زیانی گەورە نەبین. سەرلەنوێ حەز دەکەم ئەوە بڵێم کە ئێمە بە دڵ و بە گیان (هەر چەندە ئێستا ئێمە هێزمان نییە) خوازیارین، تا درێژترین ماوە لە شـوێنی خۆمان خۆڕاگر بین تا کۆتایی. ئێمە هەر هەمووومان سوپاسی حامیە دەکـەین، سـەبارەت بەو هەستە ناسکەی بەرامبەر ئێمەی پیشـاندا، هیـوادارین لـە نزیـك تـرین کاتـدا هـەر هەمووتان ببینین)).

هەر چەندە، هێشتا دەقە رەسەنەکەی ئەو نووسراوە ماوە، بەڵام من هیوادارم کـە رۆژێـك لـە رۆژان ئـەو نووسـراوە شـوێنی گونجـاوی خـۆی لـە نێـو ئەرشـیف یـان بەرووخراوەکانی پۆلی ئەندازیارانی پاشایەتی ببینێتەوە — ئەو نووسراوە شایەنی ئـەو ناوبانگەیە کە سکوت لە جەمسەری باشـوور بـە دەسـتی هێنـا، هـەروەها باشـترین بەڵگەیە، ئەگەر پێویستی بە بەڵگە هێنانـەوە بێـت، ئـەو گیانـەی کـە لـە میانـەی جەنگدا هێزی بە پیاوان دەدا لە هاندانی ئەرکیان بۆ خەبات لە دژی دڕندە تینووەکان بۆ خوێن بکەن، بەردەوام بوو.

هۆزی (ئەلجەوابر)، کە بەرپرسە لـە کوشـتنی کەشـتیوانانی ((گـرین فـلای))، دوو ئەفسەری هێزی ئاسمانی پاشایەتیشیان کوشت، کە لە ۲۲ی ئەیلول کـاتێ دەیانەویسـت خۆراك لە ئاسمانەوە بگەیەنتە ئـەو کەشـتییەی کـە بـە لەناوچـوو حـوکم درا بـوو، لـە ئاسمانەوە کەوتنە خوارەوە، بە خوێن ساردی هەر دووکیان کوشـتن. چـەندی لـە کۆتـایی مانگی ئاب نزیك دەبووینە، رەوشی سەماوە، دەبووە مایەی نیگەرانییەکی مەترسیدار، هێرش کرایە سەر کاروانێکی ئاویی (رووبار) کە پێداویستی لە ناسـرییەوە بـۆ سـەماوە دەگواستەوە، کەشتی ((ئایس ناین)) لە کەنار لایـدا و دواتـر دەسـتی بەسـەردا گـیرا، ئینجا سـووتێنرا و کەشـتیوانەکانی سـەربڕان. هـەروەها (دوبـە)یـەك کـە جبەخانـەی هەڵگرتبوو، کاتێ لە سەماوە نزیك بووە، راگیرا، بەڵام تەواوی کاروانەکە بە سـەلامەتی گەیشتە ئامانجی خۆی. لە ۳ی ئەیلول عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر شـەمەندەفەرێکی چەکدار لە نزیك سەماوە، پێش ئـەوەی بگاتـە حامیـە. شـەمەندەفەرەکە دەسـتی بـە سـەرداگیرا و سـەرجەم ئەوانـەی تێـدا بـوون کـوژران، کـە زۆربـەیان لـە لیـوای ۱۰ی

(هودسن)ی سوارچاك بوون. ژەنەراڵ هۆڵدین لە پەرتووکەکەیدا (لاپەرە ۲۰۸) وەسفێکی زیندووی ئەو پرۆسەی کردووە کە بە ئازایەتی جەنگان تا مردن لە بەرامبەر زۆرینە زۆر، ناسراوە. سەرکردەی ئەو مەفرەزەیە (کاپتن ئۆو رسلّ) و (کاپتن جی. ئێس هندرسۆن) تا پێش چەند هەفتەیەکیش سەبارەت بە ئەگەری پەیوەندیکردنیان بە ئیدارەی مەدەنییەوە، لەگەڵ مندا یادداشتمان ئاڵوگۆڕ دەکرد. (رسلّ) تا کۆتایی پاڵەوانانە جەنگا. کەم پیاو هەن، کە بتوانن گیانیان لە میانەی جەنگەکاندا بەگرانتر لەوەی کە ئەمانە لە شەڕێکی دوو سەعاتی یان سێ سەعاتی فرۆشتوویانە، لەگەڵ ئەوانەدا کاپتن (پێجۆن) کە سەر بە پیاوانی خزمەتگوزاری پزیشکی هیندی بوو، هەبوو، ئەو پیاوە پارەی نەختینەی لە جۆری (۱۰ روپیە)ی لە شەمەندەفەرەوە فڕێدایە دەرێ، کاتێ شەڕەکە خەریك بوو کۆتایی پێ بێت و عەرەبەکانیش بۆ هەڵگرتنەوەی پارەکە ئەوەندە یەکتریان پاڵدا، ئەویش چەند بۆمبێکی لە نێوانیاندا تەقاندەوە، ژمارەیەکی لێکوشتن و چەندینی دیکەشی پەك خست. ئەو نەبەردییەی کە ئەو پیاوانە و سوارچاکانی هیندی نواندیان، لە هەرێمی فوڕات دوای ئەوەی هۆکارەکانی شۆڕشەکە سەردەمیان بە سەردەچێ، لە بیردەکرێت، هەر باس دەکرێت.

## هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکە لە دیالە

کەمتر گرنگی سەربازی بەو بزووتناوانەی دوایی کە لە باکووری رۆژهەڵاتی بەغدا روویدا، دەدرێت. هەرچەندە رووکەشانە گرنگی پێدراوە و ناوبانگێکی فراوانی دوای ئەو رووداوەی کە لە ۱۲ی ئاب لە نزیك باقوبە روویدا، پەیدا کرد. بەڵام ئەو هێزەی کە لە بزووتنەوەی فوڕاتدا هەبوو، لەوێدا نەبوو، ئەو بزووتنەوەیە ئەو رەگەزە هێزەی نەبوو، کە ئەفسەرانی شەریفی نوێنەرایەتییان دەکرد، ئەفسەرانی شەریف بەو بەخشینانەی کە حکوومەتی بەریتانی بە حکوومەتی سوری دەدا پشت قایم بوون، بۆیە شۆڕشەکە لەو دەڤەرانە لاواز و پەرتەواز بوو، هۆزەکان کەمتر کاری رێکخراویان لە نێوان دا هەبوو، خەڵکانی ئەو ناوچەیە کە حکوومەتی بوونی خۆی لە دەست دەدا، دەستیان دەکرد بە

تالان و بڕوی مالوێرانکەر کاتێ هێزێکی بەڕێز لە بەرامبەر هێزی ئۆپۆزسیون دەرکەوت، ئۆپۆزسیون راستەوخۆ لەناوچوو. لە مانگی ئەیلول باقریە و شەهرەبات و دەلتاوە بە بێ هیچ سەختییەك دووبارە داگیرکراوە. کاپتن (لویدی حاکمی سیاسی دەلتاوە، دەستبەسەر کرا، بەدیل لە لایەن شێخەکانی ناوچەکە دانرا ئەو شێخانەی کە (سوپا گەیشت سزای پێویستی خۆیان وەرگرت)، ئەمەش ژەنەڕاڵ هۆڵدین لە کتێبەکەیدا (لاپەرە ١٦٨) ئەمەی باسکردووە. سەختە بە رستەیەك جیاوازی نێوان ئەو لیبوردەیەی کە لە شەهرەبان کرا، بە هۆیەوە فەرمانبەرە بەریتانییەکان کوژران، لەگەڵ ئەو توندوتیژییەی کە رەتلە تەمبێکارییەکەی پارێزەری (حماه) کاپتن (لوید) و رزگارکەرانی ئەنجامیاندا بکرێت — خۆشبەختانە خاپور کردنی تەواوی دەلتاوە وایکرد پاڕانەوە کاریگەر و بەهێزەکانی ئەفسەری کشتوکالی، کە بە سیفەتی سیاسی باوەری سوپا بوو، سەری نەگرت.

هۆڵدین لە وەسفکردنی ئەو بزووتنەوانەی لە باکووری رۆژهەڵاتی بەغدا هەبوو، چیرۆکی ئەو ئەفسەرە دکتۆرەی کە شۆڕشگێڕان لە خانەقین بە دیلیان گرت، پشتگوێ خستووە. دواتر سوپا رزگاری کرد و راستەوخۆ دەستبەسەری کرد دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە بەندی مایەوە، بە بلاوکەرەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لە رێگەی نووسینی نووسراوێکی بە زۆرە ملێ، تۆمەتبار کرا. نووسراوەکە بێ ناونیشان بوو، هەروەها نەگەیشتبووە شوێنی مەبەست، هیچ شتێکی وای تێدا نەبوو کە مایەی ترس بێت. لە دادگای لێکۆلینەوە حوکمی بێ تاوانی وەرگرت، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێك لە شاهیدە سەربازییە گرنگەکان ئامادە بن.

## ڕووداوەکانی شامیە و کوفە

ئێستا هەرئەوە ماوە کە ئەو ڕووداوانەی کە لە کوفە ڕوویاندا تۆمار بکەین، کوفە لە ٢٠ی حوزێراندا دەورە و گەمارۆ دراوە. لەم بۆنەیەدا سوپاسگوزاری مێجەر (نوربەری) دەکرێت، چونکە توانی برێکی زۆر لە خۆراك و بژێوی لە ناوەخۆ بۆ ماوەی گەمارۆکە بەدەست بخات، بەمەش بوار بۆ ژەنەڕاڵ هۆڵدین رەخسا چارەسەری بارە

سەربازییەکە لە سەرەخۆ بکات[1]. ئەگەر ئـەو شکسـتە یـەك لـە دوای یەکانـەی کـە تووشی هێزە سەربازییەکانمان بوون، لە باشووری حیللە و دواتر لە رومیسە و سەماوە نەبوایە، ئەوا هۆزەکانی ناوچەی شـامیە شۆڕشـیان نـەدەکرد، هـیچ سـتەمێکیان لێ نەکرابوو، تا گازاندەی لێ بکەن، ئیدارەی مەدەنی بە شـێوەیەکی گشـتی و ئەوانـەی نوێنەرایەتی ئەو ئیدارەیەیان دەکرد و مێجەر (نوربەری) و کاپتن (مان) بـە تایبـەتی رێزلێگیراو و خۆشەویستیش بوون.

ئەوانەی بەر ئەم دوو ئەفسەرە (بەلفۆر و ینگیت) دەسەڵاتی خۆیان بە ئاقلانە و باشی بەکارهێنا، هەروەها ئەو سزایەی کە لە بڕی کوشـتنی (کـاپتن مارشـاڵ) بەسەر نەجەفدا درا، هێشتا لە زەینی خەڵکی تازە بوو. تاکە خـەمی ئەفسـەران نەبوو، کـە کـارێکی وا بکـەن پەشـێوەییەکی چـالاك بـەرپا نـەبێت، لەمەشـدا سەرکەوتوو بوون. مێجەر (نوربەری) لـە نەجەفـدا دەسـەڵاتێکی کـەمی نـەبوو، خەڵکی لە رۆژی ٢٢ی حوزێرانـدا، بـە هێمنییـەکی چـاوەڕوان نـەکراو هـەواڵی دەستگیرکردنی (میرزا محەمەد رەزا) کـوڕی موجتەهیـدی گـەورەی کەرەبـەلایان بیست. لە یەکی حوزێراندا مێجەر (نوربەری) رێوشوێنی کۆبوونـەوە بـە گـەورە سەرۆکەکانی (ئەلفەتلە)ی لە بارەگای سەرۆکەکەیان (شـێخ لـەتیف) رێکخسـت. کۆبوونەوەیـەکی یەکلاکـەرەوە نـەبوو، چـەند کەسـانێك بـەر لـە کۆبوونەوەکـە خۆپیشاندانێکی دوژمنکارانەیان رێکخستبوو.

لە ٥ی تەموز کۆبوونەوەیەکی دیکە لـە نێـوان کـاپتن (مـان) و (شـێخ مـەرزوق ئەلعەداد) شێخی (ئەلعەوابد) گریدرا، کە زەوییەکانی ئەم شێخە دەکەوێتە تەك (ئـوم بەعرور)، ئەم کۆبوونەوەیەش هیچ ئەنجامێکی نەبوو. قسەیەکی ئەو کۆبوونەوەیە، کە بەڕێز عـەلوان (ئەلیاسری) گوتوویەتی، دەورژێنرێت، بـەم قسـەیە، خواسـتی زۆرێـك کەسی دربڕیووە: ((سـەربەخۆیتان بـە ئێمـە نیشـاندا، کـە ئێمـە هـەرگیز داوامـان

---

١- هۆڵدین، لاپەرە ١٤١ و ١٦٨.

نەکردبوو. ئێمە خەونیشمان پێوەی نەدیتبوو، تا ئێوە ئەو بیرۆکەیەتان خستەمێشکی ئێمەوە. ئێمە لەوەتەی سەدان ساڵە بە شێوەیەکی وا دووربووین لە سەربەخۆیی، کە ناکرێت مەزەندە بکرێت. ئێستا ئێمە هاتووین داوای سەربەخۆیی دەکەین، ئێوەش بەندمان دەکەن[1]....))

بەڕای من و ئەوانی دیکە بەخشینی سەربەخۆیی یان بەلێندان بە سەربەخۆیی، ئەرك ناخاتەوە، بەڵکو بە ناڕاستەخۆ سەربەخۆیی عەشایەر و بە دەستەوە گرتنی تەواوی دەسەڵات بە دەستی شێخەکان دەگەیەنی، ئەو دەسەڵاتە بە لێزانی بۆ کۆنترۆلکردنی روح و مولکی تاکەکانی هۆزەکانیان بەکاردێنن، کە ئەمەش وادەکات وەکو کویلە بە زەوییەکانیان گرێ بدرێن، وەك سەردەمی دەوڵەتی رۆمانی. کەمجار وا هەیە، ئەمانە بتوانن، لایەنگیرییان بگۆڕن بەبێ ئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە لایان خۆشەویستە وەك زەوی و پەیوەندییە خێزانییەکان و رەوشی عەشایەریان لە دەست نەدەن. ئەمانەش بۆ ئەوان زیاتر لە نیشتیمانپەروەری لەوەی لای تاکێکی ئەورووپی هەیە، دەیگەیاند.

ئێستا گرفتەکە ئەوەیە، عەشیرەتی (بەنی حەسەن) خۆی لە هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ عەشیرەتی (ئەلفەتلە)ی یاخی، بە دوور دەگرێت. هەروەها خۆی لە بێ لایەنکردنی (ئەلخەزاعل) و (ئال شبل)ی شوێنکەوتوویان دەبینێ. پێ دەچێ ئامانجی دووەم، لەو کۆنگرەیەی کە لە ٦ی تەمووز لە نێوان مێجەر نوربەری (کە کاپتن مانیش لەگەڵدا بوو) و سێ لە شێخانی ئەلخەزاعل، هاتبێتە دی. کاتێ ئەو شێخانە، لە بڕی گەڕاندنەوەی ئەو زەوییانەی کە تورکەکان لێیان سەند بوون و بە هەڵە دابوویان بە (ئال ئەلفەتلە) بەلێنیان دا، کە پاڵپشتی لە بەریتانیا بکەن. بەڵام (بەنی حەسەن)

---

١- بۆ بروسکەی رێکەوتی ١١ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ی من بگەرێوە، کە باسی ئەمانەم کردووە: ئەوبیرانەی کە لە لێدوانی ئینگلیزی فەرەنسیدا هەبوون، بۆ دانیشتوانی ئەم ولاتە بیری نوێ بوون و پێ ئاشنا نەبوون. بۆ شێخەکانیش ئەنارشیت دەهاتە بەرچاو، هێشتا لە سەر ئەوانە پێویستە رێگە بە پابەندییەکانی (ئازادی) بدەن، بۆ ئەوەی درك بە ئەرکەکانی پیاوی ئازاد بکەن. نووسەر

نەیانتوانی لایەنگیرییان بۆ بەریتانیا بپارێزن، کاپتن (مان) ژیانی خۆی خستە مەترسییەوە، دواتریش لەگەڵ (مەرزوق) و گرووپێك لە چەکداری عەرەب، بە ناوچەکەدا سوڕاونەتەوە، بۆ ئەوەی سەردانیان بکات و کار بۆ رازیکردنیان بکات. سەرجەم حاکمە سیاسییە بەریتانییەکان، لەلایەن خزمەتکارەکانیانەوە شەوانە هۆشدارییان پێ دەدرا و ئاگادار دەکرانەوە، کە گیانیان نەخەنە مەترسییەوە، هەروەها پێیان رادەگەیەنرا، کە لە گەرمادا لە ناو ماڵ نەوەك لەسەر بان بنوون، بڕوا وایە کە (مان) لە یەکێ لە گەڕانەکانیدا، بە هۆی رێگە گۆڕییەوە لە کوشتن رزگاری بووە. یەکێ لە شێخە خۆشەویستەکانی (بەنی حەسەن) کە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورە بوو، نەخۆش بوو، نەتوانرا لەگەڵیدا کۆببێتەوە، سەرۆکەکانی (ئەلفەتلە) بەرتیلیان بە بڕی (١٠٠٠) پاوەندی ئیستەرلینی بە (عەلوانی حاجی سەعدون) بەخشی، هەروەك باو بوو لە جەنگەکانیش وایان دەکرد، ئەگەرچی ئەو هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبوو. ئیدارەی بەریتانی لە بڕی ئەو هەولانە بڕی (٢٠٠٠) پاوەنی ئیستەرلینی لە رێگەی (ئەلخەزاعل)ەوە بە (ئال شبل) لە میانەی جولانەوە چاوەڕوانکراوەکانی، بەخشی. بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەرییەکانی دەرەوە. بەڵام شێخە داخ لە دڵەکان پێشتر سەرچاوەی گەورەی هێزیان چنگ کەوتبوو. هەروەها لەلایەن پیاوی دەوڵەمەند و بە دەسەڵات (سەید نور ئەلیاسری)ەوە پاڵپشتی دەکران، لە هەمان کاتدا (ئەلفەتلە) دەستی بە گەمارۆدانی کوفە لە ١٣ی تەموز کرد[١].

گەمارۆکە لە ٢٠ی تەموز دەستی پێکرد. دوای دوو رۆژ کاپتن (مان) لە تەك مێجەر (نوربەری) لە کاتێکدا سەرقالی بەرگری کردن بوو لە کوفە، کوژرا. ئەم هەواڵە تا ٢٠ی تشرینی یەکەم، ئەو کاتەی کە گەمارۆکە هەڵسا بە بەغدا نەگەیشت، مردنی (مان) زیانێکی راستەقینە بوو لە ئیدارەی مەدەنی کەوت. ئەو ئامادەیی بۆ ئەو کارە پێشاندا، کە خۆی سەرقاڵی بوو، ئەمەش بە پلەیەك لە بلیمەتی نزیك دەبووەوە. هەروەها توانایەکی یەکجار زۆری بە سەر زمانەکاندا

---

١- بۆ کتێبی مستەر مان، لاپەرە ٢٩٢ بگەڕێوە، نووسەر.

هەبوو، لە رووی ئەدەبیشەوە زمانێکی دەگمەنی هەبوو. هەروەك زانیوومە لە ژینگەیەکی تاڕادەیەك رادیکاڵی تیوری گەورە بووە، لە دەگمەنترین نامەکانی کە بۆ مامۆستا و برادەری (پرۆفسۆر گلبرت مۆری)ی ناردووە ئەوە دەردەکەوێت کە (مان) لە یەکەم سەرقاڵ بوونی بە ئیدارەی عەمەلی و سیاسەتی دوای جەنگ دیدگای گۆڕانکاری بە سەر دا دێت. ئەمەش بەڵگەی زۆر پێگەیشتنیەتی لە بیرکردنەوە و هەڵێنجان، هەروەها بەڵگەی دووربینیتی لە سروشتی ئەو پیاوانەی کە ئەو هاموشۆیان دەکات. دوای نزیکەی سێ مانگ گەمارۆ، رەتلێك کە لە حیللەوە هات، کوفەی رزگار کرد. حامیە گەمارۆدراوەکە لە ماوەی ٣ هەفتەی دواییدا لە سەر برنج و گۆشتی ئەسپ دەژیا، لە حامیەکە نزیکەی ٢٥ پیاو کوژران و ٢٧ی دیکەش بریندار بوون. حامیەکە زۆربەی جار بۆمباران دەکرا، چونکە عەرەبەکان پێشتر لە ٢٤ی تەموز دەستیان بە سەر تۆپهاوێژی لە جۆری ١٨ دا گرتبوو[١]، فایەر فلایان پێ خاپور کرد، فایەر فلای لە نزیك خانووەکانی حامیە بوو. عەرەبەکان هەوڵیاندا ئاگر لە تەلارەکان بەربدەن، دواتر تەقاندنەوەی لوغمیان لە ژێر تەلارەکە تەجرەبە کرد، پوچەل بوونی ئەم هەوڵانەیان ئەوانی سارد کردەوە، گەمارۆکە بۆ برسی کردنی حامیەکە گۆڕا. فەزڵی خۆبەدەستەوە نەدانی حامیەکە بۆ مێجەر (نوربەری)، کە لە سەرچاوە لۆکالییەکان رزقی بۆ ناو حامیەکە هێنا و پاشەکەوتیشی کرد، دەگەڕێتەوە. لەوانە بوو ئەو ساتەوەختەش (کاتی گەمارۆکە) سەرنەکەوتنی بۆ بنووسرابا، بەڵام فەزڵی ئەمەش بۆ مەفرەزەیەکی پێکهاتوو لە ١١٥ شبانە و پۆلیسی عەرەبی دەگەڕێتەوە، کە ژمارەیەکیش لەمە ئێرانی بوون. ئەوانە نزیکەی چارەگێکی هێزی حامیەکەیان پێکدەهێنا، ئەوانە بۆ دەستبەردار بوون لە لاگیرییان بۆ ئەفسەرانی بەریتانی و گەڕانەوە بۆ باوەشی کەس و کاریان تاکو شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام و خاکی پیرۆزی عێراق لە کافران پاکبکەنەوە، تووشی توندترین جۆری فشاری مەعنەوی بوون. کەچی لایەنگیرییان لەبەرامبەر ئەم

---

١- دەست بە سەر تۆپهاوێژەکە لە (رارنجیە) دا گیرا.

ئەزموونــە ســەختە خــۆی گــرت، تــەنها کەسێکیشــیان ملکەچــی ئامۆژگــاری و هۆشدارییەکانی پیاوانی ئایینی نەبوون. رەخنەکانی برادەران و هاونیشتیمانیان لــە چایخانەکان، ئەوانی نەڕووخاند (نەوەســتاند). هــەروەها تکاکــانی خێزانەکانیشــیان ئەوانی لەو ڕێگە شــەرافەتمەندەی کــە گرتبوویــان لانــەدا. گــەورە موجتــەهیرکاری نەجــەف لــە ســەروی هەموویانــەوە (ســەید محەمــەد کــازم ئەلیــەزدی ئــەلوەقور) بەشێوەیەکی ترسناك بێ دەنگ بوو، بەڵام چینەکانی خوارەوە لە پیــاوانی ئــایینی، ئەوانەی کێبڕکێی سەرکردە نیشتیمانییەکانیان لە بانگەشەکردنی جەماوەر لەســەر بنەمایەکی ئایینی و نیشــتیمانی دەکــرد، هــانی خــەڵکیان دەدا، کــە داگیرکــاری سەربازی ڕیشەکێش بکەن.

ئەو پاساوانەی کە بەکارهاتوون، لەماددە و شــێوازی بەڕووخســتنەکەی بەهــەمان ئەو پاساوانە دەچوو کە پێشتر لە سەدەی یــازدە بــۆ رزگــارکردنی زەوییــە پیرۆزەکــان (کەنیسەی مەسیح)[1] بــەکارهات. هــەروەها ئــەو پاســاوانە بــە هــەموو ئــامرازێکی داهێنراوی مرۆڤایەتی، پاڵپشتی دەکرا. ئەوانەی لە خزمەتی ئیدارەی مەدەنی گیانیان دەسپارد، نەدەبوو، لەسەر شێوازی ئیسلامی بنێژرێن، ژنەکانی ئەوانەی بە لایــەنگری مانەوە، لە هەندێ باردا ناچارکران بۆ لای باوکیان بگەڕێنەوە، هــەروەها لــە هەنــدێ باری دیکەشدا کەرامەت و حورمەتیان بــە ئاشــکرا پێشــێلکرا، منداڵەکانیشــیان لــە کۆلەکاندا بەتوندی لێیان دەدرا.

(شبانە) و پۆلیس، جگە لە کەمێکیان نــەبێت، هــەر بــە وەفــادار بــۆ ئەفســەرە بەریتانییەکان مانەوە، ئەو ئەفسەرانەی کە هۆڵدین بــە ســەرەتایی و کــەم ئــەزموون ناویان دەبات و بە گاڵتەجاری و قەشمەرییەوە هەندێجار باسیان دەکــات، ئەمــەش بــە کەمترین لێهاتوویی بۆ ڕێزگرتن لە سەربازانی هیندی (زۆربەیان موسوڵمان بوون) کــە بەردەوام لەگەڵ سەربازانی بەریتانیدا بوون، دانەدەنرا، چونکە حامیەکــە ژمارەیــەکی یەکجار کەم لە سەربازی بەریتانی لەخۆگرتبوو.

---

١- واتە جەنگی خاچپەرستەکان.

یەکە سەربازییەکانی بەریتانیا لـە عێـراق لـە مـاوەی سـاڵانی ۱۹۱۹ و ۱۹۲۰ زۆربەی کات لە پیاوانی کەم ئەزموون لەڕووی سەربازییەوە، پێـك دەهـات. ئەمـەش بەهۆی کەم تەمەنی و کەم ئەزموونییان، بۆیە سوپای هیندی خۆی بەرگەی تونـدترین گورزی گرتووە و بەرگری خراپترین شۆکی لە عێراق کردووە.

## دیلەکانی ئینگلیز لە نەجەف

نزیکەی سەد و حەفتا دیلی جەنگ، کە هەشتایان سەر بە کەتیبەی مانتشستر بـوون، لە نەجەف (کە چەند میلێك لە کوفە دوورە) کۆبببوونەوە. لە ۲٤ی تەمووز یەکەم هـەواڵی ئەمانە دوای بەدیلگرتنیان لە کوڕی مامی خاوەن شکۆ (ئاغا خان)[1]ەوە گەیشت، کـە بـە (ئاغا حەمید خان) ناونراوە، ئەو پیاوەش لـە کـانوونی یەکـەمی سـاڵی (۱۹۷٥)ەوە بـە نوێنەری ئیدارەی مەدەنی لە نەجـەف هەڵبـژێردراوە، بـەم سیفەتەشـەوە تـوانی دیـارترین خزمەت، کە دەربڕی زۆرترین لاگیری بێت، پێشکەشی ئێمە بکـات. سـەرباری هەڕەشـەی دوژمنەکانی و لۆمەی برادەرانـی، لـە پۆسـتەکەی خـۆی مایـەوە، پێـی راگەیانـدین کـە عەشایەر هەڵسوکەوتێکی دڵڕەقانەیان لەگەڵ دیلەکان کردووە، ناچـارکراون تـا کوفـە، لـە وێشەوە تا (ئەبی سەخیر) بەپێخواسی بڕۆن، هەندێکیان لە نەجەف دەست بەسـەر کـراون، بەڵام دواتر بـەهۆی هەڵسـوکەوتی دانیشـتوانەکەی، کـە بەرامبـەریان دەمـارگیر بـوون، گواستراونەتەوە، لە کۆتاییدا هەموویان لە نەجەف کۆکراونەتەوە، کـە حەمیـد خـان بـۆی نەدەکرا، شوێنی حەوانەوەیان بۆ دابین بکات، حەمید خـان بـەڵێنی بـە پیـاوە دیارەکـانی

---

۱- سیری ئەیلەر هۆڵدین لە زاری ئاغا خان دەگوازرێتەوە کە حەز بە کۆکردنەوەی (شبانە)ی لۆکاڵی ناکات، پێی باشە بەخشیشێکی زۆر بدات، بەمەرجێ ئەمە وابکات ژمارەیەك کۆماری بچـووك لـە عیراق دابمەزرێ و رێگە بە دانیشتوانەکەی بدات کاری خۆیان بە خۆیان رابپـەڕێنن، لەمـەوە بۆمـان دەردەکەوێت کە خاوەن شکۆ بواری ئەوەی نەبووە، ئەو بابەتانە لەگەڵ کوڕی مامی (حەمیـد خـان) گفتوگۆ بکات. نووسەر.

شارۆچکەکەدا بوو، کە لە بڕی ئەو هەموو شتانەی بۆ ئەم مەبەستە خەرجی دەکەن، قەرەبوویان بکاتەوە، ئەمە سەرباری ئەو پاداشتەی لە ڕۆژی دوایی وەری دەگرن.

بە لەبەر چاو گرتنی باشی تەندروستییان و مردنی تاکە دیلێك، ئەوە دەگەیەنێ کە دیلەکان مامەڵەیەکی باش کراون و خۆراکی چاکیان پێدراوە، لەوانەیە ئێرە شوێنێکی گونجاو بێت، بۆ ڕەتکردنەوەی دروستی قسەکەی سیر ئەیلمەر هۆلدین، کاتی ئاماژەی بە عەرەبی عێراق سەبارەت بە ((بەکارهێنانی شێوازی دڕندانە لەگەڵ دیلەکان))دا، ئەمەش ئەوەی لە کتێبەکەی فۆکس (کتێبی شەهیدەکان) سەبارەت بە قێزەوەنترین شێوازەکانی ئەشکەنجەدانمان بە بیر دێنێتەوە.

هەرچی توندوتیژی تورکەکان بوو لەگەڵ دیلەکان، ئەوا پێشتر لە ((جۆرەکانی لاگیری)) قسەم لە بارەیەوە کرد، عەرەب و کورد بە یەکەوە، بە سەرکردایەتی تورکەکان بە توندوتیژی تۆمەتبارن. باسی زۆر ڕووداوم کردووە کە تێدا عەرەبەکان دیلی بریندارایان بەهۆی توێنێتی بۆ خۆێن و هەستی ئایینی لەلایەکی دیکەوە، کوشتووە. بەڵام ناتوانم، هیچ حاڵەتێك لەو هەموو خاڵەتانەی کە لەلایەن بەشی هەواڵگری خزمەتی سیاسییەوە تۆمارکراون، بەبیر خۆم بێنمەوە، کە عەرەب بە ئەنقەست ئەشکەنجەی دیلەکانیان دابێت.

## شۆڕشەکە لە کەربەلا

هەرچەندە، سەختییەکانی کە لە نەجەف ڕووبەڕووی بووینەوە گەورەبوو، بەڵام ئەگەر بەسەریدا زاڵ نەبووینایە، بەقەد ئەو سەختییانە بوو کە لە کەربەلا هەوڵماندا بەسەریاندا زاڵ بین، پۆلیس بە یارمەتی میرزا محەمەد سی ئای سی لە ٢٢ی حوزەیراندا (١٠) سەرکردەی شۆڕشەکەی دەستگیرکردبوو، میرزا محەمەد نوێنەرایەتی ئیدارەی مەدەنی دەکرد. میرزا محەمەد تەقی کوڕی موجتەهیدی گەورەی کەربەلا لە نێو دەستگیرکراواندا بوو، کە زیاتر لە بۆنەیەك هەڵمداوە، ئەو ژمارە زۆرەی

بەڵگەنامانەی، کە لەنێوان خەڵکدا بەناوی ئەوەوە ئەو دەست ئـەو دەسـتی دەکـرد و واژووکەی ئەویان ساختە کردووە، هەوڵمـدا، بـە ئاشـکرا ئەمـە ڕەت بکـات، بـەڵام سەرکەوتوو نەبووم. ئەو پیاوە (میرزا محەمەد موجتهیدی گەورەی کەربەلا) پیرە، لـەو وەسفەی کراوە بە (پاپا لیوی نۆیەم) دەچێت. قەدیسێکی سـادە، خـاوەن میزاجێکـی زۆر بەلای بەلارێدابردنی خۆی و جیهاندا دەچێت، کەسایەتییەکی بە ویقاری دوور لـە کـەمترین کاراییـەکی ئـایینی، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ لایـەنی کـرداری ئـایین بیگونجێنییێ، هەروەها لە نەوەکانیدا بە بەخت نەبووە، هەندێجار تووشی بیرکردنەوە لە بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی دەبوو، کە بەهۆی سەرکەوتوویی تیوکراتی خـۆی، پەیـدا ببوو، رووخۆشییەکی زۆر کەمی بەرامبەر شـای ئێـران، پیشـاندا، کـە بـەر لەچـەند مانگێك سەردانی کەربەلای کردبوو.

لـە راسـتیدا، واژووکردنـی ئـەو فتوایـەی کـە بانگەشـەی شـوێن کـەوتوان لـە موسوڵمانان، ئەوانـەی سـەربە تاکـەکانی هۆزەکـانی دیجلـە و فـوراتی ناوەڕاسـت و خواروون، کە بە ئەرکی ئایینی خۆیان لە جیهاد کردن هەڵسن، ڕەتکـردەوە. هـەتاکو رازی نەبوو بەشێوەیەکی فەرمی حاڵەتی ((بەرگریکردن)) رابگەیەنێ، ئەو بەرگرییەی کە دەبێتە ئەرکی موسوڵمانان کە رێوشـوێنی بـەرگری لـە دژی دووژمنـانی ئیسـلام بگرنەبەر، کاتێ بە فرۆفێڵی دەسەڵاتی کافران هەڕەشە دەکرێن. لەگەڵ ئـەوەش کـاتێ واژووەکانی لەسەر ئەو بەڵگەنامانە ساختەکرا، ئازایەتییەکەی خیانەتی لێکـرد، یـان لەوانەیە قەناعەتهێنانی بە ڕەتکردنەوەی بەرپرسیارێتی وای لێکردبێ. بەڵام ئەوەنـدە نەژیا تا بەچاوی خۆی ئـەو شکسـتانەی کـە دوای چـەند مانگێـك شـوێن کـەوتووە گومڕاکانی تووشی بوون، ببینێ. بەڵام هەستی تایفەگـەری کـە خـۆی و هاوڕێکـانی هانی سەرکەوتنیان دەدا، هێشتا دوای چەندین ساڵ سەرچاوەی تێوەگلانی حکوومەتی عێراق بوو بە سەرئێشە و گرفتی زۆر لە زۆر بۆنەدا.

میرزا محەمەد خان بەهادۆر[1]، لە هەموو روویێکەوە، پیاوێکی سەرسوڕهێنەر بوو، هاولاتییەکی ئێرانی بوو، لە بوشەهر لە خانەوادەیەکی کە سەردەمانێك بوو خزمەتی نووسینگەی نیشتەجێ بوونی بەریتانی و قونسلیەی گشتی لە خەلیج دەکرد، لە دایك بووە. بەو پێیەی سکرتێرێکی رۆژهەلاتیی (سیر پرسی کۆکس) بوو، بەرلە سالی ١٩١٩ بەشداری چەند گفتوگۆیەکی گرنگی لە دوورگە عەرەبی و دوورگەی عومان کردووە. زانایەکی زمانەوانی عەرەبی بوو، هەروەها خوێندنەوە و نووسینی بەزمانی ئینگلیزی زۆر باش دەزانی، لیستی ئەو کتێبانەی کە لە کتێبە کلاسیکییەکان لە ئینگلیزی بۆ سەر زمانی فارسی وەریگێڕاون لیستێکی درێژە. زانیارییەکی بێ وێنەی لەسەر یاساکانی هیندی و تورکی هەبوو. هەروەها یاساکانی شەریعەت. بۆ ماوەی چەندین سال پۆستی حاکمی لە دائیرەی عەدلی وەرگرت. پێویست بوو لەسەری بەرگەی لۆمەکانی هاولاتیبوون و هەڕەشەکانی ئەو نیشتیمانپەروەرانە بگرێت، کە لە کەربەلا بەهێزتر بوون، وەك لە نەجەف. هەروەها شێوازەکانیان زۆر فڕوفێلاوی بوو. چاپخانەکە بەردەوام بە کاری ئەوانەوە سەرقال بوو، بۆ ئەوەی پەراوی پان و درێژ، کە بەشێوەیەکی زانایانە ئامادەکرابوون، دەربچوێنێ.

یەکێ لە نووسەران، کە بەڕەگەز میسری بوو، بابەتێکی دابەزاندبوو، مستەر لوید جۆرجیش ئاماژەی بۆ کردبوو، لە بابەتەکەدا باسی هەلمەتە سەرکەوتووەکەی ئەلەنبی بۆ سەر فەلەستین کراوە و بە ((دواین هەلمەت و گەورەترین هەلمەتی خاچپەرستان)) دانراوە. دواتر کورتە چیرۆکێکی پڕ لە ئابڕوچوون و بێ بەزەییانە دەگێڕێتەوە، کە خاچپەرستە سەرەتاییەکان ئەنجامیان داوە، داوا لە سەرجەم موسولمانە راستگۆکان کراوە، بە شمشێر بەرامبەر هەولە هەلخەلەتێنەرەکانی دەولەتانی مەسیحی لە

---

[1] - میرزا محەمەد بەهادۆر لە سەروبەندی دامەزراندنی حوکمی نیشتیمانی لە عیراق مایەوە، رەگەزنامەی عیراقی وەرگرت و لە بەسرە نیشتەجێ بوو، کاری پارێزەری بەناوی محەمەد ئەحمەد بۆ ماوەیەکی درێژ کرد، تابوو بە نەقیبی پارێزەرانی بەسرە، تاکو ئێستاش لە بەسرە دادەنیشێ.

فەڵەستین و سوریا و عێراق کە بە ئامانجی سووککردنی ئایینەکەیان و شێواندنی داب و نەریتیان بە هەموو ئامرازێك (قوتابخانە، خوێندنی کچان، نەخۆشخانەکان و یاسا تەندروستییەکان)، بووەستنەوە. ئەو بابەتە بە وێنەیەکی کاریکاتۆری کۆپیکراو لە گۆڤاری ((پێنچ))ی ئینگلیزی کە لە ١٩١٧ دەرچوو بوو، رازێنرا بووەوە، لەژێر ناوی ((دوایین هەڵمەتی خاچپەرستی)) دابەزی بوو.

ئەو بانگەشانە لە کەربەلا کاریگەری خۆی دەبێت، بەڵام لە شوێنانی دیکە ئاوڕی لێ نەدرایەوە، چونکە ئامانجی پێکا بوو. پێ دەچوو ((بەلشەفیك))یش بۆ ماوەیەك شوێنێکیان لە کەربەلا دۆزیبێتەوە، ئەوان نەوەك هەر ((رزگارکردنی نەتەوە چەوساوەکان)) بەڵکو لەناو بردنی دەرەبەگایەتی و چینە خاوەن ئیمتیازەکانیشیان لە بەرنامەی خۆیاندا دانابوو. سەرکردە نیشتیمانییەکان نەیاندەتوانی بەرگەی ئەو بە ئاشکرا پارە ویستنەی عەشایەرەکان بگرن، ئەوانە هەر زوو هەوڵیان دا لە هاوپەیمانێتی رابکەن، هەرچەندە بڕێکی زۆر لە پارەیان لە شێوەی دیاری هێنابوو. هەروەها لە کەربەلا بانگەشەکەران و سیخورانی وڵاتانی دیکەش لە کارکردندا بوون، لە نێوان ئەو وڵاتانەش، وڵاتانی هاوپەیمان و ئەوانەی بە هاوپەیمانەوە گرێدرابوون، هەبوون. بەڵام هیچ پێشکەوتنێکی وایان نەکرد، چونکە ئەوانە لێهاتوویی و زانیارییان سەبارەت بە ئاڕاستەکردنی ئەو پارانەی لەژێر دەستیاندا بوو، نەبوو. بەشێواز و ئامرازێکی سوودبەخش خەرجیان نەکرد.

لە بلقی ئەو ئاوە شێواوەدا میرزا مەحمود سوکانی کەشتییەکەی لە رێگایەکی راست، بەدەستەوە گرتبوو، هەرچەندە شارەزایی لە شێوەکانی فرت و فێڵ دا نەبوو، کە دیپلۆماتکارانی رۆژهەڵاتی تەنها بەشتێکی سەرنجڕاکێشی دەزانن، بەڵام وەك ئاغا حەمیدخان ناوبانگی باشی خۆی بە مامەڵەی چاك لەگەڵ دۆست و دوژمن پاراست، ئەمەش وایکرد لە بیرنەکرێت، تا ئەوکاتەی کەسانێك هەبن، بتوانن ئەو رۆژە پەشێوانە بەبیرخۆیان بهێننەوە. رۆیشتنی لە کەربەلا کاریگەری خۆی هەبوو.

له ١٤ی ئابدا، ئەو رووبارەی که ئـاوی شـیرینی بەشـارەکه دەدا، پچـڕێنرا. ئـەم رووداوەش هیچ کاریگەرییەکی لەسەر رێڕەوی رووداوەکان و پەرەسـەندنەکەی نـەبوو، بەڵکو دەبوو، خەڵکی شارەکه بەرگەی سەختی دیکـه، بگـرن. هەرچـەندە هێزەکـانی عەشایەر بەگەرمی بەرگری لێکـرد و زۆر بـه ئازایانـه جـەنگان. هۆڵـدین بـۆ ئـەوە دەچێت، که پچڕاندنی رووبارەکه ئەنجامی گرنگی لێکەوتەوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەك بۆ پاڵپشتی کردن لەم بانگەشەی به دەستەوە نادات، که پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنیٚ، لـه هەموو بەڵگـەکانی ئـەوکات دەسـت کـەوتوون. هۆڵـدین، لـه تۆمـارکردنی رووداوە سەربازییەکان و تەئویلکردنی کارکردەکانی بەسـەر خـەڵکی سـڤیل، هەنـدێجار پـاز دەدات و هەندێجاری دیکەش ساتمە دەکات.

لەم ساڵانەی دوایی، سەرۆکەکانی وڵاتانی موسوڵمان و پاشاکانیان (له تورکیا و ئێـران و عێراق) بەدەسته بەهێز و لێهاتووەکانیان، لوت بـەرزی پیـاوانی ئایینییـان تێکشـکاند. گومانی تێدا نییه که ئەم وڵاتانه، بەتێپەڕ بوونی کات، دووبارە، دەبنه نێچیری پەشـێوییە ناوخۆییەکان، بەڵام مەرج نییه ئەم جارەش وەڵامی فەرمانەکانی سەرکردە ئایینییـەکانیان بن. لەگەڵ ئەوەشدا ئاژاوەکانی ئەم مانگانه و حەماسەته ئایینییەکەی به پلەیەکی وابـوو، کەسایەتییەکی وەك (حەمدان قیرمت)، که له سەدەی (١٠) له کوفه دەرکەوت، دەیتوانی هێزە چەکدارەکانی بەکار بهێنێت و دەمارگیرییە شاراوەکانی بورژێنێت. لەوانـەبوو عێـراق لەلایەن ئەو چەته دەمارگیرە توندڕەوانەوە دەستی بەسەردا بگیرابا، که تـرس و توندوتیـژی وەهابییەکانی ناوەڕاستی دوورگەی عەرەبی کەمتر نەبوایە.

## هەرەسهێنانی شۆڕشەکه

هەتا ناوەڕاستی تشرینی یەکەم، ئامانجی ئەو بزووتنەوانـەی کـه هێزەکـانی سـێر ئەیلمەر هۆڵداین پێوەی خەریك بوو، گەیشته دەست. هەرچەندە شکستی مەترسیدار، که به هۆکارێکەوە بوون، دەکرا خۆی لیٚ لابدەین، بەڵام هۆکـاری یەکـەم بـۆ بڕیـاری گواستنەوەی سوپا بۆ بارەگای هاوینه له ئێران، دەگەڕێتەوە. ژەنەڕاڵ هۆڵداین تـوانی

شۆڕشگێڕان لە هەموو شوێنێ تێك بشكێنێ و ڕێگاكان (گەیاندن) بۆ هەموو مەڵبەندە گرنگەكان بگەڕێنێتەوە، فەزڵی زۆر لەو بڕیارەی وەریگرت لە ماوەیەكی كورتدا بۆ ئەو دەگەڕێنێتەوە. ئەوەی لە دەستی هات بۆ نەگەڕانەوەی پەشێوی و ئاژاوە كردی، ئەو دەڵێت: ((عەشایەر بۆ یەكلا كردنەوەی كێشەكان پەنایان بۆ چەك برد، سەركەوتن، پێویستە ناچار بكرێن لەژێر دڕكدا بڕۆن)).

هەرچەندە ئاماژە مێژووییەكەی ئەم رستەیە نارۆشنە، بەڵام ماناكەی روونە. سووربوو لەسەر تەمبێكردن و سزادان و چەندی بكرێت چەك داماڵێن، بۆ ئەمەش باشترین ئامرازی بەدەستەوە گرت، بۆ ئەوەی زامنی سەركەوتنی ئەو حكوومەتە عەرببیە بكات، كە دەرفەتی هاتنە كایەوەی بۆ هاتۆتە پێش. تا ئەو كارەی كرد، ئامادە نەبوو سەیری دەركردنی بڕیاری لێبووردنی گشتی و ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی كە بەدوای دادێت، بكات.

سێر پیرسی كۆكس لە ١١ی تشرینی یەكەم، گەیشتە بەغدا، واتە هەمان ئەو كاتەی كە شۆڕشەكە تێیدا هەرەسی هێنا، ئەم بڕیارە وای لە كۆكس كرد هەنگاوی خێرا بۆ كردنەوەی سەردەمێكی تازە بەراوێژ لەگەڵ رەگەزە میانڕەوەكان بهاوێژێ، بەبێ ئەوەی خۆی یان حكوومەتی خاوەن شكۆ بخاتە تۆمەتی دووڕوویی لەبەرامبەر لایەنگرانی نیشتیمانپەروەرە توندڕەوەكان یان تەوقەكردن لەگەڵ دەستی سوربوو بە خوێن. توندوتیژی پەشێوەی سیاسی، كە دەروونی دانیشتوانە عەرەبەكەی نیگەران كردبوو، نەما و خۆی خۆی خواردەوە، هەروەك جیهان هەموو دەزانی هەوڵەكانی بەپلەیەكی سەرسوڕهێنەر و چاوەڕوان نەكراو لە سەركەوتن، گەورەتر كرد. زۆر جار بۆ رەخنە گرتن لە ژەنەڕال هۆڵدین هەڵم بۆ هەڵكەوتووە. زورجاریش دەمتوانی ئەو لێدوانە دژ بە یەكانەی كە لەبارەی چیرۆكی سەركردایەتیكردنەكەی گێڕاویەتەوە، رەت بكەمەوە، بەڵام خۆشحاڵم كە باسی ئەو توانا دروست و هەوڵەی كە لە گرتنەبەری رێوشوێنەكانی تەمبێكردن و ئارامكردن بەیەكەوە ئەنجامی دان، بكەم،

دوای ئەوەی بە ئاگری شۆڕشەکە، شۆڕشەکە خۆی سووتا. کەواتە هۆڵدین ئەم کارەی لەوەی کە لێی زانرابوو، باشتر ئەنجام دەدا، لە بەسەرخستنی ڕێوشوێنە گیراوەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی عەرەبی لە ساڵی ١٩٢١.

## شۆڕش یان مەرگەسات

مەرگەسات، هەر وەك ئەرەستۆ دەڵێت: سۆزەکان بە ((بەزەیی)) تێکەڵاو بەترس، خاوێن دەکاتەوە، سۆزەکان بۆ ئارامگرتنیان، دەوروژێن. لە ئارامی دوایی گەردەلول، پێویستە بەشێوەی عاتفی چارەسەر بکرێت. میلتۆن[١] ((مەرگەسات)) بە شێوەیەك لە شێوەکانی چارەسەری مرۆڤایەتی ((کاتارسیس)) دادەنێت، کە چارەسەری عاتیفە بە عاتیفە یەك کە لە جۆر لەو دەچێ نەوەك لە نموونەدا، دەکات.

ئەو پەشێوییانەی کە ساڵی ١٩٢٠ لە عێراق روویاندا، مەرگەساتێکی حەقیقی بوون، بەم مانایە. ماکۆلی دەڵێت: ((پیاوان لە شۆڕشدا بەخێرا دەژین. شارەزایی چەندین ساڵە هەمووی لە سەعاتێکدا کۆدەکرێتەوە و سنووری نەریتە کۆنەکان لە بیرکردنەوە و پراکتیدا بە توندی دەشکێنرێت[٢])).

پەشێوییەکانی ١٩٢٠، شۆڕش نەبوون، بەڵکو مەرگەسات بوون، ئەمە ئەگەر بەچاوی ئەو یاسایە سەیری بکەین، دەبینین کە نە لە سروشت و نە لە دەرەنجامدا، شۆڕش نەبوو، بەڵکو مەرگەسات بوو.

ۆودز ۆورس دەڵێت: ((بەڵای مرۆڤ لەوە نایەت کە عەقل سەرناکەوێت و بێ هیوا دەبێت، بەڵکو لەوەوە دێت کە ژیان و خواستەکانی ژیان و کارەکانی، کەم جار وا هەیە لەگەڵ باشی خواستەکانی مرۆڤایەتی ڕێك بکەوێت.

---

١- بۆ پێشەکی Samson Agonistes، بگەڕێوە، کتێبی بوتشەر: Aristotale's Theory and fine Arts, 1895. نووسەر.

٢- بۆ Macualy- History of England, Vol II, p.504 بگەڕێوە. نووسەر.

# بەشی چوارەم

## هۆکارەکانی شۆڕشەکە

لە رۆژی ٥ی ئابی ١٩٢٠، کاتێ پەشێوییەکان، گەیشتبوونە لووتکە، لە وەزیـری دەرەوە (بە مێـژووی ٢ی ئـاب) نامەیـەکم بـە دەسـت گەیشـت، داوای کردبـوو لـە بروسکەیەکدا هۆکارەکانی شۆڕشەکەی بە تـەواوی بـۆ روون بکەمـەوە و پێشکەشـی بکەم. ئەوا منیش لە خوارەوە، دەقی ئەو دوو بروسکەیە، کە لە وەڵامی نامەکەدا بۆم نارد، دەخەمە روو:

## بروسکەی یەکەم

بروسکەکانم لە ١٨ی مانگی دواییدا، بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ پڕوپاگەنـدەی پاڵپشتی کراو بە پارەی زۆری تۆمارکرد، ئەو پڕوپاگەندانەش لە سوریا و تورکیا بە پلەیەکی کەمتر بڵاو دەکرانەوە. ئامـانج لـە بڵاوکردنەوەیـدا، تاڕادەیـەکی زۆر لـە بیرورای خەڵکیدا بەگشتی، نامۆ بوو. تا لاوازی سەربازیمان بـۆ خـەڵکی نائاشـکرا بێت، ئەو پڕوپاگەندانە جگە لە بەغدا و کەربەلا و نەجەف نەبێت، کە سەرکردەکان بە بەردەوامی بۆ بیرۆکـەی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی ئیسـلامی پـەتی (خـالص) هاوسۆزبوون، سەرکەوتوو نابێت.

بزووتنەوەکە ئەوکاتە ترسناك بـوو، کـە دوژمنانمـان لـە سـوریا بـۆ دانیشـتوانی عێراقیان سەلماند، کە دەکرێـت، ئێمـە بـەزەبری چـەك وەدەربنـرێین. لـەژێر فشـاری حکوومەتی سوری دەستبەرداری هەریەکە لە (دێرەزور، ئەلبوکەمال و قائیم) بووین.

دواتر له نێوان بەغدا و موسڵ، شەمەندەفەرەکان لە هێڵەکانیان لابران، لە تەلەعفەریش ئەفسەرانمان کوژران. خەڵکی بەرە بەرە متمانەیان بە توانای ئێمە بۆ پاراستنی ئاسایش و سیستەم بە لاواز دەهاتە بەرچاو. توندڕەوەکان هیوایان بەگەیشتن بە ئامانجە خواستراوەکانیان کە سەربەخۆیی تەواو و رزگاربوونە لە هەر دەستێوەردانێکی راستەوخۆی بێگانە زیاتر بووە. دواتر نەجەف و کەربەلا بووتە دوو ناوەندی سەرەکی بزووتنەوەکان (لێرەدا پێویستە باسی ئەوە بکەم، کە من ژمارەیەك پیاوم لە ئەیلولی ۱۹۱۹ بۆ دەرەوەی کەربەلا وەدەرنا، نەجەفیش لە ساڵی ۱۹۱۸ شانۆی پەشێوییەکان بوو).

دەستگیرکردنی میرزا مەحمەد رەزا و کەسانی دیکە لە کەربەلا لە ماوەی مانگی حوزەیراندا، هەروەها چەند کەسایەتییەکی نادیاری دیکەش لە حیللە، وایکرد رەوشەکە لە حیللە ئارام بێت، بەهۆی لاوازی سەربازیمان لە شامیە نەمان دەتوانی هەمان رێوشوێن بگرینە بەر، تەنها ۳۰۰ سەرباز و دوو تۆپهاوێژمان هەبوو. ئەو ناوچەیە کە پێشتر ناوبانگێکی خراپی هەبوو، بووە مۆڵگەی پیلانگێڕی و جۆڵانەوەکان. هەروەك چاوەڕوان دەکرا، راگەیاندنی مەرجەکانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا، لەهەمان کاتدا کاریگەرییەکی خراپی لەسەر رای گشتی هەبوو. ئەم ئاشتییە توانای بە توندڕەوەکان بەخشی کە ماوەیەکی بەسوود لە فەرمانبەری سەردەمانی تورکیا و چینێکی گەورە لەڕای گشتی، کە دەیانخواست ئیمپراتۆری تورکی بمێنێتەوە و تۆڵەش لە داگیرکاری یۆنانییەکان بۆ چەند وڵاتێ بکەنەوە، لە دەوری ئاڵای خۆیان کۆبکەنەوە، لەبەر ئەوەی ئەمە لە سەرەتای مانگی رەمەزان روویدا و لەهەمان کاتدا ئەنزەلی (بەندەر پەهلەوی) و (رشت)مان چۆڵکرد، لەلایەکی دیکەوە راپۆرتی سەرکەوتنی بەلشەفیکەکان لەسەرتاسەری جیهان، دەگەیشت، ئەمانە هەمووی دەرفەتێکی وای بۆ توندڕەوەکان رەخساند، کە لە قۆستنەوەی کەمتەرخەم نەبوون، بۆ ئەوەی پێشانی بدەن، کە ئێمە (بەریتانیا) سیاسەتێکی دژ بە ئیسلام دەگرینەبەر لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ئێمە زۆر بە خێرایی دەستمان بە لاوازبوون کردووە.

هەر لەو سەروبەندەدا، کاریگەرییە دەرەکییەکانیش دەستیان بە رۆڵ نواندن لە رەوشەکەدا کردبوو. .. لەم بۆنەیەدا ئێمە دەزانین کە حەوت هەزار پاوەندی ئیستەرلینی بە دراوی زێڕی تورکی لە ماوەی مانگی رەمەزان و ئایاردا بە دەستی توندڕەوەکانی کەربەلا گەیشتووە. هەندێ لە سەرۆکەکانی شامیە، کە نەمانتوانی دەستگیریان بکەین، هەروەك روونمانکردووە، چالاکییان بە ئاراستەی هەڵگیرساندنی شۆڕشی لە ناوچەی سەماوە و رومیە خستبووە گڕ. چونکە ئەوان باش دەیانزانی، ئەو ناوچەیە لەڕووی ستراتیژییەوە گرنگترین خاڵی تێکچوونی هێڵەکانی گواستنەوەی ناو عێراق بوو. هەرگیز هێزەکان بۆ ئەو ناوچەیە نەچوو بوون، لە راستیدا کەس نەیدەتوانی بچێتە ناو ئەو ناوچەیە، بۆیە لە ماوەی ساڵی رابردوودا لە بارێکی نالەباردا بوو. لە ٣ی تەمووزدا یاخیبوون لە رومیە روویدا، ئەگەر دەست بەجێ بمانتوانیبا سەربازی تەواو بۆ شوێنی رووداوەکە بنێرین، ئەوا بزووتنەوەکە لە شوێن و لای دیکە بڵاو نەدەبووەوە، هەروەها دەتوانرا، چارەسەری رەوشی شامیەش بەڕێگای دیپلۆماسی بکرێت، کە لە ماوەی ١٥ رۆژی دواتر هیچ رووداوێکی لێ روونەدابوو، بەڵام ئێمە لە بارێکی وادا نەبووین، ئەو کارە بکەین، بۆیە شۆڕشەکە بەهیواشی بڵاو بووەوە.

هۆزەکانی بەبیروباوەڕی (شۆڕش بە جەنگێکی پیرۆز دادەنرێت) باوەڕیان پێ هێنابوو، ئێستاش گەورە موجتەهیدی کەربەلا بانگەشەیەکی چالاکانەی جیهاد کردن دەکات، هەروەها سەدان بانگەشە کەریشی بۆ سەرجەم ناوچەی فوراتی ناوەڕاست و ناوچەکانی سەربەخۆیی نارد، سەرۆکەکانی عەشایەر لەناوچەکانی حیللە و کەربەلا زۆربەی کات بە دوای تاکەکانی عەشیرەتەکەیان لە ناو بزووتنەوەکان، کەوتن، لەبری ئەوەی خۆیان بەخۆیان سەرکردایەتییەکە بکەن. داواکارییەکانی شۆڕشگێڕان لەم بابەتە بریتی بوو لە دەرکردنی بەریتانییەکان بە تەواوی لە هەموو عێراق و دروست کردنی مەملەکەتی ئیسلامی بوو. ئەمەش بۆ موجتەهیدکاران بەمانای دامەزراندنی دەوڵەتی تیۆکراتی دەهات، کە بە نموونەی باڵای خۆیان دەزانی. هەرچی بۆ عەشایەرەکان بوو، بەمانای بێ حکوومەتی یان حکوومەتێك شێخەکان خۆیان

بەڕێوەی ببن و هەرکاتێ بخوازن بتوانن پشت گوێی بخەن. بۆ کەمینەیەکی بچووکی شارنشین ئەم بارە، بەدانانی ئەمیرێك لە ئەمیرانی ولات، دەهات.

باوەڕناکەم، کە شۆڕشگێڕان هیچ چەوساندنەوەیەکی کشتوکاڵییان هەبێت، باجەکان سووك بوون، بەرووبووم باش بوو، ئەگەر چەوساندنەوە هەبوایە، ئەوا پەشێوییەکان هەرتەنها لە ناوچە شیعەکان کە کەوتوونەتە نەجەف و کەربەلا کورت نەدەبووەوە. گومانی تێدانییە کە عەشایەرەکان نەیان دەویست خواستی نەدانی باج زیاد بکەن، هەروەك کە هەموو خەڵك لەمبارەیەوە ئەم خواستە دەکەن، بەڵام ئەمە بە تەنها نەدەبووە هۆکاری شۆڕش، ئەگەر ئێمە لاواز نەبوونایە و ئەگەر هۆکارەکانی دیکە کە لە پێشەوە باسم کردن، ئامادە نەبوایە.

## بروسکەی دووەم

دوای هەفتەیەك واتە لە رۆژی ١٢ی ئاب، بروسکەیەکی دیکەم بەم دەستەواژانەی خوارەوە نارد:

لە بروسکەی ٥ی ئاب، هۆکارەکان و ئامانجە راستەوخۆکانی ئەو شۆڕشەی لە فوراتی ناوەڕاست ئێستا روویدا، نارد. فاکتەری گرنگ تێیدا، ئەو پڕوپاگەندەیە بوو، کە سەرچاوەکەی بەغدا بوو. لە هۆکارە سەرەکییەکانی، کە وایکرد ئیدارەی مەدەنی بەو پلەیە جەماوەرێتی لە دەست بدات، کە لە سەرەتادا هەیبوو.

(١) لەژێر رۆشنایی ئەو ئەزموونەی کە لەماوەی سێ مانگی رابردوودا دەستم کەوتبوو، لەو باوەڕدام کە ئێمە پێویستە خۆمان بە تاوانبار بزانین، سەبارەت بەو کاروباری ئیدارییانەی کە لە ئێمە دەرچووە و کاریگەریی لەسەر عەشایەرەکان داناوە. لۆمەکردن لەمەدا پێویستە بە یەکسانی بەسەر ئیدارەی مەدەنی و شێخان و سەرجەم سەرۆك عەشیرەتەکان دابەش بکرێت. پاڵپشتیمان لە شێخەکان کرد و دەسەڵاتمان پێدان، ئەم کارەشمان وەك سیاسەتێك بەڕێوەبرد، ئەوانیش لای خۆیانەوە ویستیان، بارێکی گرانتر لەوەی تەحەمول بکرێت خستیانە ئەستۆی عەشیرەتەکانیان، ئەمەش

بەنیازێکی پاك بۆ ئەوەی کشتوکاڵ باش بکەن و دەرامەتی باش لە رێگەی فراوانکاری لە پاك کردنەوەی موڵکەکان و رێکان و هەڵبەستنی بەنداوەکان، دابین بکەن. بەمەش گیرفانیان زۆر چاك پڕکرد، دوای بەسەرچوونی کات، شێخەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو دەسەڵاتەیان نییە، کە پێویستە لای تاکەکانی عەشیرەتەکەیان هەیانبێ، ئەوانیش بەهۆی ئەمەوە ئازار دەچێژن.

(٢) راستییەکی دیکە کە هەر تەنها عێراق ناگرێتەوە، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی بێزاری، ئەویش شاردنەوەی ئەوەی بە حاڵەتی دوای جەنگ ناودەبرێت، بەشێوەیەکی پەیژەیی. وەك بەرزی نرخەکان و کەمی هەندێ پێداویستی. .. هتد. بەڵام ئەو حاڵەتە بۆ چەند چینێکی دانیشتوان کە لە رێگەی سوپای داگیرکەرەوە سامانیان چنگ کەوتووە، کاریگەرییەکەی کەمتر ببوو، بەڵام زۆربەی چینەکان هەستیان بە توندی فشارەکە دەکرد، ئێمەش وەك سەرکەوتووی جەنگەکە (یەکەم جەنگی جیهانی)، پێویستە لە عێراق و شوێنانی دیکە بەرپرسیارێتی بەرقەرارکردنی ئەم بارە لە ئەستۆ بگرین.

(٣) لەوانەیە ئەمەیان لە هەمووی (فاکتەرەکان) گرنگتر بێت، ئەویش هەستکردنی شۆڕشگێڕەکانە بە لاوازی سەربازیمان. دیارترین شت لە رۆژهەڵات ئەوەیە کە لە پیاو دەدەن کاتێ دەکەوێت، ئەمەش لە ماوەی چەندین سەدەیە لە رفتارە پیادەکردنی رۆژهەڵاتی دا هەیە.

(٤) موجتەهیدەکانی شیعە، هەر لە سەردەمی خەلیفەکانی موسوڵمانانەوە، دژایەتی سەرجەم حکوومەتەکان دەکەن.

(٥) چواردە بەندەکەی ویلسن و ئەو جولانەوانەی کە لێ کەوتنەوە شەریفییەکان و تورکیا و بەلشەفیکەکان کە خۆبەخش و بەکرێگیراوانە لە وڵات کاریان دەکرد، چواردە بەندەکەیان بۆ ورژاندنی خەڵك بەگرخست.

(٦) جیاوازی ئایینی و نەتەوەیی لە نێوان بەریتانییەکان و عەرەبەکان، کرایە بەهانەیەك بۆ دژایەتیکردنێکی گەورەتر، لە بری ئەوەی خۆی هۆکارێکی بووبێ.

(٧) دواکەوتنی سەیرکردنی ڕەوشی عێراق و ئەو دەرەنجامانەی کە بەهۆی مانەوەی ڕاستەوخۆی ئیدارەی بەریتانی بۆ ماوەیەکی درێژ، دوای شەڕ ڕاگرتنەکە، لێی کەوتنەوە. ئەگەر یادەوەریم خیانەتم لێ نەکات تا مانگی تشرینی یەکەمی ١٩١٩ هۆشداریم دراوەتێ کە هیچ ڕێوشوێنێك یان بەیاننامەیەك دەرنەکەم، کە ئەوە بگەیەنێ، کە ئێمە ئینتیدابمان بەسەر عێراقەوە پێ بەخشراوە یان پێی ڕازیبووینە.

(٨) کاریگەری سوریا، بەخشینە داراییەکانی بەریتانیا یارمەتی حکوومەتی شەریفیان دەدا، کە بتوانێ مووچەیەکی دیکەی ڕێکخراو لەسەر بنەمای لێهاتوویی، بەکارمەندان و سوپا بدات.

(٩) پێویستی حکوومەت بە کرێکار، بۆ دامەزراندنی بەنداوی لافاوەکان. تاکی عەرەب بەرەڵڵاکردنی لافاوی لە گلدانەوەی ئاوەکە و دروست کردنی بەست پێ باشترە، چونکە لافاو لە کاری خودایە دروست کردنی بەند و بەنداویش لەکاری بەریتانییەکانە.

(١٠) کۆکردنەوەی باجی زەوی و باجەکانی دیکە.

(١١) بەکارهێنانی فڕۆکە لە دژی تێکدەر و یاخیبوان.

(١٢) ترس، لە جەختکردنەوەی ڕۆژئاوا لەسەر قازانجی زۆر.

(١٣) بێ هیوایی خودان بەرژەوەندییەکانی زەوی، ئەوانەی بیرۆکەی ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە دەڵێن: (خودان زەوی (مەللاك) چۆن ئەرکی دەکەوێتە سەر مافیشیان هەیە)،

هەر هەوڵێکی نایاسایی (وەك ئەوان دەڵێن) وا لە جووتیاران بکات کاری جیددی لە زەویدا نەکەن، بە قێزەوەن دەزانن، بەلام جووتیاران لەلای خۆیانەوە لە هەر هەوڵێکی حکوومەت بێزارن کە بە زەبری یاسا و سیستەم لە بڕی مەللاکەکان باج کۆبکاتەوە. زۆربەی جار ئالۆزییەکانی یاسای تورکی لەمبارەیەوە هەڵوێستی حاکمە سیاسییەکان زۆر سەخت دەکات،

(١٤) زۆر کەس لێرە، هەروەها لە بەریتانیاش، لەو باوەڕەدان کە من لە نەنوانندنی مامەڵەیەکی توندوتیژ لەگەڵ بزوێنەرە دیارەکانی شۆڕشەکە، هەڵەم کردووە، بەر لە ماوەی ئەو بزووتنەوەیە بگاتە ئەو ئاستەی کە ئێستا هەیەتی لە هەموو مەوداکانیەوە.

ئەو رایە دەخەنەڕوو. ئیدارەیەکی لەو جۆرە، پێویستە لە رەوشێکی ئاوا سەختدا، ئەو سنووره دیاری بکات، کە تێیدا هەر بزووتنەوەیەکی دەستووری دەبێتە بزوتنەوەیەکی ترسناك، کە دەبێت سەرکوت بکرێت یان رێگەی پێبدرێت. هەرچەندە ئامانجەکانی ئەم رێوشوێنانە بە ئامانجێکی ناکرداری دادەنرێت، زۆربەی جار حکوومەتی خاوەن شکۆ لەمیانەی بەیاننامە فەرمییەکانیدا ناوە ناوە بڕیاری لەسەر دەدات (پەسندی دەکردن)، ئەگەر ئەو شێوازەی کە ماددەی ٢٢ی مساقی کۆمەڵەی نەتەوەکانی پێ داڕێژرابوو، وەربگرین، ئەوا من لە دەستگیرکردنی هەموو ئەوانەی کە ئێستا دەریدەخەن کە حەزبە رازی بوون بە ئینتیدابی بەریتانی لەسەر ولاتەکەیان ناکەن بەگومانم، مادام ئەمە ئاسایشی گشتی ناخاتە مەترسییەوە (هەڕەشەوە)[١].

## وتاری ماڵئاوایی[٢]

لە ٢٠ی ئەیلول بۆ دوایین جار بە ئاشکرا رای خۆم سەبارەت بە رووداوەکانی ئێستا، دەربڕی، ئەمەش لە وتارێکی ئێوارە خوانێك کە دائیرەی هێڵی ئاسن بە سەرۆکایەتی ژەنەڕال (لۆبۆك) و سێ کەسی زۆر بەتوانا (مستەر تنش، مستەر رۆسیرا و مستەر کیرناندر) وەك رێزلێنان، بۆ منیان رێکخستبوو، پێشکەش کرد.

ئێرە شوێنێکی گونجاوە کە بەشێك لەوەی بە رۆژنامەی ((الاوقات العراقیە))دا بڵاوکرایەوە، باس بکەم، چونکە ئاماژەن بۆ راکانی من، لەو سەروەختە:

... ئێستا ئاوڕ لە رووداوە هەنووکەییەکانی ولات دەدەمەوە و دەڵێم، ئەو چەند مانگەی دوایی هەموومانی دڵتەنگ کرد، گومان شوێنی هیوای گرتەوە. دەپرسین

---

١- لە تێکستە عەرەبییەکەدا (یهدد) بەکار هاتووە، بەڕای من وشەی (لا) ی لە پێشە، بەلام بەڕێنراوە، چونکە ماناکەی لەنگ دەکات.

٢- لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی هەڵگیرسانی شۆڕش لە عیراق گۆڕینی ئیدارەی مەدەنی و لادانی ئارنۆلد ویلسن بوو لە پۆستەکەی، بەر لەوەی عیراق جێبهێڵێت ئاهەنگی رێزلێنان و ماڵئاوایی زۆری بۆ کرا لە یەکێ لەو ئاهەنگانە ئەو وتارەی پێشکەش کرد.

ئاخۆ ئـەو شـتانە بـۆ روویانـدا؟! لـەو بـاوەڕەدام کـە هێـزە مەعنەوییـەکان نـەوەك ماددییەکان، زیاتر لە جاران جیهان دەهەژێنن، جیهان بە تیۆر و نموونە باڵاکان نەوەك حکوومەتەکان و حەقیقەتەکان.

سەردەمێکی زۆر بەسەر جیهاندا تێ پەڕیوە، ئەو سـەردەمەی کـە ئـەو نموونـەی باڵایەی کە لە رۆژهەڵات بەرهەم هات، کاریگەرییەکی قـوڵی لـە فیکـری رۆژئـاوایی کرد، بەڵام ئێستا ئێمە پرۆسەکە بە پێچەوانە دەبینین.

کۆتایی سەدەی ١٩ بوژانەوەی گیانی نەتەوەیی لە ئـەوروپا و ئاسـیا بـە خۆیـەوە بینی، ئەمەش پەرچە کردارێکی ئـەو نیگەرانییانـە بـوو کـە خـەڵکی لـە کێڵگـە و شەقامدا بەرامبەر بوونی ئیمپراتۆرە مەزنەکان بەخۆیەوە خەریك کرد. ئەگەر خەڵکان بەشـی خۆیـان لەسـەر بنـەمای جـەخت کردنـەوە لـە بەرژەوەندییـە هاوبەشـەکان بەشێوەیەکی گشتی هەبێ، نەوەك لەسەر بنەمای ئەو جیاوازییانەی کە نێـوان بەشـە جیا جیاکانی دا هەیە، بەڵام خەڵکی نەیاندەتوانی ئەمە ببیـنن و دەسـتگیری بکـەن. بۆیە وایان لێهات ئەو شتانەیان پێ باشتربێ کە هەست دەکەم بۆ خۆیان دەگەڕێتـەوە. نەتەوە پەروەری بووە بنەمای دوایین پەیماننامە ئاشتییەکان.

بۆ پارێزگاریکردن لە مافەکانی نەتـەوە بچـووکەکان، چـووینە نـاو جەنگـەوە، ژمارەیەك لەو نەتەوانەی کە ئیمپراتـۆری بـەریتانیایان پێکـدێنا، بـە پێوانەیـەکی فراوانتر، حەزیان بەم جۆرە بیرۆکەیە نەدەکرد. ئـەو رەخنـە گرانـەی دژایـەتی ئـەو بیرۆکەی وەرگرتنی نەتـەوە پـەروەری وەك سیاسـەتێکی بونیادنـەر لـە حـوکمڕانی دەکرد. دەمکوت کران.

تۆی نەتەوە پەروەری لە نیشتیمانی دایك، چێنرا، بەڵام ئەو سوپایەی کە لە بەسرە لە ساڵی ١٩١٤ دابەزی بوو، ئەوەندە بۆ کارکردن بەم جۆرە بیرۆکانـە چـالاك نـەبوو. ئەگەر ئەرکی ئێمە بەزاندنی (شکاندنی) تورکەکان بوو، ئەوا ئەمەمان کرد. ئەوکات، وەك لۆرد (هاردج) دەڵێت، ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩١٥ سـەردانی بەسـرەی کردبـوو، ئێمە بە تەنها نەدەجـەنگاین، بـەبێ ئـاڵوگۆڕی بـیروڕا لەگـەڵ هاوپـەیمانانمان نـەمان

دەتوانی پلانی دوارِۆژ راکێشین، بەلاّم ئێمە باوەڕمان وابوو، کە ئیدارەیەك کە زۆر بەسۆز و دادوەر بێت، لێرە بەدواوە ئەو گەشەسەندنەی کە توانا دەولّەمەندەکانی وایکرد ئەو ناوەی لێبنرێت، بۆ عێراق دەگەڕێنێتەوە.

لەسەر ئەم بنەما نارِۆشن و نادیارە، بەردەوام بووین، تا بەغداش داگیر کرا. لەو کاتەشدا تۆوی نەتەوەپەرستی لە ئەوروپا چەکەرەی کردبوو، رووەکەکە لە رۆژهەلاّت، بەروبومێکی سەوزی گرتبوو. شۆڕشەکەی شەریف بەو پێیەی بزووتنەوەیەکی نەتەوەییە و، عەرەبەکانی پێ دەجولّێنرێت، راگەیەنرا. لەبەرامبەر هاوکاری هێزە عەرەبەکان، هاوپەیمانان بەلّێنیان دا کە رێز لە خواستە عەرەبییەکان بگرن و پالّپشتی بکەن.

نەبەردی هێزە چەکدارەکانی (تاج)، وایکرد بەغدا داگیر بکرێت. هەولّەکانی ئەفسەرانی ئیدارەی مەدەنی وایکرد، حکوومەتی خاوەن شکۆ لە توانای کرداری جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتەی کە ژنەرال مۆد سالّی ۱۹۱۷ رایگەیاند، تێ بگات. کە دواتر ئەمەی خستە ناو پەیماننامەی ئاشتی لەگەلّ تورکیا، واتا، پێکهێنانی چەند دەولّەتێکی سەربەخۆ لەو بەشانەی ئیمپراتۆری تورکیای عوسمانی کە نەتەوەی ناتورکی تێدا نیشتەجێن.

بەدەست هێنانی هەر سەرکەوتنێکی نوێ لە عێراق، بە پێشکەوتنی دیکە لە ناوەخۆی ولاّت بەندبوو، بە حوکمی دەرەنجامی شەڕ راگرتن، خۆمان لەبەرامبەر ویلایەتی موسل و بەغدا و بەسرە بە بەرپرس بزانین و پابەندبین بەو سیاسەتانەی ژنەرال مەحموود رایگەیاند، بەلاّم هێشتا بەبێ پەیوەندی کردن بە هاوپەیمانان نەماندەتوانی ئەمە لە بواری جێبەجێ کردندا دابنێین. ئەوا شەش مانگ بەسەر شەڕ راگرتنەکەدا تێ دەپەڕێ، بەلاّم هێشتا جێبەجێ کردنی نیزامی ئینتیداب بەسەر عێراق، بە گوێرەی ئەوەی لە پەیماننامەی ئاشتی دارِێژرابوو، بڕیاری لەسەر نەدراوە. ئەوا سالّێك بەسەر شەڕ راگرتنەکەدا تێ دەپەڕێ، هۆشداریمان دراوەتێ کە هیچ شتێك، کە لەوانەیە ئەو مۆرکەی لێبکەوێتەوە، کە رەوشی سیاسی داهاتووی عێراق

بڕیاری لەسەر دراوە، یان بڕیارەکانی ئاشتییەکە زانراون. ئێمە وا مەزەندەمان دەکرد کە بەیاننامەی ئاشتی لەگەڵ تورکیا لە پاییز زیاتر دوا ناکەوێت.

بەم شێوەیە کارە لۆکاڵییەکانمان لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری تێ نەدەپەڕی، ئێمە نەماندەتوانی لە عێراق هیچ کارێك بکەین، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ڕاستەوخۆ دوای شەڕ ڕاگرتنەکە حکوومەتی عەرەبی لە سوریا پێکهێنرا، ئەم کاتەش هاوڕێکەوتی دەرکردنی تورکەکان بوو لە حەلەب، سنووری سەربەخۆی تەواوی لە ساڵی ١٩١٩ بە دەست هێنا، کاتێ هێزەکانمان ئەوێیان جێهێشت، لەکاتێکدا لە بەغدا، ئەم شێوەیە دەستمان بەدوا کەوتنی دوور مەودای پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا بەسترا، لە سوریای باکوور ئەو پابەندییانەی کە هاوین دابوویان، جێبەجێ کرا. پڕۆپاگەندەی چالاك لەلایەك و بێزاری ناسروشتی لەهەندێ ناوەند لەلایەکی دیکەوە، دەرهاویشتەی ئەو دوورییە لە مامەڵە کردن بوون. پێمان ڕاگەیەنرا بوو، کە ئێمە ناتوانین لێرە هیچ شتێ بکەین، هەتاکو کۆنگرەی ئاشتی نەگاتە بڕیارێك. چەند مانگێك تێپەڕی و بەستنی ئاشتی لەگەڵ تورکیا، هێشتا چاوەڕێی بڕیاری ئەمریکا سەبارەت بە وەرگرتنی ئینتیداب بەسەر چەند بەشێکی دەکات، جەنگ لەسەر سنوورەکانمان هەبوو، عێراق خۆشی ئارام بوو، بەڵام ئەو تۆوەی کە بەدەستی خۆمان چاندبوومان، دەستی بە گەشەکردن کردبوو. ئیدارەی کاتی سەربازی و مانەوەی حاڵەتی جەنگ، لە شار و وڵاتە گەورەکان، کاریگەری خۆیان مابوو، بۆ هەندێ چینی کۆمەڵایەتی ببوونە، شتێکی بێزارکەر، بەڵام ئێمە لە ئاڕاستەکردن و سەرخستنی ڕای گشتی دا جگە لە کارێکی کەم هیچمان لە دەست نەدەهات بیکەین. فەرمانەکانمان سەبارەت بەوەی کە نابێت هیچ بونیاد بنێین. هەروەها نەماندەتوانی بزانین کۆنگرەی ئاشتی چی بڕیار دەدات، بەڵام هەر دەمانتوانی لە دوورەوە سەیر بکەین و ئەو دواکەوتنە بە هەڵگیرسانی پەشێوی لە وڵات ببینین. لەو لاشەوە مۆڵەت دان بە سەربازەکان بەردەوام بوو، تا وایلێهات لە ڕۆژی یەکەمی مانگی ئایاردا تەنها (٥٠٠٠) جەنگاوەری بەریتانی و (٣٠) هەزار جەنگاوەری هیندی مانەوە.

هەر لەماوەی ئەو مانگەدا، ئەنجوومەنی باڵای کۆنگرەی ئاشتی ئینتیدابی عێراقی بە بەریتانیای مەزن بەخشی. بەڵام بڕیاری سەبارەت بە دامەزراندنی ئەو حکوومەتەی کە پێویستە پێکبهێنرێت تێدا وەرنەگیرا بوو. هەروەها راوێژکردن بە رای گشتی ناوەخۆیی بە پێویست دانا، ئەمەش ئەرکێکی ئاسان نییە. لەو ساتە وەختە ناسکەی مێژووی عێراق توێژێکی دیاریکراو لە پیاوانی (چاوچنۆك، کورت بین، کەم ئەقلتر و دیدە کورتتر لە خەڵکانی دیکە) ئاسایی بوو لە پشت دەمامکی دەستوورییەوە، بزووتنەوەیەك، لە ماوەی دوو مانگدا بە ئاشکرا ببێتە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕ بورژێنن، کە دەمارگیری و ئاژاوە گێڕی لە خۆ بگرێت، لە مانگی تەممووزدا شۆڕش تەقییەوە، ژیان و مولکی وێران کرد، ئەمەش پێویستی بە چەندین ساڵە تا چارەسەر دەکرێت[1]!

ئێستا خراپەکاری نەماوە، بەهاتنی وەرزی سارد و دروێنە، لە کۆتاییدا ئەو پەشێوییانەی ئێستا هەر سەرکوت دەکرێت، ئەگەر ئەمەش نەکرێت، ناتوانرێت سیاسەتێکی دروست لەم وڵاتە دەست پێبکرێت. بۆ ئەم ئەرکە سێر پیرسی کۆکس بانگهێشت کرا، دڵگرانم بە جیابوونەوەم لەو ئیدارەیە کە زۆر شانازیم پێوە دەکرد، هەروەها دڵگرانم بە جیابوونەوەم لە برادەرانم لێرە لە کارمەندان و ناکارمەندان، ئەوانەی کە بە کارکردنیان سەرسام بووم و بەرژەوەندییەکانیان زۆر لە دڵم نزیك بوو، تا پاداشتیان بکەم و بەمەش دڵخۆش دەبم. دەزانم ئێوەش لەم دڵخۆشییەم بەشدار دەبن، کاتێ ئەو (کۆکس) بۆ وڵاتی دەگەڕێتەوە.

متمانەم هەیە، کە تواناکانی ئەم وڵاتە و دانیشتوانەکەی، لاواز نییە، هەروەها حیکمەتەکانی حکوومەتی خاوەن شکۆش لاواز نییە و هێزە ماددی و مەعنەوییەکانی بەردەستیشی کەم نین، بە هەوڵ و یارمەتی خودا ئەو ئەرکەی کە دەستمان داوەتێ، ئەگەر ئارام بگرین ئەوا دەیگەیەنینە کۆتاییەکی سەرکەوتوو.

---

١- شۆڕشەکە لە فوراتدا لە ٢٠ی حوزێرانی ١٩٢٠ ڕاگەیەنرا.

کارمەندان دێن و دەڕۆن، ئیدارەکەش گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بەڵام دەبێت لەوە دڵنیا بین ئەو گیانەی کە پێشتر شانازیمان پێوە دەکرد، بۆ کارکردن لەلای دیکەش هانمان دەدات. یەکەمین گرنگیدانمان، گرنگیدانە بە بەرژەوەندی دانیشتوانی ئەم وڵاتە بەکۆتایی هات.

## ئاهەنگی ماڵئاوایی بەسرە

هیچ شتێ لەو خۆشەویستییەی کە لە ئاهەنگەکانی ماڵئاوایی لە هاوڕێیانم لە سەربازان و مەدەنییەکان پیشان درا، ناتوانێ زیاتر بێت، ژوورەکانی بازرگانی و گرووپە جۆراوجۆرەکان لە خەڵکی وڵات لە دەرختستنی خۆشەویستی خۆیان بۆ من، دوا نەکەوتن، ئەم ئاهەنگانەش لە رۆژهەڵات زۆر ساز دەکرێت، هەر وەك لە رۆژئاواش دەکرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی ژیانی فەرمی شیرین و خۆش بکرێت، پیاو ماقوڵانی بەسرە شمشێرێکی شەرەفیان پێدام، کە لەو بەنرختر نییە. بۆنەکەش ئێوارە خوانێکی ماڵئاوایی بوو، کە سیر پرسی کۆکس خۆی سەرۆکایەتی دەکرد، ژمارەیەکی نائاسایی میرانیش ئامادەی ئێوارە خوانەکە بوون. بەڵام ئەو ئاهەنگانە پەیوەندی بونیادی کە بۆ ماوەی زیاتر لە ١٠ ساڵە ئێمە بە یەکەوە دەبەستێتەوە، دەپارێزێ.

عەرەبی هەموو توێژەکان ئامادەیی ئاهەنگەکان بوون، لە دیارترین قسەکەرانی ئەو ئاهەنگە هەردوو هاوڕێم (عەبدولەتیف پاشا ئەلمەندیل) و (مەزاحم بەگ ئەلپاچەچی) بوون، پاچەچی ئەوکات خۆی بە نیشتیمان پەروەرێکی توندڕەو وەسف دەکرد و دامەزرێنەری بزووتنەوەی عەرەبی بوو لە ساڵی ١٩٦٠. بەشێك لە وتارەکەی لە خوارەوە دێنمەوە:

## وتاری مەزاحم پاچەچی

... زۆر دڵگرانم بەو کارە گێلانەی کە هەندێ تاکی عەرەب ئەنجامی دەدەن و نەتەوەی بەریتانی لە ئەرکە شەرەفمەندانەکەی هەراسان دەکەن. ئەو کارانە بەهۆی

خەونێکەوەیە، کـە ناتوانرێـت بـە دەسـت بهێنرێـت لەلایـەك، بـەهۆی بەرژەوەنـدی تایبەتیش لەلایەکی دیکەوە، ئەنجام دراون. زۆر بەداخەوە رەگەزی بیـانی سـەرکەوتوو بووە لە بەکارهێنانی ناوبانگ و سامان و خۆێنی عەرەبی، کە تێکەڵاوی بزووتنەوەکە بووە، ئەمەش بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، لە پێناوی لاوازکردنی پایەی بەریتانیای مەزن لە شوێنە گرنگەکانی جیهـان. لـە رۆژهەڵاتـدا بـە رووکەشـی دلـّرفێن فریـوو مەخۆن. ئەوەی ئێستا هۆزە بیابانییـەکان ئـەنجامی دەدەن، شۆڕشـێکی نیشـتیمانی راستەقینەیە و ئامانجی سەربەخۆییە. ناکرێت ئاوا بزووتنەوەیەك بـە بزووتنەوەیـەکی نوێنەری هەستی هەموو خەڵك لە قەلەم بدرێت. خێزانەکانی بەغدا هیچ هاوسۆزییەك بۆ ئەو بزووتنەوەیە پیشان نادەن کە کار بۆ وێرانکردنی وڵاتەکەیان دەکەن.

ئەمە هەستی ئەو خەڵکانەن کە لێرە بیروڕاکانیان قورسـایی هەیـە. ئەوانـەی بـە پەرۆشن ئەوەی بیری لێدەکەنەوە و هەستی پێدەکەن بەو بەریتانییانـە بگەیـەنن، کـە داوای کشانەوەی لە وڵات لێ دەکەن. ئەوان ناتوانن لەوە بگەن کە پاڵکشانەوە، جگـە لە پێشێلکردنی حورمەتی یاسا و وێرانکردنی گەل و بڵاو بوونـەوەی ئـاڵۆزی جـەنگی ئاسیایی، کە بەریتانیا ناکرێت لێی دورە پەرێز بوەستێ، لەخۆ دەگرێت.

## هەڵمەتی ئۆپۆزسیۆن لە لەندەن

لەبەر ئەوەی ئەم بیروڕایانەم هەڵگرتبوو، دەزانم هـەر هـەوڵێك کـە لـەماوەی مـانگی تشرینی دووەمی ١٩١٨ بۆ رازیکردنی حکوومەتی خاوەن شکۆ داومە، تا رێگەم پێبـدات دەست بە وەرگرتنی رێوشوێنی دەسـتووری بکـەم، بـەڵام بـەو پێیـەی کـە رێوشـوێنێکی پێشوەختەیە، رەت دەکرایەوە. بـۆ مـن زۆر سـەخت بـوو، خـۆم بـە لۆمـەکراوی ببیـنم، هەفتانە، لە ماوەی هاوینی ١٩٢٠ لەسەر وتاری ((تایمس)) و ((ئـۆبزەرڤێرر)) و ((دەیلـی هێراڵد)) و ئەوانی دیکە، منیان لۆمە دەکرد و بە کەسێکی بیۆکراتی وشك کە هەوڵی بـە هیندی کردنی عێراق دەدات، لەکەداریان کردم. (ئەوەی لەمبارەیـەوە غـەمبارم دەکـات، ئەوەیە کە پایەی مەندوبی سامی هەر لەو رۆژەوە کەسانی سەر بە دائیرەی سیاسی هیندی

وەریان گرتووە)، ئەمەش وایکرد هەموو لێدوانە دژەکان، لە رۆژنامە ناوخۆییەکان بە تەواوی بڵاو دەکرانەوە، گفتوگۆکانی پەرلەمان لە بارەی عێراق لە رۆژنامەی فەرمی، دووبارە کۆپی دەکرانەوە[1].

کاریگەری ئەمە هاندەر بوو، جیاوازی نێوان راستییەکانی ناوەخۆ و جیهانی داهێنەری رستەکان و پاککەرەوەی قسەکان زۆر گەورە بوو، بەشێوەیەك هەتاکو لە چاوی نیشتیمانپەروەرانیش مایەی گاڵتەجاری بوو. دەرەنجامی ئاماژە دووبارەبووەوەکان بۆ نەمرییەکانی حکوومەتی عەرەبی لە شام و بەلشەفی داهاتووی کۆماری ئێران و پێشنیازە پێشکەشکراوەکەی (لۆرنس) (پاشای هەڵبژێردراوی عێراق لەوانەیە عەرەبی نەبێت و ئینگلیزی بێت)، پەرچە کردارێکی دروستی بەتایبەتی لای عەرەب دروست کردە، چونکە (تی. ئەی. لۆرنس) ئەوکات هەتاکو بەناویش نەناسرا بوو. هەرچی نووسراوی نێردراوی (سێر جۆرج بۆکانان) بوو بۆ ((تایمس)، ئەوا رەگەزێکی پەسندی پێکەنین ئامێزی لە ناکۆکییەکە زیاد کرد. بۆکانان، دامەزرێنەری بەندەری بەسرە و شۆستەی گەورەی ((مەعقل)) نووسینەکەی لە بارەی گرنگی کۆنترۆڵکردنی خەرجییەکانی ئەشغالی گشتی و ئەرکەکانی سەرۆکی باڵای ئیداری لە وردبوونەوە لە مەزەندەکانی ئەندازیارانی برادەری، بوون.

---

١- وتاری (تی ئەی لۆرنس) لە دەیلی هیرالد، ١٩٢٠/٨/٩.

# بەشی پێنجەم

## شۆڕشەکە لە ناوچە کوردییەکان

دۆزی کورد، راستەوخۆ دوای شەڕ راگرتنەکە، دەردەکەوت، کە لە (٣) لایەنی دیارەوە، خۆی بەهاوپەیمانان ناساند، ئەو سێ لایەنەش پەیوەندی زۆرتوندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە:

١. داهاتووی ئەو بەشەی ویلایەتی موسڵ، کە زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی کوردن.

٢. داهاتووی ئەو ناوچە کوردییانەی کە دەکەونە دەرەوەی ویلایەتی موسڵ یان باکوورییەوە.

٣. پەشێوییەکانی هۆزە کوردییەکان، ئەوانەی کە دەکەونە وڵاتی ئێرانەوە، ئەو پەشێوییانە لەلایەن ئەو کوردانەوە، دەورژێنران، کە کەوتبوونە ئەودیوی سنوورەوە، بە مەبەستی تایبەتی ئەنجام دەدران.

وشەی ((کوردستان)) وەك وشەی ((نێوان دوو رووبارەکە)) زاراوەیەکی ورد نییە و بەشێوەیەکی گشتی هیچ گرنگییەکی جوگرافی دانپیانراوی نییە، کوردەکان خۆیان، رەگەزی ئارین، پەیوەندی خزمایەتی بە نەتەوەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات لەلایەك و دانیشتوانی بانی ئێرانی لەلایەکی دیکەوە، بە یەکەوەیان دەبەستێتەوە.

هەرچی سەبارەت بەو بیروباوەڕ و ئاییینەی هەڵیانگرتووە، ئەوا زۆربەری هەرە زۆریان موسوڵمانی سوننەن. پێ دەچێت زمانەکەیان، کۆنترین زمانی وڵاتی ئاسیای رۆژئاوا بێت و پەیوەندی خزمایەتی بە زمانی ئاڤیستایی و فەهلەوی، هەیە. دیالێکتیکە زۆرەکانی جیاوازییەکی زۆریان لە نێواندا هەیە، بەشێوەیەك خەڵکی سلێمانی بەزەحمەت لە خەڵکی ئامێدی دەگەن، لەوانەیە کوردەکان

داهێنراوترین نموونەی رەگەزی مرۆڤایەتی بن لەڕووی جەستەییەوە، لەڕووی سیما و خەسلەتیانەوە تاڕادەیەك بە ئەفغانییەكان دەچن. ئەوان راستەوخۆ نەوەی میدییەكانن. كوردەكان لە دۆڵی قوڵ دەژین و زنجیرە چیای بەرز لە جیرانەكانیان دابڕاندوون. بەشێوەیەك تا ئەم سەردەمەی دوایی بە تەواوی لە دونیای دەرەوە دابڕاو بوون، جگە لە مامەڵەیەكی كەم، هیچ زانیارییەكیان بە دونیای دەرەوە نەبوو. تا ئەم دواییانەش لە یەكگرتنی نەتەوەیی و دەستگرتن بەرەگەزەوە، بە یەكجاری داشۆرابوون. تاكە یاسایەك بیزانن، یاسای هۆزایەتی بوو، تاكە ملكەچییەك كە دەیاننواند، بۆ سەرۆك تیرەكانیان بوو، هەتاكو ئەمەش (ملكەچی بۆ سەرۆك عەشیرەت) بە ئاسانی دەتوانرا بگۆڕدرێن.

پێشتر كۆی ژمارەی كوردەكانی ویلایەتی موسڵ مەزەندەكرا بوو، دواتریش ئەم راپۆرتە دڵنیاكرایەوە، دەركەوت كەمێك زیاترە لە نیوەی دانیشتوانی ویلایەتەكە. كوردەكان ژمارەیەكی باش لە سوارچاكی نانیزامییان لە سەرەتاكانی جەنگی جیهانیدا پێشكەشی توركەكان دەكرد. بەڵام جگە لە ژمارەیەكی كەمی سەرباز نەبێت، كوردەكان نەچوونە ریزی سوپای توركیاوە، سەرباری ئەوەش كوردەكان ئازارێكی زۆریان بەدەستی روسی، هاوپەیمانان و ئەرمەن و ئاشوری هەڵخەلەتێنراو، چێشت، كاتێ لە هاوینی ١٩١٨ بەبێ ئەوەی هیچ گیانبازییەكی مەترسیدار لەم پێناوە بدەن، هەڵیان بۆ رەخسا و زۆر بەتوندی تۆڵەی خۆیان لە ئاشورییەكان كردەوە. هەموویان، بەبێ هاڵاوێردن، زۆر حەزیان دەكرد دەستبەرداری لایەنگیری توركی بكەن، بەڵام پاشەكشەی لەناكاومان لە كەركوك لە ئایاری ١٩١٨، زۆر ترس و بێزاری لە دەروونیان دروست كرد. دانیشتوانەكەیان زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێكردین، هێندەی پێ نەچوو، تا خۆیان لە بەرامبەر توركە گەڕاوەكاندا بینی.

هەرچەندە، ئێمە لە راستیدا زیاتر لە كەسانی دیكە پەناگەی ئەوانەمان دا كە یارمەتی ئێمەیان دابوو، توركەكان بە ئەنقەست موڵك و گوند و باخچە و

خانوویانی وەك تۆڵە سەندنەوەیەك وێران کرد. لە کۆتاییدا، بێزارییەکەیان لە دەروون نەما. بەڵام کەشی گومان و دوو دڵی سەبارەت بە نیازەکانمان بەرامبەر ئەوان، بە رواڵەتیانەوە دیاربوو. نەدەتوانرا بۆ پاککردنەوەی ئەو کەشە هیچ بکرێت، چونکە لە راستیدا نیازەکانمان شتێکی گومان هەڵگر بوو، تا ئەوکاتەی کۆمەڵەی گەلان بواری بۆ رەخسا، نەخشەی سنووری باکووری ویلایەتی موسڵ دوای شەش ساڵ، بکێشێ.

## کوردستان دوای شەڕ راگرتن

لەپەیمانی شەڕ راگرتنەکەی تورکیا گەیشتین و ئێمە دووبارە کەرکوکمان تا ئاڵتون کۆپری داگیرکردەوە. دوای چەند رۆژێکیش دەستمان بەسەر هەولێردا گرت، بۆ ئەوەی بواری ئەوەمان بۆ برەخسێ دانەوێڵە و سوتەمەنی بەدەست بخەین، سلێمانیش کە لەژێر دەستی تورکەکاندا بوو، دەمێك بوو شێخ مەحموود ئێمەی بۆ ئەوێ بانگهێشت دەکرد، بەپێی بەندەکانی شەڕ راگرتنەکە سوپاکانی تورك لەو شارە کشانەوە، مێجەر نۆئیل بۆ توێژینەوە لە رەوشەکە و ئاگادارکردنەوەی ئێمە لەو حاڵەتەی لەوێ هەیە، لە سلێمانی دانرا. لە ناوەڕاستی تشرینی دووەمی ١٩١٨ گەیشتە ئەوێ و زۆر بەپەرۆشەوە پێشوازی لێکرا. رێنماییەکانی من بۆ مێجەر نۆئیل، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لە یەکی تشرینی دووەم نۆئیلم بە حاکمی سیاسی ناوچەی کەرکوك دیاری کرد، ناوچەی کەرکوك لە زێی خواروو تا دیالە لە باشوور درێژ دەبێتەوە، لە باکووری رۆژهەڵاتیش تا سنوورەکانی تورکیا و ئێران درێژ دەبێتەوە. کەرکوك بەشێك لە ویلایەتی موسڵ پێکدێنی، ئەو ویلایەتەی کە کێشەکەی بەشێوەیەکی کۆتایی لەلای حکوومەتی خاوەن شکۆ لەژێر لێکۆڵینەوەدایە.

پێویستە ئەو ناوچەیە لەکاتی ئێستا بەناوچەیەك ناو لە چوارچێوەی دائیرەی داگیرکەری سەربازی بەریتانی و ئیدارەی هێزەکانی دابنرێت. لەکاتی

مامەڵەکردنت لەگەڵ سەرۆکە لۆکاڵییەکاندا، پێویستە ئەو ئەگەرە لەبەر چاو بگریت و پێویستە ئەوەشت لەیاد نەچێت کە ئەگەری ئەوە لە ئارادانییە کە دەسەڵاتی سەربازی بتوانێ بەشێك لە سوپا بەشێوەیەکی جێگیر لە سلێمانی یان هەر شوێنێکی دیکە کە دەکەونە رۆژهەڵاتی هێڵی ئێستامان، تەرخان بکات. پێویستە ئامانجت گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بێ لەگەڵ سەرۆکە لۆکاڵییەکان بۆ ئەوەی ئارامی و ئاسایشی ئەو ناوچانەی دەکەونە دەرەوەی سنووری داگیرکاریمان بەرقەراربێت.

هەروەها پێویستە بەکرێگیراوان یان دەربکرێن یان خۆ بەدەستەوە بدەن، هەروەها پێویستە کاڵا و پێویستییەکانی سوپا ئامادە بکەی. تۆش دەسەڵاتی تەواوت لە خەرجکردن کە بەپێویستی دەزانم بۆ ئەم ئامانجە، دراوەتێ، بەڵام دەبێت بۆ خەرج کردنی برە پارەی گەورە، پێشوەختە رەزامەندی وەربگرێت. دەبێت لای سەرۆکەکان ئەوە روون و ئاشکرابێت، کە هەر رێوشوێنێك تۆ دەیگریتە بەر دەبێت کاتی بێت و بتوانرێت چاوخشاندنەوەی پێدا بکرێت لەهەر کاتێکدا. هەروەها تۆ دەسەڵاتت پێ دراوە کە شێخ مەحمود وەك نوێنەری ئێمە لە سلێمانی دیاری بکەیت، ئەگەر ئەمە بە پێویست دەزانی. هەروەها لە چەمچەماڵ و هەڵەبجە و شوێنانی دیکەش خەڵك دابمەزرێنن، ئەگەر گونجاو بوون....

پێویستە بۆ سەرۆك هۆزەکانی روون بکەیتەوە، کە ئێمە هیچ نیازێکمان نییە، کە ئیدارەیەکی نامۆ بە داب و نەریت و خواستەکانیان، بچەسپێنین. پێویستە سەرۆکی عەشایەرەکان بۆ پێکهێنانی یەکێتییەك (اتحاد) هان بدەیت، بۆ ئەوەی کاروبارە گشتییەکان بەرێنمایی حاکمە سیاسییەکانی بەریتانی یەکلا بکرێنەوە. ئەوانیش بەگوێرەی یاسای عوسمانی دەبێت باجەکان بدەن، ئەم یاسایە دواتر لەکاتی پێویست برگەی دیکەی بۆ زیاتر دەکرێت و هەموار دەکرێت، بە مەبەستێك کە پەیوەندی بە بەرقەرارکردنی ئاسایشەوە هەیە.

## دامەزراندنی شێخ مەحموود لە سلێمانی

کاتێ شێخ مەحموود گەیشتە سلێمانی، راستەوخۆ دەستپێشخەری جێبەجێکردنی ئەو رێنماییانەی دەرکرد و دەزگای حکوومەتی کاتی پێکهێنا، ئەو حکوومەتەی کە هیوا خواز بووین لای دانیشتوانەکەی پەسند بێت و خواستەکانیان لە پێکهێنانی ئیدارەیەکی کوردی بهێنێتەدی. شێخ مەحموود بەحاکمی ناوچەکە دیاریکرا، هەروەها هەر ناوچەیەکی دیکەی لاوەکی فەرمانبەرانی کوردیان بە رێنمایی حاکمە سیاسییەکانی بەریتانیا بۆ دیاریکرا. لەهەمان کاتدا چەندی کرا، فەرمانبەرە تورك و عەرەبەکان لابران و بە خەڵکی دانیشتوانی کوردستان گۆڕدران، لەهەمان کاتدا ئەفسەر و سەربازە تورکەکان ئەوانەی لە شارۆچکەکە هەبوون، وەك ئێشکگر رەوانەی بەغدا کران. لەرێگەی شێخ مەحموودەوە، وامان لە هەر سەرۆکێك کرد کە بەرامبەر ئێمە سەبارەت بە ئیدارەی هۆزەکەی بەرپرس بن، هەروەها داننرا بە شێخ مەحموود وەك فەرمانبەرێکی حکوومی و مووچەی ماندوو بوونەکەی پێ دەدرا.

ئەرکی یەکممان، چارەسەرکردنی ئەو هەژارییە بوو کە باڵی بەسەر شارەکەدا کێشابوو، هەروەها چارەسەرکردنی برسییەتی بڵاو لە هەموو شوێنێ، بەشێکی گەورەی شارۆچکەکە، لە سەردەمی تورکەکان وێران ببوو، ماوەیەکی درێژبوو بزووتنەوەی بازرگانی لە شارەکە وەستابوو، دەڤەرەکانی دەوروبەریشی بەڕادەیەکی ترسناك هەژار بوون. کەلوپەلی خۆراك و دانەوێڵە هاوردەکرا و هەنگاوی پێویست بۆ کارکردن بۆ بوژاندنەوەی بازرگانی ناوەخۆ نرا. ئینجا مزگەوت و تەلارە گشتی و گەورەکان نۆژەن کرانەوە و مووچەی قازییە کوردەکان و سەرجەم ئەو فەرمانبەرانەی کە پەیوەندییان بە کاروباری ئایینییەوە هەیە درا. ژمارەیەکی کەم لە سەرۆك عەشایەرەکان و جەردەکان نەبێ، هەموو خەڵك پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لە گەڕانەوەی ئارامی و ئاسایش کرد، هێندەی پێ نەچوو بیرۆکەی ((کوردستان بۆ کوردان)) لەژێر سایەی بەریتانیا، روون و ئاشکرابوو، تا دەهات جەماوەری دەبووەوە و پێش دەکەوت.

له یه‌کی کانونی یه‌که‌می ۱۹۱۹ بۆ ناسینی ژماره‌یه‌ك سه‌رۆکه دیاره‌کانی کورد، به فڕۆکه سه‌ردانی سلێمانیم کـرد، دوای ســه‌ردانه‌که گفتوگـۆی درێـژم له‌گـه‌ڵ شـێخ مه‌حموود و ژماره‌یه‌ك سه‌رکرده‌ی دیکـه ئـه‌نجام دا. دڵنیاکرامــه‌وه کـه ناوچـه گونـد نشینه‌کانی ئه‌وێ زۆر به‌توندی به‌رگری له گه‌ڕانه‌وه‌ی تورکـه‌کان ده‌کـه‌ن. گه‌ڕانــه‌وه‌ی تورکه‌کان، به‌سروشــتی ره‌وشــه‌که، شــتێك بــوو، ئه‌گــه‌ری روودانــی هــه‌بوو، دان بــه پێویستی پێکهێنانی شێوه‌یه‌ك له شێوه‌کانی پارێزگـاری بــه‌ریتانی نـرا، بــه‌ڵام کـۆی ده‌نگ له‌باره‌ی ئه‌و ئامرازه‌ی که به‌هۆیه‌وه ئه‌و پارێزگارییه دابـین ده‌کرێـت، دروسـت نه‌بوو. هه‌ندێ له سه‌رۆکه‌کان پێیان بـاش بـوو ئیداره‌یــه‌کی چـالاکی ئینگلیزیــی لــه کوردستان هه‌بێ، له کاتێکدا هه‌ندێکی دیکه ئه‌و بیرۆکه‌یان ره‌تکرده‌وه.

هه‌روه‌ها هه‌ندێکی دیکه‌یان پێیان له‌سه‌ر ئه‌وه داده‌گرت، که کوردستان راسته‌وخۆ سه‌ر به له‌نده‌ن بێت نــه‌ك ســه‌ر بــه به‌غـدا. هه‌نـدێکی دیکه‌شـیان بــه‌نهێنی پێیــان راگه‌یاندم، که ئه‌وان هه‌رگیز به سه‌رۆکایه‌تی شـێخ مــه‌حموود به‌ســه‌ر وڵاتــه‌وه، رازی نابن. به‌ڵام ئه‌وان نه‌یانتوانی به‌دیلی شێخ مه‌حموود پێشنیار بکه‌ن، دوای گفتوگۆیه‌کی زۆر شێخ مه‌حموود به‌ڵگه‌نامه‌یه‌کی پێشکه‌ش کردم، که واژووی نزیکه‌ی ٤٠ سه‌رۆکی به سه‌ره‌وه بوو، به‌م شێوه‌یه نووسرابوو:

((...... له‌به‌ر ئه‌وه‌ی حکوومه‌تی خاوه‌ن شکۆ، سووربوونی خۆی بۆ رزگـارکردنی نه‌ته‌وه‌کانی رۆژهه‌ڵات له چه‌نگی ده‌سه‌ڵاتی تورکی راگه‌یاندووه، هه‌روه‌ها ســووره لــه سه‌ر یارمه‌تیدانی ئه‌و نه‌ته‌وانــه تــا ســه‌ربه‌خۆیی وه‌رده‌گـرن، ئــه‌وا ســه‌رۆکه‌کان بــه‌و سیفه‌ته‌ی نوێنه‌ری خه‌ڵکی کوردستانن، تکا لــه حکوومــه‌تی بــه‌ریتانی ده‌کــه‌ن، کــه بیانخاته ژێر پارێزگاری خۆی و به عێراقه‌وه‌یان بلکێنێ، بۆ ئه‌وه‌ی لــه خێروبێــری ئــه‌و به‌یه‌که‌وه گرێدانه مه‌حروم نه‌بن. هه‌روه‌ها داوا له حاکمی مه‌له‌کی له عێراق ده‌که‌ین، که نوێنه‌رێکی خۆی بۆمان ره‌وانه بکات و یارمه‌تی پێویستمان بـدات، تـاکو گـه‌لی کوردی له ژێر سایه‌ی چاودێری به‌ریتانی بتوانێ به شـێوه‌یه‌کی ته‌ندروسـت لـه ســه‌ر بنه‌مایه‌کی مه‌ده‌نی به‌ره‌و پـێش بچـێ. ئه‌گـه‌ر حکوومــه‌ت یارمــه‌تی و پارێزگـاری کوردان بکات، ئه‌وا ئه‌وان به‌ڵێن ده‌ده‌ن که فه‌رمان و راوێژه‌کانیان قه‌بوول بکه‌ن)).

سەرباری ئەمەش شێخ مەحموود داوای کرد ئەفسەرانی بەریتانی لە سەرجەم دەزگاکانی حکوومەت کار بکەن، کە لە نێوانیاندا ئەفسەرانی (شبانە)ی کوردیش هەن، بەمەرجێ فەرمانبەرە بەرپرسەکان لە کورد بن و تا دەکرێت لە عەرەب نەبن.

لە بەرامبەر ئەمەدا نووسراوێکی تایبەت بە شێخ درا کە دەڵێت: هەر هۆزێکی کوردی لە زێی گەورەوە تا دیالە ((جگە لەو هۆزانەی لەناو سنووری ئێران نیشتەجێن))، ئەگەر بە خواستی خۆی سەرۆکایەتی شێخ مەحموودی قەبووڵ بێت، ئەوا ڕێگەی پێدەدرێت ئەمە بکات، شێخ مەحموودیش لەڕووی مەعنەوییەوە لەو ناوچانەی لە سەرەوە باسکراون لەبری حکوومەتی بەریتانی پاڵپشتی لێدەکرێت، ئەویش بەڵێن دەدا ملکەچی فەرمانەکانی بەریتانیا بێت. هۆزەکانی ناوچەکانی کەرکوك و کفری و دانیشتوانی شارۆچکەکانیان، حەزیان نەدەکرد بچنە ژێر کۆنترۆڵی شێخ مەحموودەوە[1]، ئەویش (واتە شێخ مەحموود) رازی بوو لەسەر ئەوەی کە سوورنەبێت ئەو ناوچانە بخاتە سەر سنووری دەسەڵاتی خۆیەوە.

## کوردەکانی ئێران

بۆ نوێنەرانی هۆزە کوردییەکانی ئێران روون کرایەوە کە پابەندییە گشتییەکانمان رێگەمان پێنادەن کە بیانخەینە سەر کوردستانی باشوور کە لەژێر پارێزگای بەریتانیا دان، ئەوان پێویستە هەر بە هاوولاتی سەر بە ئێران بمێننەوە. رەوشەکەیان بەسنگ فراوانی و ئارامییەوە بەشێوەیەکی تەواو وەرگرت، کەچی شیخ مەحموود بەهیچ شیوەیەك بەمە رازی نەبوو، ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە نوێنەری سەرجەم کوردانی ویلایەتی موسڵ و زۆرێك لە کوردانی ئێران و ئەوانی دیکەیە، ئەو خواستی

---

١- جگە لە ساداتی عەشیرەتی جەباری و هۆزی شێخ بزێنی لەسەر زێی بچووك و گرووپی عەبدالکریم لە هەماوەند لە ناوچەی چەمچەماڵ نەبێت، هەموو بە دەسەڵاتی شێخ مەحموود رازی بوون. بەهیچ شێوەیەك شێخ مەحموود لەسەر ئەمە رازی نەبوو.

خۆی لە پێکهێنـانی دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی یـەکگرتوو، کـە خـۆی سـەرۆکی ئـەو حکوومەتە بێت، لەژێر سایەی بـەریتانیا، خسـتەڕوو. ئاشـکرایە کـە ئـەو ئەگـەرە، شایەنی ڕێز و چاوپیاخشاندنی زیـاتر بـوو. چـونکە ئەگـەر، ئەگـەرێکی وا بتوانرابـا جێبەجێ بکرێت، ئەوا ئەرکی پێکهێنانی دەوڵەتی عـەرەبی لـە سـێ ویلایەتـەکانی دیکەی ئاسانتر دەکرد.

ئەو بیرۆکەیەش تەواو نوێ نەبوو، عەقیـد (کینیـون) سـەرۆکێکی دیـاری هـۆزی موکریانە لە ناوچەی (سوج بولاق)ی ئێرانی، کاتێ لە ساڵی ١٩١٨ لە نزیك سەقز لە گەڕاندابوو، پرۆژەی کوردسـتانی سـەربەخۆ لـەژێر پارێزگـاری بـەریتانیا خسـتەڕوو، بیرۆکەی ئـەو ئـەوەبوو کـە ((ئـەرمینیای ئـازاد)) لـە ویلایـەتی بـاکووری تورکیـا پێکبهێنرێـت، ئـەو بیرۆکەیـە لای کـوردیش پەسـند دەبێـت ئەگـەر ((کوردسـتانی سەربەخۆ)) لە نێوان دەوڵەتی ئەرمەنی و دەوڵەتی عەرەبی دروست ببێت.

## پێشنیاری شەریف پاشا[1]

سەرباری ئەمانە، سێر پیرسـی کـۆکس، کـاتێ لـە لەنـدەن بـوو، گـوێی لـە پێشنیازی لەو جۆرە گرت. سیمایەکی تورکی بـە ڕەگـەز کـورد کـە لـە پـاریس دادەنیشت، پێی دەگوترا شەریف پاشا، هەرچەندە هـەر لـە منالێیـەوە دوور لـە نیشتیمانە ڕەسەنەکەی لە تاراوگە بوو، بەڵام گرنگییـەکی قـۆڵی بـە داهـاتووی

١ - مامۆستا (ئەدمۆنزر) لە کتێبەکەیدا (کورد و تورك و عەرەب) دەڵێت: شەریف پاشا لە یەکێ لـە خانەوادەکانی سلێمانییە و سەر بە بابانییەکانە، کە بە خانەوادەی ئەحمەد ئاغا ناوبراوە. شـەریف پاشـا لە ئەستەمبۆل لە ساڵی ١٩٠٨ یەکەم یانەی کوردی بە بەشداری ئەمین بەدرخان دروست کرد. هەروەها هەر ئەو بوو هەوڵێـدا کـە چـەند ماددەیـەکی تایبـەت بـە پێکهێنـانی دەوڵـەتی کـوردی بخاتـە نـاو پەیماننامەی سیڤەرەوە، کە تورکیا پێی رازی نەبوو، کۆنگرەی ئاشتیش لە کۆتاییدا پەسندی نەکرد.

کوردستانی باشوور دەدا، ساڵی ١٩١٤ بەڕاستی خزمەتەکانی خۆی پێشکەشی ئێمەی کرد و هانی ئێمەی دا کە هەنگاوی پێویست بۆ کۆکردنەوەی سەرجەم کوردان، وەربگرین و بە خێراترین شێوە سیاسەتێکی بونیادنەر بۆ خەڵکی رابگەیەنین. پێشنیازەکەی بریتی بوو لەوەی، کە پێویستە ئێمە ئۆتۆنۆمی بۆ دانیشتوانی کوردستانی باشوور لەژێر چاودێری بەریتانیا زامن بکەین، ئەمەش لەسەر فەرمانبەرە بەریتانییەکان پێویست دەکات، کە بۆ ئەم مەبەستە دەبنە نوێنەر، یارمەتی کارگێڕی پێشکەش بکەن، برێکی تەواو لە کۆنترۆڵی دارایی پیادە بکەن، لەڕاستیدا بە گوێرەی ئەم پێشنیازە، دەبوو وەك ئەوەی نیازمان بوو، بۆ عەرەب بیکەین، بۆ کوردانیش بیکەین. ئەو گرنگی دەست بەجێ پێکهێنانی ئیدارەیەکی چالاکی بۆ ئێمە جەخت کردەوە، بەبێ ئەوەی چاوەڕێی دەرکردنی بڕیاری فەرمی کۆنگرەی ئاشتی بکەین، کە هەردەبوو لە کۆتاییدا کۆببێتەوە. پێویستە بە ئەنقەست کار بۆ پێکەوە لکاندنی هەرێمایەتی نەکەین، بەڵکو تەنها کار بۆ پێکهێنانی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ، کە زاڵ بین بەسەریدا، بکەین.

لەڕاستیدا پڕۆژەکەی شەریف پاشا پێشبینییەکی لێهاتوانەی نیزامی ئینتیداب بوو، کە دوای سەردەمانێك دەرچوو. لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ لە نووسینگەیەکدا گوتی: رەوشەکە بەهۆی ئەوەی تورکەکان رق لە نێوان کورد و ئەرمەن دا دەوروژێنن، زیاتر سەخت و ئاڵۆزبووە، ئەمەش بە مەبەستی تێکشکاندنی ئەرمەن و مەحرومکردنی کوردیش دواتر لە هەر هەلێك بۆ وەرگرتنی ئۆتۆنۆمی نیشتیمانی، خراوەتە گەڕ.

هەروەها گوتی، هەروەك چۆن سەرۆکی موکوریانیش پێشتر گوتبووی: تاکە هەلێك کە بمانگەیەنێتە چارەسەرێکی بەردەوام و شەرافەتمەند ئەوەیە کە کورد و ئەرمەن بە لێکچوو لە نەتەوە و یەکسان لە داواکاری مافە نەتەوەییەکان، هەریەکەیان لە ناوچەی تایبەت بە خۆیان دابنرێت.

هەرچەندە شەریف پاشا، پەیوەندییەکی توندی بە کوردستانەوە نەبوو، بەڵام بیروڕاکانی لای خەڵکی بە گەرمی و سۆزەوە وەردەگیرا.
رای گشتی لە وڵاتانی هاوپەیمان و ئەمریکا زۆر بە توندی لە دژی کوشتارگەی ئەرمنییەکان وروژێنران، پێ دەچوو چارەسەرێکی وا کە لەسەر ئەم بیرۆکەیە بونیادنرابێت، لە کۆنگرەی ئاشتیدا پەسند بێت، چونکە چەند بەندێك لە ١٤بەندەکانی سەرۆك ویلسن دەڵێت: ((پارچەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی ئێستا پێویستە سەروەرێتی تەواوی بۆ زامن بکرێت، بەڵام نەتەوەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی تورکی، پێویستە هەلی بێ کێشەیان پێبدرێت، بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی بەرەوپێش بچن.))

## پڕوپاگەندەی تورکی و فەڕەنسی

یەکەم پێداویستییە بنەڕەتییەکانی بڕیاری دروست لەبارەی کێشەکان، ئەوەیە کە تەواوترین زانیاری لە بارەی ئاڕاستەی ڕووداوەکان بەدەست بخەین و هەستی باوی ناوچە کوردییەکانی دیکە بزانین. دوای ئەوەی ئەم ئامانجەمان لەبەرچاوی خۆمان دانا، ئەفسەرێك ڕەوانەی ئاکرێ و زاخۆ (کە کەوتوونەتە ڕۆژهەڵات و باکووری شاری موسڵ) کرا، بۆ ئەوەی پەیوەندی بەردەوامیان بەو هۆزانەی نیشتەجێی ئەوێ بوون، هەبێت. دەرکەوت کە ئەو ئەرکە لە سەختترین ئەرکەکان بوو، بەلەبەرچاوگرتنی بوونی گرووپی گەورەی کریستان لەسەر سنووری کوردی و ناوچەی دیکە، ئەوا دەسەڵاتی تورکی و کێشەی ئەرمەنی هێشتا بەهێز و گەرم بوو. تورك ڕاستەوخۆ لەو دیوی سنوورەوە بە پەخشکردنی پڕۆپاگەندەی دژ بە کریستانییان و ئینگلیز سەرقاڵ بوو، هەروەها بە یاریکردن بە ترساندنی پیاوانی سادەی هۆزەکان کە زوو باوەڕیان دەکرد، سەرقاڵ بوو. یەکێ لە بڵاوکراوەکان دەیگوت: ((.... لە نزیکترین کات گوێچکەتان بە لێدانی زەنگ کەڕ دەبێت و گوێتان لە دەنگی بانگی مەلا نابێت. فەرمانبەرانی

فەلە وەك چۆن پێشتر مامەڵەیان دەکرد، مامەڵەتان لەگەڵ دەکەن، ئەوکات، دەبێت، پێی عەرەب و کلدان ماچ بکەن)).

ئەم جۆرە ترسەی کوردان پاڵپشتی لەوەی کە ((ئەفسەرانی فریاگوزاریی بەریتانی)[1] پێی هەڵدەستان، کرد. کە ئەمانە لەژێر چاودێری (هێزەکانی هەڵمەتی میسری)[2] کاریان دەکرد. ئەم دەقەش لە پڕوپاگەندەکان دەرکەوت:

((...... ئێستا ناتوانرێت لێکۆڵینەوە لەو دەستدرێژییە کەمانە بکرێت کە ئەنجام دەدرێن، بەڵام پێویستە زانیارییەکان لە لیستی تۆمەتباریدا کۆبکرێنەوە، دواتر بەسەر دەزگا ئەمنییەکان دابەش بکرێت)). گومانی تێدا نییە کە نەدەتوانرا، ئامرازێکی باشتر لەمە دابهێنرێت، تاکو رق و کینەی ئایینی و رەگەزپەرستی لە نێوان خەڵکی ئەوکات گەشە پێبدات. هەر مەسیحییەك دەیتوانی زانیاری پەسند و دیار بە ئەفسەری هەواڵگری و ئەفسەری زاڵگە بدات و سۆنیدیشی لەسەر بخوات، کە بەهۆی ئەو زانیارییانەوە تۆڵەی خۆی لە هەر موسوڵمانێك بیەوێت، دەیکاتەوە. ژمارەیەك رووداوی لەم جۆرە بەڕاستی لە ناوچەی حەلەب روویاندا.

لەبەر ئەوەی حکوومەتی خاوەن شکۆ لە گەوجەیی ئەم سیاسەتە گەیشتبوو، بۆیە لە ٧ی ئایار دەسەڵاتی پێدام کە بۆ بەڕێز تەها، یەکێ لە سەرۆکە کوردەکانی ناوچەی رەواندوز بەم شێوەیە، بنووسم:

... حکوومەتی خاوەن شکۆ دەسەڵاتی پێدام، کە تەواوترین دڵنیایی خۆمت پێشکەش بکەم، کە حکوومەتی خاوەن شکۆ هیچ نیازێکی نییە، لەوەندەی پەیوەندە بەخۆی، کە رێوشوێنی تۆڵەسەندنەوە لە بەرامبەر کورد، سەبارەت بەو کردەوانەی کە لەوانەیە لەکاتی جەنگەکە ئەنجامیان دابێ، وەربگرێت، حکوومەتی خاوەن شکۆ

---

1- British Relief Officers.

2- Egyptain Expeditionary Force.

ئەو سوپا بەریتانییەی کە دەستی بەسەر (سوریا، فەلەستین، لوبنان) داگرت، بارەگای گشتییان لە قاهیرە بوو، ئەم ناوە بەو هێزە شەڕ کەرانە دەگوترا، کە لە هەڵمەتەکەدا بوون.

ئامادەیە لێبووردنی گشتی بۆیان دەربکات. ئەمە، ڕێگە لە نوێنـەرانی حکوومـەتی بەریتانی ناگرێت، کە هەوڵە دۆستانەکانی خۆیان بۆ گرێدانی ئاشتی لە نێوان ئەرمەن و کورد سەبارەت بە کێشە تایبەتییەکانیان، بخەنە گڕ. ئەو نوێنەرانـە تـا ئـەو پـەڕی هەوڵـەکانیان بـۆ یـەکلایی کردنـەوەی کێشـەکانی زەویـداری لـە نێـوان هـەردوولا بەڕێگایەکی دۆستانە، بەبێ پەنابردنە بەر چەك دەخەنەگڕ، ئەمە و حکوومەتی خاوەن شکۆ دڵنیاتان دەکاتەوە، کە بەرژەوەندییەکانی کورد، لـە کـۆنگرەی ئاشـتی بـەهیچ شێوەیەك چاوی لێناپۆشرێت...

دەرەنجامی ئـەو نووسـراوە، سـەبارەت بـە بـەڕێز تـەها، ئـەنجامێکی تـەواو ڕازیکـەری هـەبوو، دەسـتی بەسـەردانکردنی بەغـدا کـرد، هەرچـەندە زۆربـەی بەرژەوەندییە عەشایەرییەکانی کەوتبوونە ناوچەی شەمدینان، ئەمەش وایکردبوو، بکەوێتە دەرەوەی سنووری کارکردنمان، تـا ئەوپـەڕی هـەوڵی دەدا لـە رووبـەڕوو بوونەوە بەدوور بێت و ترسی شوێنکەوتووە یاخیبووەکـانی ئـارام دەکـردەوە، لـە ڕێکەوتێکی دڵخۆشدا بەڕێز تەها بۆ وەرگرتنی نووسراوی ئاماژە پێکراوەکـە لـە بەغدا بوو، کاتێ شێخ مەحموود هەوڵێدا کودەتا لە سلێمانی ئـەنجام بـدات. کـە دواتر بەوردی باسی دەکەین.

ئەو پڕۆپاگەندەی کە لە موسڵ بۆ بەرژەوەندی فەڕەنسـا بڵاودەکرایـەوە، کـەمێك هەراسانکەربوو. لەلای ئەو کەسانەوە دەردەچوو کە لەژێر پارێزگاری فەڕەنسا دابوون، دوو شێوەی لەخۆ گرت، ئەوەی بەبیر مەسیحییەکان دێناوە کە لـە کاتێکـدا هـەموو ناوچەکان لە چاوی بەریتانیاوە یەکسانن، ئەوا فەڕەنسییەکان بەوە بەناوبانگن کە لـەو ناوچانەی کە مەسیحییەکانیش کەمینەن، هەر پشتگیرییان لێ دەکەن، لە حاڵەتێکدا ئەگەر فەڕەنسییەکان دەسەڵاتیان وەرگـرت، ئـەوا زاڵبـوونی گرووپـە مەسـیحییەکان شتێکی زامن کراو دەبێت، بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە، پێویستە مەسـیحییەکان داوای پارێزگـاری فەڕەنسـییەکان بکـەن. دووەم، بەپێوانەیـەکی فـراوان ئـەوە بـاوبوو، کـە

فەڕەنسییەکان لە ماوەیەکی نزیکدا ئیدارەی وڵات وەردەگرن، بوونی ئیدارەی بەریتانی لە ئیدارەیەکی کاتی بەولاوە هیچی دیکە نییە.

بوونی پەنجا هەزار پەنابەری مەسیحی[1] لە بەعقوبە، سەرچاوەیەکی دیکەی سەرچاوەکانی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی بەریتانیا بوو. ئاشکرایە، کە ئێمە حەزمان دەکرد بۆ شوێنی پێشووی خۆیان بیانگەڕێنینەوە. کە ئێستا کەوتۆتە ژێر داگیرکاری کوردی، کورد بە ئاسایی چاوەڕێی ئەوەیان لە ئێمە دەکرد، کە سۆز و خۆشەویستی بۆ نەوەی ئایینیمان پیشان بدەین.

## دامەزراندنی حکومەت لە کوردستان

لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ١٩١٩، کاپتن نۆئیل سلێمانیی جێهێشت و پیاسەیەکی بەناوچەکانی لای رۆژئاوا و باکوور تا سنووری رەواندوز کرد، لەو کاتەدا دەزگای حکوومی تازە، لەڕێگادا بوو، لە ناوچەکان دابنرێت. حاکمی سیاسی لە کۆیەو رانیە و رەواندوز دانران و ئاسایش بەخێرایی گەڕێنرایەوە. بیروڕاکانمان سەبارەت بە داهاتووی کوردستان بۆ سەرۆك هۆزەکان روون کرایەوە.

هەموویان ئامادەیی خۆیان بۆ رازیبوون بە شێخ مەحموود وەك نوێنەری بەریتانییەکان لە کوردستان پێشاندا، هەروەها ئامادەیی خۆیان بۆ هاتنە پاڵ یەکێتی کوردی دەربڕی. هەر هۆزێك چوار پاڵێوراوی بۆ سەرۆکایەتی هەبوو، هیچ یەکێکیشیان هەرگیز بەختی پاڵپشتی کردنیان نەبوو. جووتیاران و گوندییەکان چاوەڕوانی ئەوەیان لە ئێمە دەکرد، دەسەڵاتی چەوسێنەری سەرۆکەکان سنووردار بکەین و ئیدارەی بیرۆکراتی بۆ سەردەمانی پێشوو لەسەر شێوەی سەردەمی تورکی

١- مەبەست لە خیوەتگەی ئاشورییەکانە، کە ئینگلیز لەوێ بۆی دروست کرد بوون، دوای ئەوەی لە ئورمیەوە بۆ ئەوێی هێنابوون، بۆ ئەوەی لە نیشتەجێ کردن و دیاریکردنی چارەنووسیان بکۆڵێتەوە.

بگەڕێتەوە. ئەوان لەوکاتەدا ئامادەبوون هەر شتێ کە ئێمە پێشنیازی بکەین لەسەری رازی بن، بەهیوای گەڕاندنەوەی ئارامی و بازرگانی و بوژاندنەوە بۆ شوێنی خۆی.

کاپتن نۆئێل دوای چەند هەفتەیەك بۆ سلێمانی گەڕایەوە، بینی، شێخ مەحموود دەسەڵاتی خۆی، خراپ بەکاردێنێ، بەهۆی نەبوونی حامیەی سەربازی نزیك، بۆتە پیاوێکی کەللەڕەق. تۆماری شێخ لە سەردەمی تورك، ئەوەی روون نەدەکردنەوە، کە کەسێکی جێی متمانە بووبێت، بەردەوام شۆڕشی لە دژی حوکمی تورکیدا ئەنجام داوە، هەرچەندە ئەوەی دەچرپێنرا، ئەوەبوو کە خەڵکی سلێمانی زیاتر بەدەستی سەرکردە و گەورەکانیان ئازار و زوڵمیان چێشتووە لەوەی بەدەستی فەرمانبەرە تورکەکان چێشتوویانە، بەڵام دەبوو ئێمە رووبەڕووی راستییەکان وەك ئەوەی هەیە ببینەوە و بەباشترین شێوە بیزانین. گومانی تێدا نییە کە شێخ مەحموود دەسەڵاتی هەبوو، ئێستاش زۆر لە جاران دەسەڵاتی بەهێزتر بووە، ئەمە بێ ئەوەی بە بڕی پێویست یارمەتی و هاوکاری ئێمە بکات، کە جاران دەیکرد، زەرور بوو حامیەکی بەهێز بهێنینە وڵاتەوە، کە دەسەڵاتی سەربازی پێی وابوو دابین کردنی حامیەیەکی وا لە دەرەوەی توانای ئەوە. شوێنیش سەبارەت بە لایەنی سیاسی گرنگی خۆی هەبوو، دەبوو ئێمە پارێزگاری لە نیزامی ناوچەکە بکەین و لەهەمان کاتیشدا خۆمان لە بەکارهێنانی هێز بەدوور بگرین.

## کوردستان و عێراق

دامەزراندنی حکوومەتی باشووری کوردستانمان، بەچاودێری بەریتانی پێڕاسپێراوە، بەڵام حاڵەتی هەمە جۆری لە وڵات و نەبوونی گەیاندن (رێگا قیرتاو بێت یان هێڵی ئاسن یا فڕۆکە یا پەیوەندی کردن) و بوونی کێشەی نێوان هۆزەکان، ناچار بووین کار بەژمارەیەك رێسا بکەین و هەوڵی گەڕاندنەوەی نیزام بۆ چەند مەڵبەندێکی کەم بدەین، ئەرکی رێکخستنمان بۆ کاتێکی دیکە دواخست، لەسەر بنەما جوگرافی و

بازرگانییەکان دەرکەوت، کە کوردستانی باشوور ناتوانێت گەشە بکـات، ئەگـەر بـە بەشێك لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکـە دانـەنرێت، دوو تاکـە بازاڕەکـەی کـە دەکـرا کوردستان سوودیان لێوەربگرێت بازاڕی بەغدا و موسڵ بوون. تاکە ڕێگایـەکیش کـە بۆی بچووبایە، هەر بەناو عێراقەوە بوو.

زۆر کەس ئەو ڕاستییە ڕوونانەیان درك پێدەکرد، هەروەها کـەمێك لـە سـەرکردە کوردییە ڕۆشنبیرەکان، لە گفتوگۆ تایبەتییەکاندا شێوەیەك لە شـێوەکانی ئۆتۆنـۆمی کوردی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عەرەبی و بە سەرپەرشتی بـەریتانیایان، بـە ئیمکـان دەزانی و پێی ڕازی دەبوون، ئەوە ڕوون و ئاشـکرا بـوو، کـە زۆرینـەی سـەرۆکەکانی عەشایەر چاوەڕێی ملکەچی بۆ دەوڵـەتی عــەرەبییان نـەدەکرد و ئەمــەیان بەشـێکی قێزەوەن دادەنا. هەرچی کەمینە بەهێزەکەی وڵات بوو، بۆ ئەوان سەربەخۆیی جگە لە ئازادی لە تاڵان کردن و داگیرکردنی دراوسێ لاوازەکان و تەنگ پێهەڵچـینیان، هیچـی دیکەی نەدەگەیاند.

ئەوکات سەخت بوو مەزەندەی ئەو مەودایە بکرێـت، کـە بزووتنـەوەی نیشـتیمانی کوردی لە بوونیدا بـۆی دەچـێت. هـەروەها ئـەو مەودایـەی کـە بزووتنەوەکـە دەبێتـە کاڵایەکی درۆزنانەی جێی چاوتێبڕینی سەرکردە کوردەکان. گومانی تێدا نییە بزووتنەکە لە سلێمانی بەهێز بوو، دەبوو بە بەبیرهێنانەوەی ئەوەی کـە حکوومـەتی خـاوەن شـکۆ بۆیە ڕازی بووە کە بەرپرسیارێتی کوردستان لە ئەسـتۆ بگرێـت تـەنها لەسـەر بنـەمای ئەوەی کە دەبێت خەڵك و سەرکردەکانیان کار بۆ پارێزگاری کردن لە ئارامی و وەرگرتنی ڕامان لە کاروبارە گرنگەکان بکەن، ئەو بزووتنەوەیە سەرکوت بکرێت.

بۆ خەڵکی ڕوونکرایەوە، کە فەرمانبەرانی ئیدارەکە، تا بکرێت دەبوو هـەر کـورد بن، هێزەکانی (شبانە) پێویست بوو بەدەستی ئەفسـەرە کوردەکـان بێـت، لەهـەمان کاتدا زمانی کوردی زمانی فەرمی حکوومەت بوو، بڕیاردرا کە یاساکان بە گـوێرەی داب و نەریتی ناوچەیی هەموار بکرێن، دەزگایەکێش بۆ کۆکردنەوەی بـاج و داهـات

دابهێنرێت، تاكو پێویستییەكانی گەلی پێ دابین بكرێت، هەروەها رێككەوتن لەسەر رێزگرتنی داب و یاسای عەشایەری كرا، رێگە بە سەرۆك عەشیرەتەكان درا لە چوارچێوەی سنوورێكی ماقوڵدا دەسەڵاتیان بەسەر عەشیرەتەكەیان پیادە بكەن، هەروەك تائێستا ئەنجام دەدرا.

## گرفتی شێخ مەحموود و داتەپینی دەسەڵاتەكەی

گرفتمان لەگەڵ شێخ مەحموود زۆر سەخت بوو, مناڵێك بوو، نەوەك لە بێ تاوانیدا، بەڵكو لە نەزانیدا، لەگەڵ چاوتێبڕین و فڕوفێڵێكی زۆر. جارجارە لەناكاو دەبووە نێچیری سۆز و ورژانێكی دڕندانە، كە چاودێرێكی بە سروشت لە سەرەخۆی وەك مێجەر سۆن، ئەوە دەرەخات كە شێخ مەحموود بەردەوام بەرپرسی ئەو كارانە نەبوو كە ئەنجامی دەدا. لەگەڵ ئەو هەموو هەڵانەشی، هێشتا شوێنكەوتوانی لەو كاتەدا زۆربوو. لەوێ لە كوردستانی باشوور لەبەرامبەر هەر كەسێك كە دژی دانانی شێخ بوو بەسەرۆكی حكوومەت، چوار كەسی دیكە هەبوون دانیان بە سەرۆكایەتی ئەو دەنا و پێشوازییان لێدەكرد.

بەڵام هەر زوو دەركەوت كە ئەو دەسەڵاتە، هەر تەنها دەتوانرا لەناوچەی سلێمانی، سوودمەندانە پیادە بكرێت، كەمینەیەكی دەست رۆیشتوو، كە زۆربەی جار لە بازرگانان و خاوەن زەوییە گەورەكان پێكهاتبوون، بوونی ئیدارەیەكی راستەوخۆیان، كە فەرمانبەرانی بەریتانی رایبپەڕێنن، پێ باشتر بوو[1]، ئەو حكوومەتە بەگوێرەی بنەماكانی حكوومەتی پێشووی توركیا حوكم بگێڕێ، كە ئەویش بۆ حوكمی عەشایەری نیمچە بەربەری دەگەڕایەوە.

بۆیە ئەوەی لەوكاتەدا ئاشكرا بوو، ئەوە بوو، كە هیچ دانایی و ژیرییەك لە پاڵپشتی كردنی چالاكانەی داواكارییەكانی شێخ مەحموود لە زاڵبوون بەسەر گرووپەكاندا نییە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەمە، بەشێوەیەكی گشتی رێككەوتن لەسەر

---

١- سەیری كتێبی ((هی)) كە پێشتر ئاماژەمان پێ كرد، بكە. نووسەر

زەرورەتی گرتنەبەری گۆڕینی سیاسەتمان لە کوردستانی باشوور کرا، ئەویش بەهێنانە ناوەوەی جۆرێك لە ئیدارە، کە لەسەر بنەمایەکی هاوشێوەی ئەوەی لە هەموو لایەکی عێراق کاری پێدەکرێت، بڕوات. دوای ئەوەی ڕەوشەکە بە تەواوی گفتوگۆ کرا، کە نوئیل و لیجمن و شۆن گۆردن و ۆکەر و ژمارەیەك لەوانەی کە زانیاری ڕاستەوخۆیان لەبارەی ڕاستییەکانی ئەوکات هەبوو، بەشدارییان کرد.

بە ڕازی بوونی تەواوی نوئیل بڕیاردرا، کە مێجەرسۆن شوێنی ئەو لە سلێمانی بگرێتەوە، کە تا ئەوکات پەیوەندی شەخسی لەگەڵ شێخ مەحموود نەبوو، بەڵام لێهاتووییەکی رادەبەدەر و زانیارییەکی بەتینی بە تەواوی ناوچەکە هەبوو. نۆئیل هەر لە سەرەتاوە لەژێر ڕێنماییەکانی حکوومەتی خاوەن شکۆ بۆ گەڕان بە درێژی و پانی کوردستان دانرا. بۆ ئەوەی لە مەودای جێبەجێ کردنی ئەو ئۆتۆنۆمییە داهێنراوە دڵنیا بێت، کە لە ناوچەدا بڵاوە.

بە گێڕانەوەی ئاسایش و بوژاندنەوەی بزووتنەوەی بازرگانی کە بە دوای دامەزراندنی مێجەر سۆن دا هات، هەستی گشتی لە دژی شێخ مەحموود گۆڕانی بەسەردا هات. ئەمە بۆ زۆر کەس روون بوو، ئەوانەی لە سەرەتاوە، بەشێخ رازی بوون، کە ئەوان لەبەر خۆشەویستی یان حەزکردن لە دانایی بە شێخ رازی نەبوونە، بەڵکو لە ترسی دەسەڵاتەکەی پێی رازیبوونە. هەروەها لەبەرئەوە بوو، کە وای تێگەیاندبوون، کە بەریتانییەکان ئامادە بوون، حاکمییەتی شێخ لەکاتی پێویستدا، بەزەبری هێز بەسەریان بسەپێنێ. هۆزی جاف سووربوو لەسەر ئەوەی کە راستەوخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، هۆزی دیکەش هەمان رێچکەی ئەوانیان گرت، بۆ دڵنیابوون لە خواستەکانیان ئەفسەرانی بەریتانی بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە، رەوانەی هەڵەبجە کران. کاتێ زانرا، کە ئێمە نیازمان نییە، کە هۆزەکان بۆ دەسەڵاتی شێخ مەحموود ملکەچ بکەین، خێرا دەسەڵاتی شێخ دابەزی. تا گەیشتە کۆتایی مانگی نیسان ژمارەیەکی زۆر لە هۆزی گەورە، لە دەسەڵاتی شێخ هەڵاتن. ئەوانەی ئەوکات لەگەڵیدا مانەوە، تاکە جۆراوجۆرەکانی خانەوادەی بەرزنجی لە (سەروچك و قیرپچین) و

هۆزی هەماوەند و کۆمەڵێ لە میکائیلییەکان لە عەشیرەتی جاف. دواتر بەرەبەرە هێزەکانی پۆلیس و (شبانە) هاتنە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی ئێمە، بەڵام هەندێ ئەفسەر کە لە بەرامبەر بەخشینە زۆرەکانی شێخدا، سوێندیان خواردبوو ملکەچی بۆ شێخ بکەن. حامیەی بەریتانی لە سلێمانی دەیتوانی یارمەتی ئێمە بدات، لەوکاتەدا، بۆئەوەی بەسەر سەختی ئەو وەختە ناسکەدا زاڵ بین. حکوومەتی خاوەن شکۆ بەرەنگاری لە پەسندکردنی هەر درێژکردنەوەیەك بۆ بەرپرسیارێتی سەربازیمان دەکرد، هەروەها ژەنەراڵ مارشاڵ[1] بە هەمان بڕی حکوومەت دژایەتی درێژکردنەوەی هێڵەکانی گەیاندن بوو، کە ئەوکات گەیشتبووە ترۆپکی سەختی.

مانگانە سەربازان وڵاتیان جێ دەهێشت، بەبێ ئەوەی ئەرکە سەربازییەکانیان لەکەدار بێت، پەنجا هەزار دیلی جەنگی تورکی لە وڵاتدا مایەوە، ژمارەیەکی هاوشێوەش لە پەنابەران. پاشماوەکانی جەنگ لە کۆگاکان و جبەخانەکان هەمەجۆر بوون و بە گەورەیی و درێژبوونەوەیان بە وڵاتدا، وای دەخواست خۆمانی لێ رزگار بکەین، بەبێ بارکردنی ئەو پاشماوانە بۆ هیندستان و بەریتانیا، نەدەکرا خۆمانی لێ رزگار بکەین، بەڵام بارکردن شتێکی دەگمەن بوو، بازرگانەکان و ئەوانی دیکە، کە لە بەسرە و بەغدا بۆ سلێمانی دەگەڕانەوە، سەبارەت بە راکردنی رۆژانەی سەربازان بە شەمەندەفەر و کەشتی، بۆ خەڵك قسەیان دەکرد، باوەڕی دووبارە چۆڵکردنی کوردستان و وازهێنان لە دانیشتوانەکەی بۆ حەقیقەتێکی واقعی لە زیهنی خەڵکی گۆڕا.

کاتێ لە ٩ی ئایاری ١٩١٩ بۆ بەغدا گەڕامەوە، بینیم کە سێر ویلیام مارشاڵ بۆ نیشتیمان (بەریتانیا) گەڕاوەتەوە و سێر جۆرج ماکمۆن شوێنی ئەوی گرتۆتەوە، هەموو بە وەرگرتنی سەرکردایەتی باڵا دڵخۆش بوون. پێشتر رۆڵێکی سەرەکی لە پێکهێنانی دەزگایەکی گەورەی سەربازی بینیووە، زانیارییەکی پتەوی سەبارەت بەچۆنیەتی بەکارخستنی ئەو دەزگایە و پەیوەندییەکانی بە دامەزراوە ئیدارییەکان

---

[1] - سەرکردەی گشتی هێزە بەریتانییەکان لە عیراق.

هەبووە، کە کاری زۆر لەسەر رێکخستنی کردبوو. لـە نزیکـەوە ئەفسـەرە کۆنـەکانی ئیدارەی مەدەنی دەناسی، هـەروەها خـەڵکی دیـاری وڵاتەکـە لـە نزیکـەوە ئـەویان دەناسی. لە ماوەی سـێ سـاڵدا بـووە جێـی متمانـەی وەزارەتـی جـەنگ و لەلایـەن حکوومەتی هیندەو پاڵپشتی دەکرا. من و ئەو لە یـەکتری دەگەیشـتین، بـەڵام هـەر دەبوو لەگەڵی یەکانگیر بم، نەدەکرا خۆ لە هەڵەکردن ببوێری، بەڵام بوونی ئەو زامنی رێکخستنی کارەکانی دائیرەکان و کەمکردنەوەی هەڵەکان بوو، تا رادەیەکی زۆر.

## شۆڕشی شێخ مەحموود

مستەر هاویلْ کە بە وەکالەت لە شوێنی من کـاری دەکـرد، پێـی راگەیانـدم، کـە رەوشەکە لە سلێمانی زۆر هەستیار بووە، رێوشوێنی چـوونە لای شـێخم بـە فڕۆکـە لـە کۆتایی مانگی ئایاردا رێکخستبوو، بۆ ئەوەی لەگەڵیدا کۆببمەوە، هەوڵ بدەم لەگەڵیـدا بگەمە چارەسەرێکی وا کە پارێزگاریکردن لە چوارچێوەی سەربەخۆیی کـوردی ئیمکـان بێت. من لەو ماوەیەدا بە فڕۆکە سەردانی کوت و عەمارە و بەسرەم کردبوو، بۆ ئـەوەی پەیوەندی شەخسی خۆم بە عەرەبە دیارەکان و حاکمـە سیاسـییەکان بگەڕێنمـەوە، لـە ٢٠ی ئایـاردا بـۆ بەغـدا گەڕامــەوە، بـەڵام شـێخ مـەحموود دوای دوو رۆژ هـەوڵێکی نەزۆکانەی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتەکەی دا. شێخ بەشێوەیەکی نهێنی هێزێکی (٣٠٠) سێ سەد جەنگاوەری لەو هۆزە کوردییانـەی کـە لـەلای سـنووری ئێرانـەوە هـاتبوون، هەڵبژارد و ئامادە کرد، ئێمەش هیچ کۆنترۆڵێکی ئەوانەمان پێ نەدەکرا.

دوای ئـەوەی ئـەو هێـزە، سـنووری بەزانـد لـەناکاو هێرشـیان کـردە سـەر شارۆچکەکە، (شبانە)ی ناوەخۆ نەبەردانە لەگەڵیان جەنگان، بەڵام هێـزی (شـبانە) زۆر بەخراپی شەڕەکەیان دۆڕاند و پاشەکشەیان کرد، بەمەش شێخ مەحموود جلەوی هەڵوێستەکانی بەدەستەوە گرت، ئینجا ئەفسەرە بەریتانییەکان و مێجەر ئێف ئێس گـرین هـاوس (کـە بەشـێوەیەکی کـاتی کارەکـانی مێجـەر سـۆنی لـە سـلێمانی رادەپەڕاند) دەسـتگیرکران و لـە بەندیخانـە پەسـتێنران، هـەروەها دەسـت بەسـەر خەزێنەدا گیرا و شێخ مـەحموود خـۆی بـە حـاکمی هـەموو کوردسـتان راگەیانـد.

ئالآیەکی تایبەت بەخۆی بەرزکردەوە، پـۆلی پۆسـتەی تایبـەتی بـەخۆی دەرکـرد، پیاوانی دەست و پێوەندی خۆی بە حاکمی ناوچەکان دامەزراند، لەو بەیانییەی کـە هێرشکرایە سەر سلێمانی هێڵی تەلەگرافی نێوان کەرکوك ـ سلێمانی بە ئەنقەسـت پچڕێنرا، رێگە لەو نێردانەی کە گرین هاوس بۆ کەرکوکی ناردن، گیرا. بەمەش تـا دوای دوو رۆژ، هیچ هەواڵێك لەبارەی ئەو رووداوانە بە دونیای دەرەوە، نەگەیشت، ئەویش لە رێگای هەڵەبجە و خانەقینەوە بوو.

یەکسەر بە فڕۆکە، بەسەر سلێمانی فڕیم، هـەر شـەش ئەفسـەرە بەریتانییـە دەستگیرکراوەکەم لەسەر بانی ئەو بەندیخانە کاتیەی کە تێیدا دەستگیر کرابـوون، دیت. ئینجا بەسەر هەڵەبجەدا چووم، بەهیوای ئەوەی بتـوانم تێیـدا بنیشـمەوە و چاوم بە (لیس)ی یاریدەدەری حاکمی سیاسی ئەوێ بکەوێت، بەڵام کەمی بەنزین وایکرد ئەمە کارێکی ئەستەم بێت، هەر ئەوەندەم پێکرا کە نامەیەکی بـۆ فـڕێ بدەم و داوای کشانەوەی لێبکەم. ئەوکات (لیس) لەلایەن پیاوانی ئـەو هۆزانـەی لەودیوی سنووری ئێرانەوە بەسەرکردایەتی حامد بەگ (پالێوراوی شێخ مەحمود) هاتبوون، گەمارۆدرا بوو. بەڵام مستەر لیس لە کۆتاییدا توانی بە سەلامەتی بۆ خانەقین رابکات، عادیلە خانمی ژنی بە ناوبـانگی هەڵەبجـە، یارمـەتی راکردنـی (لیس)ی بۆ هەڵەبجە رێکخستبوو. لەسەر ئەمە بـە بەخشـینی نازنـاوی هینـدی ((خان بەهادور)) پاداشت کرا[١].

ئەو ساتە وەختانە، مایەی نیگەرانی دەروونی ئێمە بـوون. هـەروەك بەیاننامـەی فەرمی دەڵێت، سوپای بەریتانی بۆ توندوتۆڵکردنـەوەی هێـزی دەسـەڵاتی مـەدەنی،

---

١- وردەکاری زیاتر لەبارەی ئەو رووداوانە لە وتارەکەی مستەر (جی. ئێم. لیس) لەژێر ناونیشـانی (دوو ساڵە لە کوردستانی باشوور)دا دەبینی، کە لە گۆڤاری (ئاسیای ناوەڕاست) بـەرگی ١٥ سـاڵی ١٩٢٨ بڵاوکراوەتەوە. نووسەر

دابەش نەکرابوو، ئەو هێزانە لەو خاڵانەی کە دەسەڵاتی مەدەنی دیاری کردبوون کۆنەکرا بوونەوە، بەڵکو لەو شوێنانە بوون، کە دەسەڵاتی سەربازی دەیخواست لەوێ بن، واتا لەدووری (٧٠) حەفتا میل لە سلێمانی، واتە لە کەرکوك کە فەوجێکی پیادە و چەند ئۆتۆمبێلێکی زرێپۆش و ژمارەیەکی کەم لە سوارچاکی لێ بوو. لە دووری (٨٠) هەشتا میل لە باشوور لەو شوێنەی کە هێڵی ئاسن لە بێجی لە دوورترین لێواری دیجلە، لیوایەك لە سەرباز و چەند پۆلێك هەبوون.

## شەڕگەی تاسلوجە

چاوەڕوان دەکرا، پێشکەوتنێکی گشتی بەرەو سلێمانی رووبدات، بۆیە ئەو فەرماندەیەی کە لە کەرکوك بوو، فەرمانی دا مەفەرەزەیەك بەرەوپێشەوە، تا سنووری چەمچەماڵ، بنێرێ، هەروەها فەرمان بەو لیوایەی کە لە بێجی بوو درا، تا بەخێراترین کات کە گەرمی کەش و ئامادەکردنی ئاو رێگەی پێدەدا، بەرەو کەرکوك بچێت. بەداخەوە، سەرکردە ئەفسەرەکانی کەرکوك وایان پیشاندا، کە رەوەشەکە پاساوی چاوپۆشین لەو فەرمانە وەرگێراوانە دەکات، هەوڵیان دا بە گرووپێك سەرباز و (شبانە) و ئۆتۆمبێلی زرێپۆش و تۆپهاوێژی لویس کە لە لۆری فۆرد بارکرابوون، بۆ چیا دزە بکەن.

ئەو هێزە گەیشتە تەنگەبەری تاسلوجە (١٢ میل لە سلێمانی دوورە)، ئەو شوێنەی کە دیلەکانمانی لێبوو، بەڵام هێزەکە گەمارۆدرا و ناچار بە پاشەکردن بوو، ئەمەش وایکرد کوردەکان بۆ ماوەی ٢٥ میل دوایان بکەون، چواردە ئۆتۆمبیلی زرێپۆش و ١٩ لۆری فۆرد، لە دەست درا و زیانێکی گەورەی دیکەشیان خوارد[١].

---

١- ئەو سەرکردەیە، لە ناوخۆ بە مێجەر بۆمی ناسرابوو، دەستی چەپی بڕابوو، لەو شەڕەدا عەشیرەتی ئێسماعیل عەزیزی و بەشێکی گەورە لە عەشیرەتی هەمەوەند بەسەرکردایەتی عەبدالکریم کوڕی فەتاح بەگ لەپاڵ شێخ مەحموود شەڕیان دەکرد، شەڕەکە لە ٢٥ی ئایاری ١٩١٩ روویدا و تەواوی رۆژەکە شەڕ بوو، ئینگلیزەکان زۆر چاك شکان، وەك دەگێڕنەوە نزیکەی

ئەم ڕووداوە ناخۆشە پاڵپشتی لەو باوەڕە دەکرد لە نێوان دانیشتوانی کوردستانی باشوور بڵاو ببووەوە، کە ئێمە چیتر ناتوانین بە سەر ڕووداوەکاندا زاڵ بین، دوای ئەمە شۆڕش بڵاوبووەوە و گەیشتە ناو سنوورەکانی ئێران. ژمارەیەك هۆز لە ڕووی حکوومەتی ئێران وەستان و خۆیان بە لایەنگری شێخ مەحموود و پڕۆژەی دامەزراندنی ((کوردستانی یەکگرتووی ئازاد)) ڕاگەیاند. شێخ مەحموود لە ڕاستی دوور نەبوو، کاتێ بەلایەنگرانی گوت کە سوپاکانمان کوردستانی جێهێشتووە، بەڵام ئەو دەرەنجامەی کە لە ڕەفتارەکانی ئێمەی وەرگرت، هەڵە بوو، سەرکردەی گشتی لەوە گەیشت کە دەبێت بیرۆکەی (بێ توانایی بەریتانیا) لە مێشکی خەڵکی وەدەر بهێنرێت.

## شەڕگەی دەربەند

لەم ئاستەدا ژەنەراڵ (فیریزەر) کە سەرکرایەتی فیرقەی ١٨ی لە موسڵ دەکرد، ڕاسپێردرا کە ئەوەی پێ دەگوترێت ((هێزی کوردستانی باشوور)) کە لە دوو لیوای پیادە و ژمارەیەك سوارچاك و ئۆتۆمبێلی زرێپۆش، پێکهاتبوون، لە کەرکوك کۆبکاتەوە و لە نزیکترین کاتدا بەرەوپێش بچێت. بۆئەوەی تواناکانمان لە بزووتنەوە لە چیادا بسەلمێنم، کە لە توانای خودی کوردەکان کەمتر نەبوو. هێزێکی بچووکی پیادە و تۆپهاوێژ لە شوێنێك لە نزیك خانەقین بە سەرکردایەتی کۆلۆنیل (بودی) فەرماندەی (سوسکس تیریتوریالز)، لە کاتی دیاریکراودا گەیشتە سلێمانی، ئەمەش دوای ئەوەی ئەرکەکەی خۆی بە سەرکەوتوویی بەجێهێنا. تا گەیشتە ناوەڕاستی حوزەیران هێزەکەی ژەنەڕاڵ فیریزەر لە چەمچەماڵ کۆکرایەوەو ئامادەباشی دەستپێکردنی بزاوتن بوو.

---

١٠٠کوژراو و بڕێکی زۆ لە خۆراك و پێداویستی ئۆتۆمبیلی زرێپۆش و نازرێپۆش و تۆپ و چادر زیان لە ئینگلیز کەوت، دوای ئەمە هێزەکانی شێخ چوون چەمچەماڵیان داگیرکرد و کاپتن (بوند)ی یاریدەدەری حاکمی سیاسییان بەدیل گرت.

لە ١٧ی حوزیراندا ژەنەڕاڵ فیریزەر لە کەشێکی زۆر گەرمدا لەدژی شێخ مەحموود جولا. فریزەر لە بەندەری بازیان لە زنجیرە چیاکانی قەرەداغ (١٢ میل کەوتۆتە رۆژهەلاتی چەمچەماڵ) خۆی قایم کردبوو. ئەمەش تاکە ریڕەوی ئەو زنجیرە چیایە بوو، کە بریتی بوو لە دیوارێکی چیایی بە بەرزی نزیکەی ٤٠٠ پێ، دەروازەیەکی لەسەر شێوەی ژمارە (٧) لێ دەکرێتەوە و دواتر بە بڕی هەزار پێ نزم دەبێتەوە، ئەم دەروازەیە لە دوو لاوە لە بەرزاییەوە بە دیوارێکی بەهێزی بەردین گەیەنرابوو، بەلام ئێستا رووخاوە، هەروەها پێش ١٠ساڵ ببووە شانۆی کارەساتێك، کە تووشی هێزێکی تورکی بوو، کە لە ئەرکێکی هاوشێوەدا بوو. ژەنەراڵ فریزەر بەرەو مەودای لێدان تا گەیشتە نێوان خاڵە کوردییەکان بەروپێش چوو، دواتر هێزەکانمان بەر لەوەی بەیانی رۆژی دووەم دابێ بەسەر بەرزاییە ستونییەکانی قەرەداغ کەوتن، کاتێ گەیشتنە لوتکە، تۆپهاوێژەکانمان دەربەندیان لە رۆژهەلاتدا بۆردوومان کرد. لەبەرئەوەی کوردەکان چاوەڕێی هێرشکردنە سەریان بوون، لەسەر شێوەی هێرشەکانی تورکیا. بەلام کاتێ بینییان لە بەرزاییەوە هێرشیان دەکرێتە سەر و لە گشت لایەکەوە گەمارۆ دراون، دەستیان بەخۆیان شۆڕ کردەوە.

دوای چەند خولەکێك لەشەڕی دەستەویەخە، فەوجی ٨٥ی بۆرمی بەسەریاندا سەرکەوت، ئەو فەوجە زۆربەیان لە قاچیەکان کە بەرەگەزی نیمچە مەغولی دادەنرێن و لە بەرزاییەکانی بۆرما نیشتەجێن، پێکهاتبوون، لەڕووبەڕوو بوونەوەی یەکەمیاندا، ئەوەیان سەلماند کە خەسڵەتی سەربازییان لە گۆرگای[1] خزمیان، کەمتر نییە. تا گەیشتە بەرەبەیانی رۆژی دووەم، تەواوی دەربەندەکەمان بەدەستەوە بوو، شێخ

---

١- چەند یەکەیەك، لە نێوانیاندا (کورکا)ی یەکەم و سێیەم، لە سەر هێڵی ئاسنی بێجی لە کەناری لای راستی دیجلە رۆیشتن تا گەیشتنە کەرکوك. گەرما و کەمی ئاو سەربازەکانی زۆر شەکەت و ماندوو کردبوو، هەر بەرۆیشتنەوە ژمارەیەکیان بەدەمدا کەوتن. (بۆ ئەوەی woodyatt نووسیوویەتی بگەڕێوە ). نووسەر.

مەحموود بە برینداری لەگەڵ براکەی بەدیل گیران[1]، سەرجەم هێزەکە پەرت بوو، چ ئەوەی کوژرا و چ ئەوەی گیرا چ ئەوەی رایکرد.

چل و هەشت جەنگاوەری دوژمن، بەگێژی لە گۆڕەپانی جەنگدا کەوتبوون. زیاتر لە سەد جەنگاوەریش بەدیلی کەوتنە دەستمان، ئەم داستانە، بە داستانێك لە بەرامبەر شەڕکەرانی چیایی دادەنرێت.

## دەستبەسەرداگرتنەوەی سلێمانی

لەبەر ئەوەی ژەنەڕاڵ فریزەر لەسەر سەلامەتی دیلەکانمان، سووربوو، کە لە چنگی پاسەوانە کوردەکان بوون، ئەوانەی لەوەی کە روویدا تورەبوون، بۆیە فەرمانی بە کەتیبەی رمهاوێژ (لانسەر) کرد، کە دەستبەجێ بەرەو سلێمانی بچن. ئەو کەتیبە لە دووری ٣٠ میل لە سلێمانییەوە دوور بوون، کەتیبەکە بەبێ ئەفسەر، بە سەرکردایەتی دوو یاریدەدەر تەنها بە گورەوە بەرەو سلێمانی چوون، بەرلەوەی هەواڵە ترسناکەکەی بازیان بە پاسەوانە کوردەکان بگات، بە سەریاندا سەرکەوتن، ئینجا دیلەکان دوای ئەوەی زۆر بە توندی دەست بەسەر کرابوون، ئازاد کران. هەرچی هێزە سەرەکییەکە بوو، ئەوا بۆ بەیانی رۆژی دووەم چوونە ناو سلێمانییەوە.

شەش هەفتەکەی دوای ئەمەش لە تەمبێکردنی سەرۆکە یاخیبووەکاندا بەسەربرا، ئەمەش لەسەر دەستی چەند رەتلێکی بچووك کە پێشتر چووبوونە ئەو شوێن و جێگا

---

١- هەروەها لەگەڵ شێخدا مامەکەی (حاجی سەید حەسەن) و زاواکەی (شێخ محەمەد غەریب) و نووسەرەکەی (تاهیر محەمەد) دەستگیر کران، شێخ مەحموود کاتێ بەدیل گیرا لە تەك شاخێکدا بوو، هەموو ئەوانەی لە کەرکوکەوە دەچنە سلێمانی دەتوانن ئەو بەردە لەلای چەپی دەربەندەکە ببینن کە ئێستا پێی دەگوترێت (بەردە قارەمان).

دابڕاوانەی چیا[1]. لە هەفتەی یەکەمی مانگی ئابی ١٩١٩ ئاسایش و نیزام بەتـەواوی بۆ سلێمانی گەڕایەوە و ژەنەڕاڵ فریزەریش دوای ئەوەی کـۆنترۆڵی تـەواوی وڵاتـی بـۆ ئیدارەی مەدەنی گێڕایەوە، پاشەکشەی کـرد، هـەروەها فریـزەر بـەر لـە گەڕانـەوەی حامیەیەکی کاتی لە سلێمانی جێهێشت و بارەگایەکی بۆ هێزێکی بچووك لە کەرکوك دامەزراند[2]. بەم شێوەیە کۆتایی بە پڕۆسەیەکی بچووك هات، کە لەگەڵ ئـەوەی لـە سەرەتادا تووشی شکست هات، ئەوەی سەلماند کە ئەو سوپا هیندییەی کە ئەگەرچـی بەشێکی وەك فەوجی پێنج و هەشتای (بەرمی) هـەرگیز لـە جوڵانـەوە فعلییەکانـدا بەشدارییان نەکردووە، بە زیاتر لە دوژمنێك بوون، بـۆ کوردەکـان، هـەروەها لەگـەڵ کەمی زۆر لە هێزە سەربازییەکانمان، هێشتا دەیتوانی ئەوەی داوای لێکراوە ئـەنجامی بدات، بە مەرجێ سەرکردایەتییەکی لێهاتووی هەبێت.

## دادگایی کردنی شێخ مەحموود

شێخ مەحموود هێنرایە سلێمانی و هەرزوو برینەکـەی سـارێژ بـوو. لەگـەڵ شـێخ غەریبی هاوڕێیدا برانـە بەردەسـتی ئەنجوومـەنی عـورفی سـەربازی و بـە تۆمـەتی هەڵگیرساندنی شۆڕش لە دژی دەسەڵات تۆمـەتبارکرا حـوکمی لـە سـێدارەدانی بـۆ دەرچوو، بەڵام سەرکردەی گشتی بەزەیی پێداهاتەوە و حوکمەکـەی بـە بەنـدی هـەتا

---

١- هێزێکی تایبەت بۆ گوندی (داری کەلی) کە شێخ مەحموود تێیدا نیشتەجێ بوو، چـوو داگـیری کرد، ئەو گوندە لە دووری ٢٠ کیلۆمەتر لە باشووری شاری سـلێمانییەوە بـوو. هـەروەها هێزێکـی دیکە بۆ هەڵەبجە نێردرا و لە گوندی (ویلاکە) کە ٤٠ کیلومەتر لە سـلێمانییەوە دوورە رووبـەڕووی بەرگرییەکی توند لەلایەن شۆڕشگێڕان بووەوە.

٢- بۆ نامەکەی ١٩١٩/١١/١٢ی سیر جۆرج ماکمۆن، کە بۆ (لەندەن کازیـت)ی نـارد، بگـەڕێوە، ئەویش لە ١٩٢٠/٣/٨ لە ژمارە ٣١٨١٣ دەرچووە. نووسەر.

هەتایی گۆڕا[1]، چونکە لەلایەك دیلەکانی لای خۆی ئەزیەت نەداوە، هــەروەها لەســەر ئەو بنەمایەی کە رەوشی ئێمە لە کوردستان بە دەگمەن پاساوی بۆ دەهێنراوە، شــێخ سیاسەتی حکوومەتی خاوەن شکۆی بەهەند وەردەگرت.

هەرچەندە من هاوسۆز بووم لەگەڵ ئەو هەستەی کە وایکرد ئەو حوکمە میهرەبانە دەربچێ، بەڵام بەفەرمی هەر دژایەتیم کرد، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەی تا شــێخ و دار و دەستەکەی لە کوردستان لە ژیاندا مابن، ئەوا هەر بەهیوای دووبــارە گەڕانــەوە بۆ دەسەڵات دەژین، دوژمنانیش، لەم گەڕانەوەیدا، لە ترســدا دەژیــن، مردنــی شــێخ زیاتر لە هەر شتێکی دیکە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی ئارامی و دڵنەوایی لە وڵاتدا. من سێ جار لە نووسینگەی سلێمانی لەگەڵیدا کۆبوومەتەوە، لە نەخۆشخانەش سەردانیم کردووە، لەوێ ئاماژەی بەوەدا کە دادگای سەربازی مافی ئەوەی نییە، ئــەو دادگــایی بکات. بەندی دوانزەی وێلسن و بەیاننامەکەی (ئینگلیزی ـ فەرەنســی) کــە لــە ٨ی تشرینی دووەی ١٩١٨ دەرچووە، بۆ من خوێندە، وەرگێڕدراوە کوردییەکەی ئەمانــەی لەسەر کاغەزێکی لکێنراو بە قورئانێکدا بۆ نووسرا بوو وەك کتێبی جادوگەران لــەبن هەنگلی خۆی قایم کردبوو.

دوای چەند ساڵێك لێبوردرا و رێگەی پێدرا، لە دوورە وڵاتی بگەڕێتەوە، بــووە مایــەی دڵەڕاوکێ و خەرجییەك بۆ هەر یەك لە حکوومەتی ئێرانی و عێراقی لەو سەردەمەدا[2].

---

١- دواتر بەزەییەکی دیکە شێخی گرتەوە، حوکمی هەتا هەتایی ساڵی ١٩٢١ پوچەڵکرایەوە و بــە دوورخستنەوە گۆڕا. نووسەر.

٢- دەگێڕنەوە کە سەرۆکی ئەنجوومەنی عــورفی عەســکەری بەتونــدی هەڵســوکەوتی لەگــەڵ شــێخ مەحموودا کردووە، لە دانیشتنەکانی دادگادا گاڵتەی پێدەکات، شــێخ مــەحموود زۆر بەتونــدی لێــی توڕە دەبێت، لەبەر ئەوەی هیچ شتێکی لەبەر دەســتدا نــەبووە، بــۆی راوەشــێنێ، کلاوجامانەکــەی سەری هەڵدەگرێ بە جنێودان بۆی رادەوەشێنێ، سەرۆکی ئەنجوومەن بە لــە ســێدارەدان حــوکمی بــۆ دەردەکات و حوکمی پێنچ ساڵ بەندی و سزا بــە بــڕی (١٠) هــەزار روپیــە بەســەر شــێخ غەریبــدا

گۆڕینی بڕیاری حوکمەکەی سێر ماکمۆن، بەباشی نە لە کوردستان، نە لـە نێـوان بەرپرسانی عەرەب لە بەغدا وەرنەگیرا، لە دامودەزگـا سـەربازییەکانی بـەریتانیا وا دانرا کە ماکمۆن بەڕاوێژی من کار دەکات، قسە و قسەلۆکێکی گاڵتەجاری زۆر دژی من و حاکمە سیاسییەکان لەسەر مێزەکانی نان خواردنی سـەربازان و یانـەکانیان بـە گشتی، هـەبوون. لەسـەر ئەمـەش مـن ئـارامی خـۆم پاراسـت و بەلگەنامـەکانی کێشەکەم هەتاکو بۆ ژەنەراڵە قین لە دڵەکانیش ئاشکرا نەکردووە. سێرجۆرج ماکمۆن، هەروەك سێر ویلیام مارشاڵ یارمـەتی مـاددی و مەعنـەوی بـێ بـەهای، لـەماوەی ساڵێکدا پێشکەشی هەموو لقێکی ئیدارەی مەدەنی کردووە. ئەمەش شـایەنی ئـەوە بوو کە نارەزایی هەندێ کەسی نا بەرپرس، بورژێنێ بۆ ئـەوەی بەرەیـەکی یـەکگرتوو لەگەڵ بارەگای گشتی سەربازی پێکبێنن.

## ئەرك و کارەکانی حاکمی مەلەکی

ئەرکەکانی ئەو پۆستەی کەمن بەشێوەیەکی کـاتی وەرم گرتبـوو، ئـەرکێکی زۆر سەخت بوون. بەو سیفەتەی بالیۆزی گشتی فارس بـووم، بـەرپرس بـووم لـەوەی کـە حکومەتی هینـدی و وایتهـۆڵ لـەو ڕووداوە سیاسـییانەی کـە لـە باشـووری ئێـران ڕوودەدەن، بە تەواوی ئاگادار بکەنەوە. هەروەها وەك موقیمێك (مقیم)ی سیاسی لـە دوورگەی عـەرەبی، سەرپەرشتیکردن و ئاڕاستەکردنی هەندێ بۆنەی سیاسی لە عومان و ئیماراتی عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی دوورگەی عـەرەبی، بـە پەیوەنـدیکردن بـە کـوڕی سعودیشەوە، لە ئەرکی مندا بوون. هەروەها بـەو سـیفەتەی کـە حـاکمی پاشـایەتی گشتی بووم لە عێراق، بەرپرسی ئیدارەی ناوچـە داگیرکارەکـان بـووم. وەك سـەرۆکی حاکمە سیاسییەکانیش (کە پاشکۆی هێزە داگیرکەرەکان بوو) لـە بەرامبـەر وەزیـری

---

دەسەپێنێ، دواتر حوکمەکەیان بۆ دوورخستنەوە بۆ هینـد گـۆڕا و تاکۆتـایی سـاڵی ١٩٢٢ تێیـدا مانەوە، بەرلەوەی بۆ سلێمانی بگەڕێنەوە، برانە کوێت ماوەی مانگێك لەوێش مانەوە.

خاوەن شكۆ لە تاران و سەركردەی گشتی، سەبارەت بە كاروبارە سیاسییەكانی وڵات هەر لە كرمانشانەوە تا ئەنزەلی (بەندەری پەهلەوی)، بەرپرس بووم.

لە حوزێرانی ١٩١٩ سەرباری ئەو بەرپرسیارێتییانە، بەرپرسیارێتی چارەسەركردنی سەرجەم كاروباری كورد لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتی داگیركراو لە حەلەبەوە تا دیاربەكر و ئورفە و وان و بەتلیس و ئورمێ، بۆ سەر بەرپرسیارێتییەكانم زیادكران. هەرچەندە ئەوەندە جەختەكردنەوە لە بەرپرسیارێتی كارێكی تاقەت بەرە، بەڵام لەوەشدا سوودی راستەقینەی دەبێت.

لەو رەوشانەی كە ئەوكات لە ئارادا بوون، پێویست بوو كە رێوشوێنی پێویست بۆ رێكخستن و هاوكاریكردن لە ناوچەكە لە بەغدا و لاكانی دیكە بەگوێرەی توانا، بگیرابوایە بەر. چونكە حكوومەتی هیندی لەلایەنی دیكەوە زۆر سەرقاڵ بوو، زۆركەم هیچ كاریگەرییەكی لەسەر ئەو سیاسەتەی كە لەو ناوچانە پیادە نەدەكرا و خواستی زاڵ بوون بەسەریدا نەبوو. وەزارەتی هیند زۆر دوور بوو لەوەی هیچ رۆڵێكی دیاریكراو، لەو بڕیارەی كە حكوومەت وەریگرتبوو، بگێڕێ. هیچ كارێكی وای نەكرد كە روخساری پێشبینی بە مەرجەكانی ئینتیداب بنوێنێ، لەبەر ئەوەی نوێنەرانی حكوومەتی بەریتانیای مەزن لە ناوچەكانی دیكە ـ فەڵەستین و سوریا و توركیا و ئێران ـ هەموو لە بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر وەزارەتی جەنگ و وەزارەتی دەرەوە راستەوخۆ هاوبەش بوون.

رەوانەكردنی كێشە هەنووكەییەكان بۆ لەندەن، بەشێوەیەكی گشتی سوودی نەبوو، چونكە بزوێنەری ئیداری لە وڵات (بەریتانیا) بەشێوەیەك ئاڵۆز بوو، كە بەدەگمەن رێكدەكەوێت وەڵامی بروسكەكان لە مانگێك كەمتری پێ بچێت، وەڵامەكانیش نە دیاریكراو نە سنووردار كراو بوو، تاكو سوودیان لێ وەربگیرێت و وەك رێبەرێكی كار چاوی لێبكرێت.

## عێراق و رەوشی سیاسی نێو دەوڵەتان

ئەو کێشەیەی لە عێراق لەبەر دەستمان بوو، سەرباری گەورییەکەی، مەترسی و ئالۆزییەکەی لە هیچ یەکێك لەو کێشانەی کە لەبەردەم شاندەکانی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس خرابوونە روو، کەمتر نەبوو. هەروەها ئەو پەرچەکردارە سیاسییانەی کە بەدوای هەنگاوەکانەوە (ئەگەر بهاوێشترابوونیا) دەهاتن، شتێکی مەزەندە نەکراو بوو. ئەستەم بوو، تا حساباتمان لەگەڵ ئەلمانیا یەکلا نەکرێتەوە بەلای کەمەوە لەڕووی پڕەنسیپەوە، سەیری مەرجەکانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا بکەین. داهاتووی ئاسیای رۆژئاوا بابەتێك بوو لە سەنگی مەحەکدا بوو. چونکە تورکیا بۆ ماوەیەك نەیتوانی بەرگری بکات، بەشێوەیەکی وا شکستی خواردبوو، بەچۆکدا کەوتبوو. قورسایی هەڵمەت لە دژی تورکیا لە (دەردەنیل) و سوریا و عێراق و ئێران کەوتبووە ئەستۆی هێزە هیندی و بەریتانییەکان. سەرباری ئەمەش هاوپەیمانەکانمان و یونان، هاواریان دەکرد و بە دەنگێکی گڕەوە داوای قەرەبووی هەرێمایەتییان دەکرد، ئەمەش وای دەکرد تورکیا بە کەمێك بچووکتر بێت لە دەوڵەتی سربیای دوای جەنگ. فەڕەنسییەکانیش داوای جێبەجێکردنی رێککەوتننامەی سایکس ـ پیکۆیان دەکرد. عەرەبەکانیش، کە مەلیك حوسێنی پاڵەوانەکەیان نوێنەرایەتییان دەکرد و خۆی خۆی دامەزراند، دوای ئەوەی بەیارمەتی بەریتانیا حوکمێکی کاتییان چنگ کەوت، داوای وڵاتانی عەرەبی یەکگرتوویان دەکرد. ئیبن سعودیش کە تازە ئەستێرەی بەختی بەدەر دەکەوت، چاوەڕێی ئەو دەرفەتەی دەکرد کە بانگەوازەکانی بگاتە ئاستی بیستن.

هاوپەیمانان لەرێگەی نوێنەرە کوردەکانی ئەستەمبوڵەوە وایان لە هۆزە کوردییەکان گەیاند کە ئەوانیش پێویستە حکوومەتی داهاتووی خۆیان دیاری بکەن، ئەو حکوومەتەش سەربەخۆیی پێ دەبەخشرێ، کوردەکانی ئێرانیش نیازیان وابوو بچنە پاڵ ئەو دەوڵەتە کوردییە نوێیە، ئێسماعیل ئاغا (سمکۆ) و سەید تەها و سەرجەم سەرۆکەکان هەڵی خۆیان دەست کەوتبوو، بە گرنگییەوە چاوەڕێ ئەو پەرەسەندنانەی کە رۆژانی داهاتوو لەگەڵ خۆیا دەهێنا، دەکرد.

هەرچی سەبارەت بە عێراق بوو، ئەوا حکوومەتی خاوەن شکۆ تەنها لەسەر راستی و ئاڕاستەکانی ئەو راپۆرتە درێژ و هەندێجار ناکۆکانەی من بەو پێیەی کە نوێنەری بەریتانیام لە بەغدا دەمناردن، دەوەست. زۆربەی جار ئەو راستییانەش ورد نەبوون، ئاسان نەبوو ئاڕاستەی را مەزەندە بکەن. ئەم کارە ناکۆکییەکی توندی هەڵدەگرت، نە پاڵەوانەکانی حوکمی عەرەبی لە سوریا، کە بەخۆیان خۆیان دامەرزاند، نەهیچ تاکێك لەوان زانیارییەکی راستەوخۆی لەبارەی عێراق نەپێش جەنگەکە نەدوای جەنگەکە هەبوو. نیازم نییە، هەوڵ بدەم، لەم پەرتووکەدا، باسی ئەو گفتوگۆیانەی کە لەبارەی داهاتووی ئیمپراتۆرییەتی تورکی و ئەرمینیا و ئەو بەشانەی کوردستان کە کەوتوونەتە دەرەوەی سنووری ویلایەتی موسڵ، کراوە، بکەم. لەبەر ئەوەی پۆستەکان (برید) دوا دەکەوتن، بۆیە سەرجەم پەیوەندییەکان لەڕێگەی بروسکەوە ئەنجام دەدران. دەبوو، بەشێوەیەکی بەردەوام بۆ مەندوبی سامی لە ئەستەمبۆڵ[1] و لۆرد ئەلەنبی لە قاهیرە[2] بگەڕێینەوە. ئەفسەرانی ئەلەنبی لە دیمەشق و حەلەب و ئەوانەی پشت ئەوانەوە، وەك پێشتر روونمان کردووە پەیڕەوییان لە سیاسەتێك دەکرد، لەگەڵ سیاسەتی حکوومەتی خاوەن شکۆ نەدەگونجا[3].

هەروەها نوێنەری بەریتانیا لە تەفلیس لەگەڵ فەڕەنسییەکان لە دانوستاندن دابوو، دەبوو سەیری هەڵوێست و بەرژەوەندییەکانیان بکرێت، هەروەها دەبوو زانیارییەکان بە وەزیری بەریتانی لە تاران بگەیەنرێت، چونکە حکوومەتی ئێران بە سروشتی رەوشەکە

---

١- ئەستەمبۆڵ ئەوکات لە دەستی هاوپەیمانان بوو، هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی هاوپەیمان مەندوبێکی سامی تێیدا دامەزراندبوو.

٢- بارەگای گشتی لورد ئەلەنبی سەرکردەی ((هەڵمەتی میسری)) لە قاهیرە بوو.

٣- سیر ئاڕلۆند ویلسن، وەکیلی حاکمی مەلەکی لە عیراق، بەتوندی لەگەڵ رای ئەو ئەفسەرە ئینگلیزییانەی لە حکوومەتی عەرەبی دیمەشق کاریان دەکرد، جیاواز بوو، بەتایبەتی سەبارەت بە دروست کردنی جۆرێك لە حوکمی نیشتیمانی لە وڵاتە عەرەبییەکان.

لەوەی کە سیاسەتی سەربەخۆیی کوردی دەری دەخـات , دەترسـا کاریگـەری لەسـەر هۆزە کوردییەکانی ئێران پەیدا بکات.

بەبێ بوونی هیچ سیاسەتێکی دیاریکراو، ئەرکی من بوو کە لـە کـاری جێبـەجێ کردندا راوێژ بـە حکوومـەت پێشـکەش بکـەم. بەرپرسـیارێتیەکی سـەختم هـەبوو، سروشتی شتەکان یارمەتیدەر نەبوون، کەس لە کارە بەشداری پێبکەم[1]. باری حاکمـە سیاسییەکان ئەوانەی لە گۆڕەپانەکەدا کاریان دەکرد سـووکتر و کـەم سـەختتر نـەبوو لەهی من، ئەوان بۆماوەی چەندین مانگ گیانیان لەسەر دەستیان دادەنـێن. بەپلـەی یەك فەزڵی دەرچوونمان بەبێ شەرمەزاری بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە، لەو پەشێوییە مـاددی و فیکرییەی کە لەو رۆژە ناخۆشانەدا باوبوون.

## کوردەکانی تورکیا و ئێران

لەسەر دووبنەما لە پەشێوییەکانی هەواڵگری دەرچووین: پێویستە بـە تواناکـانی خۆمان هانی هیچ هەوڵێك نەدەین کە کوردەکـانی ئێـران بـۆ راکـردن لـە دەسـەڵاتی ئێرانی ئەنجامی دەدەن. هەروەها دەبوو دەستبەرداری ئەو کوردانـە بـین کـە دەکەونـە دەرەوەی سنووری ویلایەتی موسڵ، بـۆ تورکـەکان چـی بخوازێـت ئاوایـان لێبکـات، بنەمای یەکەم هەر لە سەرەتاوە لە خۆیـەوە روون بـوو، ئەگـەر هاوپەیمانێتییـەکانمان لەگەڵ ئێران و ئەوانەی پەیوەستن پێیانەوە لەبەرچاو بگرین. هەرچی بنـەمای دووەمـە پێ دەچوو لـە شـوێنی خـۆی روون بێـت، بـەڵام تـا هاوپـەیمانان لـە بەدەسـتهێنانی

---

١- لە ١٩ی تەمووز داوا لە حکوومەت کرد، کە ئەفسەرانی بە ئەزموون و پلەوپایەی بەرز لـە عـیراق دابمەزرێن، بۆ ئەوەی سەردانی عیراق بکەن و راوێژ بە من و حکوومەتی خاوەن شکۆ بدەن، لـە داواکـەم ئەوەشم نووسیبوو کە سێر ۆلتەر لۆرنس، ئەگەر بکرێت تەنسیب بکرێت ئەوا لێرە پێشوازی لێدەکرێت.

ڕەزامەندی تورکی لەسەر ڕەشنووسی پەیمانی سیڤەر سەرکەوتوو نەبوون[1]، ئەو بنەمایە مایەی ڕەزامەندی فەرمییە لە وڵاتدا، پەیمانی سیڤەر دانی بە بوونی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ دەنا. داهاتووی نەتەوەی ئەرمینیاش لەسەر ئارەزووی ئەمریکا بۆ قەبووڵکردنی ئینتیداب بەسەر ئەرمینیا وەستا بوو. ئەگەر ئامادە نەبوایە ئەو بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆ بگرێت، دەبوو کارەکە بۆ تورکیا جێبهێڵدرێت، چاوەڕێی ئەو چارەنووسە بکەن کە ئەگەرەکانی لەکەس شاراوە نەبوو.

## هێڵی ئاسنی کەرکوك و کوردستانی باشوور

گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش بۆ سلێمانی، هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندین، کە هانی حکوومەتی خاوەن شکۆ بدەین بۆ دامەزراندن و درێژکردنەوەی هێڵی ئاسنی (باقوبە- خانەقین) تا (کفری و کەرکوك) بەوپێیەی باشترین ئامرازی ئارامکردنی کوردستانی باشوورە و وای لێبکرێت لە بەغدا نزیکتر بێت. لە ٢٤ی ئابی ١٩١٩ وەزارەتی هیندی ئەمەی خوارەوەی بە بروسکە بۆ ناردین:

هێڵی ئاسنی پێشنیازکراو[2] لە نێوان قزلربات (سەعدیە) و کفری ئینجا کەرکوك، ڕاتاندەسپێرین بەزووترین کات ئەو هێڵە دابمەزرێنن، جا سوودە کۆتاییەکەی هەر چییەك بێت، ئەو هێڵە با لەسەر بناغەیەکی تەواو ستراتیژی دابمەزرێت، چونکە بە بنەمایەك بۆ پارێزگاری و ئارامی کوردستانی باشوور دادەنرێت، سەرباری سەختی زۆری دارایی، حکوومەتی خاوەن شکۆ بەپێویستی دەزانێ کە توێژینەوەی گرفتە سیاسییەکە لەڕووی پاساوە ستراتیژییەکانی بکرێت، بەرلەوەی پڕۆژەی درێژکردنەوەکە پەسند بکرێت.

---

١- شۆڕشی مستەفا کەمال (کەمال ئەتاتۆرك) سەرکەوت و پەیمانی سیڤەر کە سەربەخۆیی کوردستانی تێدا باسکرا بوو، بەرلەوەی واژووی لەسەر بکات لەناوبرد و بە پەیمانێکی دیکەی ئاشتی ئاڵۆگۆڕکرد و ماددەی سەربەخۆیی کوردستانی تێدا ڕەش کردەوە.

٢- لەساڵی ١٩٢٥ ئەو درێژکردنەوەیە تەواو بوو. نووسەر.

داهاتووی کوردستان هێشتا چاوەڕێی یەکلایی کردنەوە دەکات، بەڵام بە دڵنیاییەوە بەرپرسیارێتییەکانی حکوومەتی خاوەن شکۆ بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان لە سەرپەرشتیکردنێکی سیاسی لاواز زیاتر ناچێت. ناکرێت هیچ گرفتێك لە جۆری گرفتی راستەوخۆی ئیدارەی بەریتانی هەبێت، حکوومەتی خاوەن شکۆ لەم رەوشەدا زۆر بەتوندی رێگری لە هەر هەنگاوێك بەرەو داگیرکاری سەربازی دەکات. تا ئێستاش حکوومەتی بەریتانی پاڵپشتی لە سیاسەتی درێژکردنەوەی دەسەڵاتی بەریتانی بۆ کوردستانی باشوور دەکات، چونکە لەو باوەڕەدایە، خودی دانیشتوانەکەی پێشوازی لێ دەکەن، لەسەر ئەم بنەمایە پێشنیازی هاتوو لە بروسکەکەتانی (بەمێژووی ١٩ی ئایار) پەسند کرد، سەبارەت بە پێکهێنانی چوارچێوەیەك لە دەوڵەتانی کوردی سەربەخۆ، کە سەرۆکە کوردەکان سەرۆکایەتی بکەن.

ئێستا روون دەبێتەوە کە ئەو باوەڕە لە شوێنی خۆی نەبوو، دانیشتنوانەکەی بەو چالاکییە دوژمنکارانەیان زۆر دوورترن لەوەی پێشوازی لە دەسەڵاتی ئینگلیزی بکەن، بەشێوەیەك هێڵی ئاسنی ستراتیژی داواکراو یارمەتی وەستاندنی ئەو چالاکییە دوژمنکارانەیە لە سنووری خۆی دەدات. لەم رەوشەدا باش نییە حاکمە سیاسییەکان و ئەوانەی وەك ئەوانن پاشەکشە پێ بکەین و کوردان بۆ خۆیان لێ بگەڕێن. هەڵسوکەوتی جێگرەوە بۆ ئەمە لە پاراستنی نیزامی نێوان هۆزە یاخیبووەکان بەزەبری چەك، گرفتی چوونە ناو پابەندییە سەربازییەکان دەکاتەوە، کە حکوومەتی خاوەن شکۆ بەترس و مەترسییەکی زۆرەوە بیری لێکردۆتەوە. دوورترین شت کە حکوومەتی خاوەن شکۆ بیخوازێت کێشەی نوێی سنووری باکووری رۆژهەڵاتە، لەسەر سنووری عێراق، کە زۆر جێی گومانە. بەم شێوەیە وەڵامم دایەوە:

رەوشتی ئێستا بەو شێوەیەی ئێوە باستان کرد، ئاوا نییە. دەسەڵاتی سەربازی لەماوەی مانگێکدا، ئاسایش بگەڕێنێتەوە و ئیدارەی مەدەنی لەماوەی سێ مانگ دابمەزرێنێ. شێخ مەحموود، لەماوەی پێشوو لە کۆکردنەوەی (٣٠٠) پیاو لەنێوان ئەو هەموو هەزار هەزارەی کە دەکرا کۆیان بکاتەوە، سەرکەوتوو نەبوو، ئەمەش بە بڕوای

من بەڵگەیەکی بەسە لەسەر ئەوەی کە سەردەمی ئێستا، لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە پێشوازی لێکراوە.

ئێمە ئێستا بەزەبری هێز حوکمی کوردستان ناکەین، بەڵکو بەڕەزامەندی دانیشتوانەکەی، بەڵام هیچ حکوومەتێکیش کارەکانی بەڕێوە ناڕوات، ئەگەر هێزێکی لەپشتەوە نەبێت. ئەو بیروڕایانەی کە لە ١٤ بەندەکەی سەرۆك ویلسن دا هاتوون و بە دەرکردنی بەیاننامەی (ئینگلیزی ـ فەرەنسی) کە لە ٨ی تشرینی دووەم دەرچووە، پاڵپشتی لێکرا.

ئەوەی ئەمانەش بەهەندی وەردەگرن، نەتەوە و ئایین و رەگەز دەکەن بە بنەمای حکوومەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بری ((لێهاتوویی و توانا بۆ حوکمکردن)) ئەمە ئەو دوژمنکارییانەی کە بۆ ماوەی ١٠٠ ساڵ دەبوو خامۆشکرا بوون، زیندووکردەوە.

لەڕاستیدا ئەو بیروڕایانە بەسەر ئازارە توندەکانی جەنگەوە، هاتوون، هەر رەگەز و تایفەیەك بە پەرۆشەوە دەستی پێوەگرت. بە گوێرەی خەسڵەتە ئەتنیەکانیان دەیانگونجاند. پێشوەختە پەرچەکردارەکە روون بوو، ناکۆکییە توندەکانی نێوان پارتە سیاسییەکانی فەڵەستین و سوریا بەیەکەمین نیشانەکانی دادەنران.

هەرچی لە سلێمانی بوو ئەوا تەوژمەکە دەستی بەدابەزین کردبوو. دوای ئەزموونێکی کورت لە پەشێوی حوکمی نیشتیمانی، خەڵکی حەزیان نەدەکرد ئەزموونەکە جارێکی دیکە دووبارە بکەنەوە، بۆیە پێویست بوو ئیدارەی مەدەنی لەسەر بناغەیەکی کوردی رێکبخرابوایە، بە بەکارهێنانی فەرمانبەری کوردی لەژێر چاودێرییەکی چالاکی بەریتانی، ئێستا زۆر بەباشی بەڕێوەدەچێت. داواکاری بەپەرۆشی خەڵك لە چاودێرییەکی زیاتری بەریتانی، بەهۆی نەبوونی ئەفسەر بۆ ئەم کارە، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر وڵات و ئیدارەکەی کردووە، هەتاکو داهاتە مەزەندەکراوەکانی ئەمساڵیش بەبڕی ٢٠ هەزار پاوەند لە خەرجییە مەزەندەکراوەکان زیاترە، لە ساڵی داهاتووش دا رەوشەکە هەردەبێت زۆر لەمە

باشتر بێت. ئەم راستییە بە تەنها ناوچەی سلێمانی لە ناوچە سنوورییە ئاساییەکان و سەرجەم لاکانی کوردستان جیا دەکاتەوە. تورکەکان بەردەوام ئەو ناوچەیەیان بە بەشێك لە عێراق داناوە، ئینجا لەسەر ئەم بنەمایە لەرێککەوتننامەی سایکس - پیکۆ پۆلینکراوە، لەڕووی جوگرافی و ستراتیژییەوە بۆ عێراق نەوەك بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە.

شاراوە نییە کە پەشێوییەکان لە هەموو شوێنێ بلاوە، بەلام من بڕوادەکەم، ئەگەر بۆماوەی سالێ یان دوو سالی دیکە بتوانین بەشێوەیەکی بەردەوام، لەسەر بنەمای ئێستا بڕۆین، ئەوا بە ئاوی ئارامتر دەگەین. شۆڕشەکەی شێخ مەحموود لە هەموو لایەکی باکووری عێراق تواناکانی ئێمەی لە پاراستنی ئاسایش و سەپاندنی دادوەری، لە بەرامبەر باوەڕێکی فراوان و بلاو سەبارەت بەوەی سوپاکانمان ولاتیان جێهێشتووە، تەجرەبەکرد. رێگا و هێلی ئاسن بە ئامرازی بەهێزی مەدەنییەت دادەنرێت، من لەڕووی دروستکردنیەوە، نەوەك بەها ستراتیژییەکەی لە کوردستانی باشوور، سەیری ئەمە دەکەم.

ئەو بڕیارەی کە لە کۆتاییدا سەبارەت بە رەواندوز (کە ئێستا پاشەکشەمان کردووە لێی) وەردەگیرێت، هەرچۆنێك بێت، بەلام ناتوانین سلێمانی ئاوا لێبگەڕێین. چونکە ئەو رەگەزانەی کە نیزام تێکدەدەن، هەر زوو دەستی بالایان لە شارەکە دەبێت، ئەوکات لە کەرکوك و کفری و هەولێر پێویستیمان بە هێزێکی زیاتر لەوەی کە ئێستا لە سلێمانی یان لە نزیك سلێمانی هەمانە، دەبێت. ئەم رووداوانەی دوایی هەرگیز کاریگەری لەسەر راکانم نەبووە، سەبارەت بە جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتەی کە حکوومەتی خاوەن شکۆ لە ٩ی ئایاردا پەسندی کرد، لەبارەی دامەزراندنی چەند دەولەتۆچکەیەکی کوردی سەربەخۆ، بەلام دەبێت پلەی سەرپەرشتی کردن پشت بە پێویستییەکانی ولات و هەلکەوتی ستراتیژی ببەستێ.

پێویستە ئەو سەرپەرشتییە لە سلێمانی بەڕێژەیەك توند بێت، ئەمەش بەهۆی هەلکەوتە جوگرافی و ستراتیژییەکەی و بەهۆی دەولەمەندی ولاتەکە و خواستی خەلك

لەسەر خاوەنداریێتی زەوی، کە زۆربەیان مـوڵکی خـاوەن زەوییـەکانن، ئـەو زەوییانـە توانای زۆری ئاوەدانکردنەوە و پەرەسەندنی هەیە، چونکە ناوچەکە بـە مەڵبەنـدێکی پیشەسازی تـوتن و چـاندنی تـوتن دادەنرێـت و لـە بەرهـەمی لـەوەڕگا و دارسـتان دەوڵەمەندە، هەرچی سنووره لەگـەڵ ئێـران، ئـەوا زۆر بەباشـی دیـاریکرا بـوو. لـە سەردەمی نوێدا، کە ئێران چۆتە ناویـەوە، هیـوا هەیـە حکوومـەتی ئێرانـی بتـوانی پارێزگاری ئاسایش لە سنووری لای خۆی بکات، ئەگەر ئێمە لەلای خۆمانەوە هەمان شتمان کرد. بەڵام هەتاکو ئەگەر بارەکە بەم شێوەیەك یان شێوەیەکی دیکـە بـڕوات، ئەوا ئەگەری ئەمە لە ئـارادا نییـە عەشـایەرەکانی سـنووری ئێـران، هەڕەشـەیەکی مەترسیدار بۆ سلێمانی دروست بکەن، بەڵام ئەگەر دانیشتوانی سلێمانی بۆ رەحمـەتی خودی حاکمەکانیان لێ بگەڕێن، ئەوا ناوچەکە سەرچاوەی مەترسییەکی بـەردەوام بـۆ سەرکفری و کەرکوك دەبێت و کێشەی سـنوور دەنێتـەوە، کـە پێویسـتی بـە سـوپای زیاترە، لەوەی کە ئێستا پێویستمانە.

کێشەی سنوور دروست نابێـت، تـا ئەوکاتـەی ئێمـە واز لـە کوردسـتان دێـنین. رێگاوبان و هێڵی ئاسن یارمەتی دەرن، تاکو خەڵکەکە خۆیان بە دەستی خۆیان ئـاوڕ لە ئاوەدانکردنەوەو پەرەسەندنی وڵاتەکەیان بدەن، ئەمەمان بینی لە فوراتدا لەماوەی چوار ساڵی رابردوودا، روویدا.

سەبارەت بە رەوشی هێڵە ئاسنیەکە، ئەوا هـەموو شـارەزایانی کاروبارەکـان دانیان بەوەدا ناوە کە هێڵەکە تاکە هێڵی حەساوەیە. تەواوترین لێکۆڵینەوە کـە لەماوەی دووساڵی دواییدا ئەنجام دراون، بەتەواوی پاڵپشتی لەم رایە دەکەن. من لەو باوەڕەدام کە سوودە ئابوورییەکان لە سوودە سەربازییەکانی گـەورەترن. ئـەو هێڵە بەناو ناوچە سەرەکییەکانی کشتوکاڵی گەنم دا تێ دەپـەڕێ، لـە خزمـەتی ناوچەیەکی دەوڵەمەندی دارستان و لەوەڕگادا دەبێت. سەرباری ئەمەش ئەگـەری دۆزینەوەی سامانی کـانزایی، ئەگـەرێکی دڵنیـا نییـە، بـەڵام شـتێکە ناکرێـت پشتگوێ بخرێت.

سەبارەت بە رەواندوز... ئێستا ئێمە لەوێدا، وازیان لێ دێنین، چ دەکەن و نایکەن، ئەمە تەجرەبە دەکەین، بەڵام دەرەنجامە سەرەتاییەکان بۆ ئێمە و بۆ کوردان هاندەر نین. پەشێوییەکانی رەواندوز و ناوەڕاستی کوردستان بە بڕوای من هەمووی بۆ پڕۆپاگەندەکانی تورکیا سەبارەت بە زاڵبوونی ئەرمەن نەوەك ئینگلیز بە سەرکورداندا، دەگەڕێتەوە. ... کۆتایی هات.

## سنوورەکانی باکوور

ئەم بیروڕایانە لەماوەی چەندین مانگدا، لە لەندەن پەسند نەدەکران، ئەوانەی گرنگییان بە کێشەکە دەدا، بە توندی لایەنگری بیرۆکەی (دەبێت سنوورەکانی دەوڵەتی داهاتووی عەرەبی تا بکرێت لەسەر بنەمای ئەتنی نەوەك ئابووری یا جوگرافی بێت.) دەکرد. دوای چەندین پەیوەندی دیکە، بۆ کێشەکە لە سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٢٠ بەم بروسکە گەڕامەوە:

..... زۆر ناچارم کە سەرلەنوێ جەخت لە بیروڕاکانم، سەبارەت بە کێشانی سنووری باکووری عێراق بکەمەوە، هەروەها سەبارەت بەو بەشانەی عێراق کە خەڵکی ناعەرەبی تێدا نیشتەجێن. ئەوەی هانم دەدات، کە ئەمە بکەم، گرنگی گەورەیی بابەتەکە و توندی باوەڕی خۆم:

یەکەم/ سەبارەت بەوەی کە لەنێوان حکوومەتی خاوەن شکۆ و کۆنگرەی ئاشتی دا هەیە، تکایە پێشنیار دەکەم، کە ئێمە ئەگەر بە ئینتیدابکردن بەسەر عێراقەوە رازی بووین، ئەوا پێویست ناکات خۆمان بەشێوەی تایبەتی حکوومەتی ناوچەکانی سلێمانی و هەولێر پابەند بکەین. شێوەی ئەو حکوومەتەی کە دەبێت دیاری بکرێت، بۆ سیاسەتی ناوەخۆیی، کە دەوڵەتی ئینتیدابکار لەژێر رۆشنایی ئەو ئەزموونەی لە وڵاتەکە چنگی کەوتووە، سەیری دەکات.

دووەم/ سەبارەت بەوەی کە لەنێوان ئێمە و تورکیا یان کۆنگرەی ئاشتیدا هەیە، پێشنیاز دەکەم، کە سنووری پێشنیازکراو کە بۆ هەردوو بروسکەکانی

(١٣ی حوزیران) و بروسکەی (١٥ی کانوونی دووەم)ی هەموارکراو بگەڕێنەوە، کە باشترین سنووره، کە دەکرێت بیدۆزینـەوە، هـەروەها ئـەو سـنووره بـەم دواییـە لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکانیش پەسندکرا.

ئەم هێڵە وادەکات، ئەو ڕێگایەی کە بۆ بەشی باکووری ڕۆژئاوای ئێران دەچێت بە دەربەندی کەلەکین بەدەستمانەوە بێـت، ڕەوانـدوز و ئـاکرێ و دهـۆك و زاخـۆ لـەناو سنووری ئێمەدا دەهێڵێتەوە. ئەگەر ئەو شوێنانە لە دەستی کەسانی دیکە دابن، ئەوا دەبنە سەرچاوەی مەترسی بەردەوام بۆ ئێمە.

مانەوەی ئەم ناوچانە لەناو سنووری ئێمەدا، جگە لە هێشتنەوەی هێزێکی سوپا، لە داهاتوودا هیچمان بەسەردا ناسەپێنێ. من باوەڕی تەواوم هەیە، کە لەماوەیـەکی کورتدا، دەتوانین لە ئاکرێ دەستبەرداری هێزی سوپا بین. لە ڕەواندوز هـەرگیز هێـزی سوپامان نییە، بەڵام لەم کاتەدا بەهۆی فاکتەرە لۆکالییەکان باجەکان کۆدەکەینەوە و ئاسایش دەپـارێزین، پێویسـتیمان بـە ئیـدارەی زەوییـە حـەرامکراوەکانی بـاکووری ڕەواندوز نابێت و ڕازیش نابین هیچ بەرپرسیارێتییەکی دیکە لەوێدا وەربگرین، ئەگینا دەکەوێتە دەستی ئەو هۆزانەی کە لەژێر ڕکێفی حکوومەتەکانی دیکـە دان. حـاکمی سیاسی موسڵ و هەولێر کـۆکن لەسـەر ئـەوەی کـە بـۆ ئێمـە زۆر باشـترە سـنووری باکوورمان تاڕادەیەك ئەو هێڵە بێـت، کـە ئێسـتا لـەژێر کـۆنترۆڵی ئیدارەکانمانـدان. سێرجۆرج ماکمۆن بـەو سـنوورەی کـە لەسـەرەوە وەسـفکراوە ڕازی بـووە، هـەروەها سەرکردەی گشتی ئێستاش لەڕووی سەربازییەوە پاڵپشتی لێ دەکرد.

سێیەم/ تکا دەکەم و سوورم لەسەر ئەوەی کە بۆ ئێمـە زۆر سـەلامەتترە، ئەگـەر سلێمانی وەك ئێستا ناوچەیەکی ئیداری لە ناوچەکانی عێراق بێت، ڕێگە بەدەسەڵاتی باڵای مەدەنی ئەو ناوچەیە بدرێت کـە ئـەو دەسـەڵات و دەسـتوورانەی کـە بۆنـەکان دەیخوازێت بەو ناوچانە ببەخشێت.

چـوارەم/ سـەبارەت بـە هـەولێر، ئـەوا سـەرجەم پیـاو مـاقوڵ و سـەرۆکەکانی، لـە کۆبوونەوەیکدا کە لەماوەی مانگی ڕابردوو بەسترا، ئەوەیان ڕوونکردەوە کە بۆ چوونە پـاڵ

عێراق بە پەرۆشن. من وادەبینم کە هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکە، کرداری نابێت. ئـەوە بـۆ من قورس نییە، کە ئارەزووی خەڵك لەمبارەیەوە نیشـان بـدات، بەدەسـت بهێـنم. بـەڵام پیاوە دیارەکانی شارەکە پێشتر لە ساڵی ١٩١٨ رای خۆیـان بەشـێوەیەکی دڵنیـا ئاشـکرا کرد، هەروەها لە ماوەی چەند مانگی رابردووش ئەمەیان کرد... کۆتایی هات.

## کاریگەرییە دەرەکییەکان

هەر لەو سەروبەندە دابوو، کە نووسراوێکم لە مێجەرسۆن، کەتازە بۆ سـلێمانی گەڕابووەوە، وەرگرت. هێشتا بڕگەکانی کە لە نامەکەدا هاتبوون گرنگی زۆری خۆیان مابوو، چونکە پەردە لەسـەر بـیروڕا و هەسـتەکانی کەسـێکی ئیـداری و شـارەزا، لادەبات کە لەو رۆژانەدا کاریکردووە. ئەو باوەڕی خۆی بەم شێوەیە دەربڕی، تا ئەو کاتەی، عێراق هێمن و ئارام بێت، بەبێ هێـزی سـەربازی دەکرێـت پارێزگـاری لـە ئاسایشی باشووری کوردستان بکرێت. بەمەرجێ ڕێگاوبانی هاتووچۆی ئۆتـۆمبێلی تێدا دروست بکرێت. بـەم شـێوەیەی خـوارەوە درێـژە بـە قسـەکانی دەدا:.... بـە تێڕامان لە ئاڕاستەی رای سیاسی لە بەغدا و ئەو سـەرکەوتنانەی کـە بـەم دوایـە بەلشەفیکەکان بەدەستیان هێناوە و دواکەوتنی گرێدانی ئاشتی لەگەڵ تورکیا، لەو باوەڕەدام کە دەبێت ئێمە چاو لە تواناکانی رەوشەکە لە دەرەوە، نەپۆشین. گومـانی تێدا نییە کە درێژی دواکەوتنی بەستنی ئاشتی لەگەڵ تورکیا بە کۆسپێکی بەردەم ئیدارەی مەدەنی دادەنرێت، ئەم مەسـەلەیە مێشـکی کەسـانی گرنگـی باشـووری کوردستانی داگیرکردووە. بەداخەوە ناو و ڕێساکانی بەلشەفێك (بـەهۆی رۆژنامـەی کەرکوکەوە بە پلەی یەکەم) بۆ خەڵکی ئاشنایە.

ئەمانەش تاکە فاکتەری پــەرتکردنی بــیرورِا و مەزنــدەکانی خــەڵکی نــەبوون، ناوەکانی هەریەکە لە (ئەنوەر پاشا)[1] و (حسێن کامل پاشــا) لــەو دەڤەرانــەدا بــە تەواوی ناسراو بوو، زۆرێك لە بەرپرسان وای دەبینن کە هەتاکو ئەرگە ئاشتی لەگەڵ تورکیــاش ببەســترێ و ســنووورە سیاســییەکانی وڵات دیــاری بکرێــت، ئــەوا ئــەو سەرکردانە دەتوانن هێزێکی تەواو بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامی ســەربەخۆ لــە کۆنگرەی ئاشتی بەدەست بێنن، هەروەها لە حکوومەتی مەرکــەزی تورکیــای ژێــر چەپەڵۆکی هاوپەیمانان، هەر دەتوانن دەوڵەتی ئیسلامی پێکبێنن. ئێوە دەزانن، کە سەختترین ئەرکی ئیدارە، بن برِکردنی پرِوپاگندەی هەڵبەســتراوە، وەســتانەوەیە لــە بەرامبەریدا، چونکە سروشتی مرۆڤایەتی، ئامادەباشی زۆری تێدایــە، خــراپترین و ناشرین ترین قسە و قســەڵۆك، هــەتاکو ئەگــەر دژی ســوودەکانی ئێســتاش بێــت، باوەرِي پێ بکات، هەروەها کارە سەخییە بە سوودەکان بۆ سەرچاوەی زۆر شەرِانگێز و گەندەڵ بگەرێنێتەوە.

ئەگەر بتوانین دوو ساڵی دیکە، بەبێ دڵەرِاوکێ و پەشێوی ببەینە سەر، ئــەوا دەتوانین خۆمــان لــە پرِوپاگەنــدەی تورکــەکان و پیــاوانی ئــایینی گونــدەکان و سەرۆکەکانیان بپارێزین، چونکە ئەوکات جووتیار بوونێکی سەربەخۆ لە سەرۆك و ئیسلام بەیەکەوە، پێکهێناوە و تــەنها حــەز لــە درێــژەدان بــەو ســەربەخۆییە و گەشەدان پێی دەدات.

---

١- ئەنوەر پاشا، ئەو سەرۆك وەزیرانە تورکییە بوو، کــە لــە ســەردەمی ئــەودا جــەنگی جیهــانی روویدا، هەروەها سەرۆکی ئیتیحادییەکانیش بوو، کە بەسەر حوکمی دەوڵەتی عوسمــانی زاڵ بــوون. هەر لە سەردەمی ئەودابوو تورکیا چووە ناو شــەرِەوە لەگــەڵ ئــەلمانیا، دوای ئــەوەی لــە شــەرِەکەدا شکستی خوارد بۆ تورکستان رایکرد و دەستی بە پێکهێنانی دەوڵەت لە نەتــەوە تورکــەکانی ئــەوێ کرد، بەڵام لەمیانەی شەرِی بەلشەفیکدا کوژرا.

## هێشتنەوەی کوردستان لە چوارچێوەی عێراق

بەرلەوەی بڕیاری کۆتایی بە خستنی کوردستانی باشوور بـۆ سـەر سـنووری ویلایـەتی موسڵ و عێراق بدرێت، پەیوەندییەکی زۆر ئەنجام درا. جا ئەگەر ئەو بڕیارە لە بەرژەوەنـدی کوردەکان خۆیان دابێت یان لە بەرژەوەندی عێراق دابووبیٚ، ئەوا هێشتا بۆ حوکمی ڕۆژگـار دەمێنێتەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی بابەتەکە، دەکرێت بۆ راپۆرتی ((لیژنـەی کۆمەڵـەی نەتەوەکان)) بڕگەی ((توێژینەوە لە کێشەی سنوری نێوان تورکیا و عێراق)) بگەڕێینەوە[١].

ئەمە و پەیوەندی کوردەکان بە هاوڵاتییانی عـەرەب، لـە هەنـدیٚ رووەوە بـە پەیوەندی ((وێلش)) بە ((ئینگلیز)) لە سەدەی (١٧) دەچێت. بەم بۆنەوە دەتوانین باسی ((یاسای لێکچـوون))[٢] (١٦٦٢، ١٣ ــــ ١٤ شـارلی دووەم) بکـەین، کـە دەڵێت پەرتووکی گشتی نوێژ پێویستە بەڕاستی و دروستی بۆ زمـانی بـەریتانی یان وێلشی وەربگێردرێت. ئەگەر بتوانرێت حکوومەتی عەرەبی رازی بکرێـت بـە پێشـاندانی هاوسـۆزی هاوشـێوە، لەگـەڵ خواسـتی کـورد و ئاشـوورییەکان لـە بەکارهێنانی زمانی تایبەتی خۆیان[٣]، هەروەها بەوە رازی بکرێت کە ئەوانە (کورد و ئاشوری) لەلایەن رەگەزی خۆیان بەگوێرەی پێداویستی داب و نەریتیان، حـوکم بکرێن، ئەوا بوار بۆ هیوای یەکگرتنی کوردستانی باشوور و عێراق هەیـە، ئـەو یەکێتییەی وەك پێشتر تێبینی کرا هەوڵ و ماندووبونێکی زۆری بـۆ کـراوە، پـیٚ دەچیٚ ئەو یەکێتییە ئێستا کەمتر رووبەڕووی لە ناوچوون ببێتەوە. لەسەر ئەمەش ئەو تێبینییانە، کە لە بیرکردنەوەی درێژەوە پەیدابوون، پەیوەنـدی بـەهێزی بـەو قۆناغەی چیرۆکەکەمانەوە، نییە. داهاتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر شـانۆی جەنگەکانی خودی کوردستان، نەوەك لە ژووری کۆبوونەوە ئەوروپییەکان، یـەکلا بۆتــەوە. تورکــە نــەیارەکانمان خــەڵکانی ئــازابوون، لــە دەروونیانــدا ئــەو

---

١- League of nations Document C 400, M147. 195, V11.

2- Uniformity A ct.

٣- بۆ ماددەی ١٧ی یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٩٢٤، بگەڕێوە، نووسەر.

نیشتیمانپەروەرییەی کە بە رووناکی تایبەتی خۆیان دەیان دیت، لە کێشـمەکێش دابوو. سنگیان بەرق و کینەی سەدەکان و بەخت رەشی ئێستایان، گڕگرتوو بـوو. بە چەکێك چەکداربوون، بەهێزتر بوو لە چەکی قەلەم، کەلبـەی ئـەژدیهایان[1] لـە دۆڵەکانی کوردستانی خەنداوی چاند و بەرلەوەی سـاڵ کۆتـایی بێـت، دروێنـەی بەروبوومی خۆیان کرد.

## کوشتنی مستەر پیرسۆن حاکمی زاخۆ

لە حوزیرانی ساڵی ١٩١٩ پیلانگێڕییە بێ کۆتاییەکانی فەرمانبەرە تورکەکان لەو دیوی سنوورەوە، هەروەها لە پشتەوە برەودان بە نیگەرانییەکانی باشووری کوردستان، کاریگەرییان لەو دانیشتوانە کوردانەی کە هاتبوونە ناوچـەکەمان لـە سـەر سـنووری باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی موسڵ، دەکرد.

هاوڕێ لەگەڵ ئەو سیاسەتە گشتییەی کە حکوومەت پەسندی کردبوو (پاراسـتنی داگیرکردنی چالاکانەی سەربازی تەواوی ویلایەتەکە) ئێمـە بـەردەوام لـە رەوشـێکدا بووین، دەمانتوانی ئەم کارە بکەین. سەرکردەی فیرقـەی ١٨ لـە کـانوونی دووەمـی ١٩١٩ بەبێ گەڕانەوە بۆ بارەگای گشتی و وەرگرتنی بڕیار، دوو حامیەی لە دهۆك و زاخۆ دانا و مەفرەزەیەکی بچووکی بەروپێش نارد تا گەیشتە دووری چـوار میـل لـە ئامێدی. لە مانگی ئازاردا، هـۆزی ((گۆیـان)) کـە راسـتەوخۆ لەتـەك هێڵـی شـەڕ راگرتنەکە نیشتەجێ ببوون، بانگی ئەی. سی. پیرسۆن (یاریدەدەری حاکمی سیاسـی) لە زاخۆیان کرد، تاکو سەردانیان بکات و بیانخاتـە نێـو لیسـتی ئـەو هۆزانـەی کـە دەکەونە نێو بازنەی داگیرکردنی سەربازیمان. لەوانەیە ئەو هۆزە دڕندەترین هۆزێك بن، کە ئێمە ناچار بووین مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، ئەو دۆڵەی کە ئەوان تێیدا نیشتەجێ ببوون، زۆر سەخت بوو نە لە باکوورییەوە نە لە باشوورییەوە بتوانرێت بۆی بچێت. لەبەر

---

١- ویلسن بەمە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە تورك هانی کوردیان بۆ شۆڕش کردن داوە.

ئەوەی مستەر پێرسۆن گەنجێکی ئازا و بە وەفا بوو بۆ کارەکەی، توانایەکی بێ سنووری لە زماندا هەبوو، لێهاتوویی خۆی لەو دانووستاندانانەی کە لەگەڵ هۆزە کوردی و ناکوردییەکان ئەنجام دران، پێشاندا. دڵنیا کردنەوەیان (هۆزەکان) لە بەرامبەر نیازەکانمان و رازیکردنیان بەوەی لە بری پێدانی تۆی دانەوێڵە، واز لە تاڵانکردنی دراوسێکانیان بێنن، بە هەنگاوێکی گرنگ لە رێگای ئارامکردنەوەی ناوچەکە بەگشتی دادەنرا. لەبەر ئەوە بە داوەتەکە رازی بوو و بۆی چوو. پەیامنێرێکی کورد و ژمارەیەك پیاوی گۆیان یاوەری پێرسۆنیان کرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ سەرۆکەکانیان لە ماڵی خۆیاندا لەگەڵیان کۆببێتەوە. بەرلەوەی بەشێوێنەکە بگات، لەرێگادا بۆسەی بۆ دانرا، کوژرا[1]. لە پاریس هەواڵەکەم پێگەیشت، ئەمەش یەکەم ئاماژەی باش نەبوونی رەوشەکە بوو، لە ناوچەی سنووری. نە ئەوکاتە و نە لەچەند مانگی دواتریشدا، هەڵسانی دەسەڵاتی سەربازی بە تەمێکردن شتێکی کرداری نەبوو. نەوەك هەر رێگا و بانەکان بە بەفر گیرابوون، بەڵکو فیرقەی ١٨ ئامێری گواستنەوەی هێسترِیان زۆرکەم بوو، بە لەبەر چاو گرتنی دەست پێکردن بە ناردنەوەی

---

١- پیرسون لەم سەردانەیدا یەحیا عبداللە موسلی (بەرێوەبەری دارایی) و سەعید مەحموود خانە (پۆستەچی خەڵکی زاخۆ) و عزت عەبداللە کەرکوکی (موفەوەز) و عیسی محەمەد (رئیس العرفا) و خزمەتکارێکی خەڵکی باشوور لەگەڵ ٣٠ نەفەری نیمچە سەربازی یاوەری بوون. دوای ئەوەی بە چەندین گونددا تێپەرِی و لە هەندێکیان پشووی دا، تا بە (کەور) کە گوندێکی سەر بە (حەسدینۆ)ی سەرۆکی دیاری گۆیانە، گەیشت. گفتوگۆ لە نێوانیاندا روویدا و حەسدینۆی تورِەکرد و حەسدینۆ هەستی کرد کە پیرسۆن دەیەوێت بە پارە و پول هەندێ کاری حکوومی پێ ئەنجام بدات. کاتێ پیرسۆن لە گوندەکەی حەسدینۆ دەرچوو، پازدە (١٥) پیاوی دەست و پێوەندی خۆی دیاریکرد و فەرمانی پێدان کە بە دوای پیرسۆن بچن و لە شوێنێکی گونجاودا بە بێ ئەوەی دەست لە یاوەرانی بدەن، بیکوژن. کە لە گوندی (پیجۆ)ی کلدانییەکان، نزیك بووەوە، یەکێکیان کە ناوی (مستۆ شەهد) بوو، تەقەی لێکرد و کوشتی، دوایی هێرشیان کردە سەر دەست و پێوەندەکان و روتیان کردنەوە و لەوێ بەجێیان هێشتن، بۆ رۆژی دواتر شاندی حاکمی کوژراو بۆ زاخۆ هات و تێیدا نێژرا.

سەربازان، سەخت بوو، فیرقەکە بتوانێ پارێزگاری لە ژمارەی مەفرەزەکانی لە ئاستی پێویستدا بکات.

پێویستە کوشتنی پیرسۆن ئەوەی سەلماندبێ کە هەوڵەکانی حاکمە سیاسییەکان لە مامەڵە کردن لەگەڵ هۆزە کوردییەکان ئەوانەی لە باشووری هێڵی شەڕڕاگرتن دان، بەبێ ئەوەی پاڵپشتییەکی سەربازی تەواوی بۆ ئامادەکرا بێ، کارێکی پڕ مەترسی دەبێت، بەڵام کەس لەم پەندە فێر نەبوو، چاو لەڕووداوەکە پۆشراو[1]، لە بری ئەوە بە رووداوێکی سووك، کە لە شوێنێکی دابڕاو روویداوە، دانرا، بەبێ ئەوەی گرنگی سیاسی هەبێت.

## شۆڕشەکە لە ئامێدی

کۆلۆنێل (لیجمەن) دوای دوو مانگ کاپتن (ویلی) بە حاکمی سیاسی، بە بێ ئەوەی رای من وەربگرێت، دامەزراند. هەروەها کاپتن (ئێچ ماکدۆنالد) و سەربازی توندوتۆلی (ئار ترۆپ)ی لەگەڵدا نارد، تاکو لە کۆکردنەوەی سەربازی لۆکاڵیدا یارمەتی بدات. ئەم پرۆسەیە بە خێراتر لەوەی من دەمویست بەڕێوەچوو. ئەگەر رەوشی هەستیاری لاکانی

---

١- لە راستیدا دەسەڵاتی بەریتانی چاوی لەڕووداوەکە نەپۆشی بەڵکو لە رۆژی ٦ی نیساندا (لیجمن)ی حاکمی سیاسی موسڵ بە فرۆکەیەکی تایبەت کە چوار فرۆکەی دیکە یاوەری بوون، بەرەو زاخۆ دەرچوون. لەوێشەوە پێنج فرۆکەکە بەرەو گوندی گۆیان چوون و گوندەکەیان شەلم کوێرم ناپارێزم بۆ ماوەیك بۆردوومان کرد، بەڵام ئەم رێوشوێنەی لینجمن کاری لە شۆڕشەکە نەکرد، لە چواری ئایاری ١٩١٩ شۆڕشگێڕان بە سەرکردایەتی (نیعمەت شەریف) و (یوسف لاواند) کە سەرۆکی گۆیان بوون، هێرشیان کردە سەر بنکەی (شرانش) و داگیریان کرد، نزیکەی پەنجا سەرباز و ئەفسەرێکی بەغدایی بە ناوی (جاسم جیهاد) لە بنکەکە بوون، دەست بە سەر چەك و ئەسپەکانیاندا گیرا و، ناچار بوون بە پێیان تا زاخۆ برۆن. لە ٥ی ئایاردا گرووپێك لە هۆزی (قشوری) کە هۆزێکی کۆچەرییە، هێرشیان کردە سەر کاروانێکی چەکداری حکوومی، دەستیان بە سەر پارە و چەکەکاندا گرت.

دیکەی کوردستانمان لە بەر چاوبگرین، ئەوا من پێم باش بوو مەفرەزەیەك یەکەمجار لە سلێمانی دابنێم. لەبەرئەوەی هەڵسوکەوتەکە روویدا، لە پەشیمانیدا، جگە لە زیان هیچی دیکەی لێ نەدەکەوتەوە. خۆم بەوە رازیکرد کە هانیان بدەم زیاتر ئاگادار و وشیاری خۆیان بن. وێڵی رویشت، لەوەتەی ١٩١٥ لای ئێمە کاری دەکرد، وێڵی شارەزاییەکی باشی لە (عەلی غەربی) و (بەدرە) و (مەندەلی) و (قەسر شیرین) پەیدا کردبوو، بە ئیرادەوە کاری دەکرد، ژمارەیەکی زۆر پێشینەی دارایی بە کورد و مەسیحییەکان وەك یەك بۆ کڕینی تۆ و مانگای جۆت کردن، خەرج کردبوو. هەروەها سەربازگیری لە هەردوولاکە ئەنجامدا. چەندی لە تواناادا بێت کاری بۆ گێڕانەوەی ئارامی و ئاسایش و متمانە بۆ دەروون کردووە.

هیچ گومانی تێدا نییە، کە کاپتن وێڵی لە کارەکەی سەرکەوتوو دەبوو، ئەگەر بڕیاری پاشەکشەی (مانگی ئایار) مەفرەزەیەك کە سەرکردەی گشتی دەریکردبوو بۆ مەڵبەندێك کە بە ئاسانی دەستی بگاتێ نەبایە. لە کانوونی دووەم نارەزایەتیم لەسەر داگیرکردنی دۆڵی ئامێدی دەربڕی، هەروەها لە ناردنی حاکمێکی سیاسی، بەبێ پاڵپشتی گرووپێك لە سوپا بۆ شارۆچکەکە، نائارام بووم. بۆیە بەکشاندنەوەی لە ناکاوی مەفرەزەکە – بەبێ ئەوەی ئەو کاریگەرییەی کە لەوانەیە لەسەر رەوشی عەشایەری دروستی بکات لەبەرچاو بگرێت – منی نیگەران کرد و شێواندمی، زۆر بەتوندی جەختم لە سەر پێویستی مانەوەی کرد. بە فاکتەری سەربازی وەڵامی جەخت کردنەکەم درایە، بۆیە داوام کرد حاکمە سیاسییەکان پاشەکشە پێبکرێن. لەبەرئەوەی لیمجەن و وێڵی هەر دووکیان دڵنیا بوون لەوەی، کە هیچ دەرەنجامێکی خراپی بە دوادا نایەت، بۆیە بە توندی بەرپەرچی پێشنیازەکەی منیان داوە، بۆیە رێگەم بە خۆم دا وا پیشان بدەم کە رازیم پێی. هێشتنەوەیان لە ئامێدی لەبەرامبەر وەزیری تایبەتمەند خستە ئەستۆی خۆم.

وێڵی وەك لیمجەن متمانـەی بـە دەروون و هێـزی گیـانی هـەبوو، ڕێگـەی نـەدا کشانەوەی مەفرەزەکە کاریگەری لە سەر ڕێـرەوی بەڕێوەچـوونی کارەکـانی ئامێـدی دابنێ. ئامێدی بە هۆی ناکۆکی نێوان دوو لە دیارترین هاولاتییانییەوە[1] لە نێوخۆیـدا دابەشببوو، هەریەکەیان لەلایەن شوێنکەوتوان و لایەنگرانیانـەوە پاڵپشـتی دەکـران. ویلی دەستی بە چەککردنی هەر دوو تیپەکە کرد، گرەنتی دارایی لـەبڕی چـاککردنی ڕەفتاریان لە داهاتوودا، وەرگرت. سەرکردە و ئاغا لۆکالییەکان ترسان، کاتێ بینییان کە ئێمە لە ناوچە داگیرکراوەکاندا، سیاسەتی بڕیاردراوی خۆمان جێ بەجێی دەکەین. پێشینەی تۆ و پارە بە جووتیـاران دەدەیـن، لەڕێگەیەکـەوە، کـە بەدەسـتی ئەوانـدا تێناپەڕێ، سەربازگیریمان ڕاستەوخۆ لـەنێوان دانیشـتوان ئـەنجام دەدا و ئەفسـەرێکی کوردی خاوەن توانامان لە چینی خوێنـدەوار لـە ناوچـە کوردییـەکانی دیکـەمان بـۆ دادەنان. ئەم سەرۆکانە وای دەبینن کە ئیمتیازاتەکانیان کـە خـراپ بـەکاری دێـنن، خەریکە لە ناودەچێت. هەروەها لەوەش گەیشتن، کـە هێنـدەی نـەماوە لـە حاڵـەتی دەربەگایەتی، کە ناکرێت لە کویلایەتی جیابکرێتەوە، ڕزگاریان ببێت. بـەڕای ئـەوان جووتیـاران، گوێڕایـەڵی حکوومـەت نـەوەك بـۆ ئـەوان دەکـەن. سـەرباری ئەمـەش مێشکیان بـەو پڕوپاگەندانـەی کـە تورکـەکان و ئـەوانی دیکـە لـە دەرەوە لـەبارەی زاڵبوونی مەسیحییەکان لە داهاتوو بەسەر کوردان، بەخشیان دەکرد، گـڕی گرتبـوو. کوردەکان جووتیار بن یا کۆچەری ماوەیەکی زۆر درێژە لـە دۆڵـە دوورە دەسـتەکاندا ژیاون،مرۆڤێکی ڕەق و دڕن، لە تاریکیدا دادەنیشن، بە غەمباری و کینـە دەسـت و پێیان بەستراوەتەوە. حکومەت لای سـەرۆکەکانیان، هاومانـای چەوسـاندنەوەو زوڵـم بوو، یاساش هاوواتای ستەم و زۆرداری بوو، نیزامیش هاومانای بەندایەتی دەگەیاند، واتا بەپێچەوانەی ئازادی بە زۆرەملێ، کە لای ئەوان ڕێـز لێگیراوبـوو. ئامرازەکـانی

---

١- ئەوانیش شەعبان ئاغا (سەرۆکی شارەوانی) و حاجی عەبداللطیف ئاغا کوڕی عبـدالعزیز ئاغا بوون.

حوکمڕانی ئێمە بە پیلانگێڕییەك دادەنرا، کە لەسەر شانیان حوکمێکی زۆردارانەی بیانی دژ بە نەریت و ئایین (کە لە ڕۆژانی ئاساییدا ئەوەندە گرنگی پێ نادەن)[1]ە کەیان جێگیر دەکات.

ئاغاکان کۆبوونەوەی نهێنییان لە تاریکایی نەزانی و گیلانەیان ئەنجام دەدا، جگە لە بەکارهێنانی توندوتیژی هیچ ڕێگایەکی باشتریان نەدۆزییەوە. لە شەوی ١٤ی حوزیران هاتنە ناو شارۆچکەکە، بەسەر دیوارە بەرزەکانی ماڵی حاکمی سیاسی کەوتن، ئینجا بەزەبر چوونە ژوورەکان و دیلی و ماکدونالد و تروپیان کوشت، ئەندامانی (شبانە) کە ئەرکی پاساوانییان پێ سپێردرابوو، بەگیانی خۆیان ملکەچی خۆیان نواند، کە هەموویان کوژران.

---

١. پیاوە ماقوڵ و دیارەکانی ئامێدی و بەرواری و بامەڕنێ، پەیوەندیان بە پەرەسەندنەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی لە موسڵەوە هەبوو ـ کۆمەڵەی ئاڵای موسڵی، بەم دواییە بۆ کۆمەڵەی پەیمان گۆڕا، بازنەی پەیوەندی نێوان سەرۆکە کوردەکان و نیشتمان پەروەرانی بەغدا و فورات و بەسرە بوون. ئەو کۆمەڵەیە پەیوەندی لەگەڵ (شێخ بەهادین نەقشبەندی) لە بامەڕنێ هەبوو، ئەم پەیوەندیە وایکردوو لە کوڕانی بنەماڵەکەی بچنە پاڵ کۆمەڵەکە، ئەوانیش (شێخ جەمالەدین و شێخ ڕەئوف) بوون، کۆمەڵەکە هەروەها پەیوەندی بە حاجی ڕەشید بەگ میری بەرواری و شەعبان ئاغا سەرۆکی شارەوانی ئامێدی و محمد صالح ئەفەندی (مزوری)و تاهیر ئاغا هەمزانی سەرۆکی عەشیرەتی دۆسکی و مستەفا ئاغا هەمزانی (عەشیرەتی هەبی) و محمد حاجی ئاغا شەرەفان، هەروەها کۆمەڵەکە پەیوەندی بە ((گۆیان)) کرد. دەرەنجامی ئەو پەیوەندیانە، ئەوە بوو کە کوردان لە ١٩٢٤/٣/٢٤ لە یاداشتێکدا کە ئاڕاستەی کۆنگرەی ئاشتی و کۆمەڵەی نەتەوەکانیان کرد، داوای سەربەخۆیی عیراقیان کردوو داوایان کرد ئیدارەی عیراق ڕادەستی مەلیك حسین بکرێت و ئەمیر فەیسەڵ و مەولود موخلیس و عەلی جودت لە بری ئەوان ڕێگەیان پێ بدرێت لە بارەیەوە قسە بکەن. ٣٢ سەرۆك و موختاری کوردی ئەوێ لەسەر یاداشتە واژوویان کرد، لەسەروی هەموویان شێخ بەهادین نەقشبەندی و ئەحمەد خیرەدین مەلا ئیسحاقی زانای ئاینی ئامێدی و حاجی شەعبان ئاغا سەرۆکی شارەوانی و ڕەشید بەگ ئەمیری بەرواری بوون.

## بزووتنەوە سەربازییە تەمبێکارییەکان

لەوانەبوو لەم بۆنەیەدا فیرقەی ١٨ بە توندی لێ بدرێت. لە هەولێکدا، لەکاتی چونە ناو ئامێدی ئەنجامدرا، بەرگرییەکی توند روویدا. هەر زوو دەرکەوت کە ژمارەیەك هۆز لە بزووتنەوەکە گلابوون. لیوایەکی فیرقەی ١٨ بە سەرۆکایەتی ژنەڕاڵ نایتینیگیل لە بنکەی پێشەوە لە سوارەتوکە، کە ٢٥ میل لە ئامێدی دوورە، کۆبووەوە. بەر لە ٣ مانگ سوپا بۆ ئەوێ پاشەکشەی کردبوو. لیوایەکی دیکە بە سەرکردایەتی ژنەڕاڵ ولریج بۆ زاخۆ نێردرا. دوای ماوەیەکی کەم جۆرج ماکمۆن رێنماییەکانی بە ژەنەڕاڵ کاسلز دا، کە ئێستا بەرپرسیارێتی چالاکییەکانی لە ئەستۆ گرتووە، بە داگیرکردنی درێژی و پانی ولاتەکە بە تەواوەتی، ئەمەش لەبەرئەوەی تاکە ئامرازە بۆ تەمبێکردنی بکوژەکان و گەڕانەوەی دەسەلاتمان بە تەواوی. لەبەرئەوەی دەبوو، بەشێك لە سوپا لە بەغداوە بهێنرێت، کۆکردنەوەی هێزەکە پێویستی بە هەفتەیەك هەبوو. هەروەها لەبەرئەوەی لەبەرەی سلێمانیدا بزووتنەوە سەربازییەکان هێشتا گەرموگوڕ بوون، تا مانگی تەمووز نەتوانرا ئامادەباشی بۆ هەموو شتێ بکرێت. لەسەرەتای ئابدا ژەنەڕاڵ نایتینگیل گوندی ((برنورنی)) گەمارۆدا، دەستی بەسەر ژمارەیەکی زۆر چەك دا گرت و هەندێ یاخی دیاری دەستگیرکرد. دوای ئەم بزووتنەوەیە پڕۆسەی تەمبێکردنی هەموو دۆلەکانی ئەو ناوە ئەنجامدرا، کە تێیدا شەڕێکی توند روویدا، زیانێکی زۆر بە کورد گەیشت. دواتر ئەو ئاغایانەی کە پەیوەندییان بە کوشتنی حاکمە سیاسییەکانەوە هەبوو، حوکمدران و دواتر لە سێدارەدران. لەوکاتەدا رەتلێك بە بەرزاییەکانی ئامێدیدا (هەشت هەزار پێ لە دەریاوە بەرزە) جولا بۆ ئەوەی بەسەر گوند و ناوچەکانی بەرواری دا بدەن، سزا و زیانی بەو هۆزە گەیاند، کە بزووتنەوەی سەرەکی شۆڕشەکە بوون. لە میانەی بەرەو پێشچوونی ئەم بزووتنە سەربازییانە، جارجارە تووشی شکستی سووك دەبوونەوە، کۆمەلێك لەو هۆزانەی لە رۆژئاوای رووباری خاپوردان،

لە گوندی (سوارە) بە گورزێکی بەهێزەوە لەبەرە بەیانیدا لە هێزەکەیانـدا. دەسـت بەسەر ئەو بەرزاییەدا گیرا کە بەسەر سەربازگەکەماندا زاڵ بوو. بەڵام سەبازەکانمان کە بەم بزووتنەوەیە سەریان سوورِما، رەفتارێکی نایابیان سەرباری ئەوزیانە زۆرانەی دایان، نواند. دووبارە دەستیان بەسەر گردەکەدا گرت و دوژمنیان دەرپەڕاند. چـەك و جبەخانەی زۆری تورکی[1]، ئاماژەی ئەوەبوون، کە دەسەڵاتدارانی تورکی لەو دیوی سنوور عەشایەرەکان بۆ شۆڕش هان دەدەن. ئینجا نۆرەی بزووتنەوە سەربازییەکانی ١٨ی ئاب هات[2]. کاتێ ژەنەڕاڵ ولریج لە دژی هۆزی ((گلی)) بەرەو پێشچوو، کـە سەرکردایەتی هێرشێکی بۆ سەر (سوارە) دەکرد، لەهەمان کاتدا ژەنەڕاڵ نایتینگیل سەرلەنوێ بەرەو ئەو دۆڵە چوو، کە سەخت بوو لە دواوەی بەرزاییەکانی ئامێدییەوە بۆی بچیت. ئەو دەڤەرانە لە چڕی و پڕی و دارەکانی لە دارستانەکانی دەڤـەرەکانی باکووری رۆژئاوای سنووری هیندی دەچێت. ئەو جەنگەی لەوێ روویدا، لـەو جـۆرە جەنگانە بوو کە سوپای هیندی دەمێك بوو پێـی ئاشـنا بـوو، بـەڵام بـۆ سـەرجەم

١- بوونی چەکی تورکی مانای ئەوە ناگەیەنێ کە تورکیا ئەمانەی هاندابێ، چونکە تاکـە چـەکێك کە ئەوکات خەڵکی بیانتوانییبا بە دەستی بهێنن چەکی تورکی بوو، لەبەرئەوەی ناوچەکە لە تورکیـا نزیکە و تورکەکان تا جەنگەکە کۆتایی هات حاکمی ئەو وڵاتە بوون.

٢- ئەو شەڕانەی کە لە زاخۆ و ئامێدی و مزورکە روویاندا و ئەو دەست درێژیانەی کە لە بامـەڕنی روویدا، کاریگەری زۆری لەسەر شێخ بەهادین نەقشبەندی و براکانی لە هۆزەکان دانـا. دوای ئەمـە چەند هۆزێکی سندی بە سەرۆکایەتی جەمیل ئاغا، عەبدی ئاغا و براکەی صـالح ئاغـا، شۆڕشـیان جاڕدا. هەروەها دوو سـەرۆکی عەشـیرەتەکانی گلـی (سـادق بـرۆ و سـلێمان ئاغـا قـەتێ) لەگـەڵ سەرۆکێکی دۆسکی بەناوی (تاهیر ئاغا هەمزانی) رێککەوتن لەسـەر ئـەوەی هێـرش بکەنـە سـەر مۆڵگەکانی ئینگلیز لە سوارە توکا، ئەمەش بـەهاوکاری (خەسـدینو)ی گۆیـانی. لـە ٢٢ی ئـاب، هێرشەکە ئەنجامدرا تا دوای رۆژئاوا بـوون درێـژەی کێشـا. ئینگلیزەکـان نزیکـەی ١٠٠ کـوژراو و ٢٠٠بریندایان دا، کە (خەسدینو)ی شێخی گۆیان و ١٠ لە دەست و پێوەندەکانی تێدابوو.

ئەوانەی تازە هاتبوونە ناو سوپاوە شتێکی تەواو نوێ بوو. ئەم جۆرە شەڕانە پێویستی زۆریان بە گیانبازی تاکەکانی یەکە سەربازییەکانی هەیە. یەکەم بزووتنەوە (پیرنونا)ی کردە ئامانج، پیرنونا بە چیای زۆر کوور دەورە دراوە، کە هێزێکی گەورەی کوردی لە سەر قوللەیەکی سروشتیدا خۆیان قایم کردبوو. ئەمە سەربازانمانی ناچار کرد بە دەروازە و تەنگەبەرە یەك بەدوای یەکەکاندا گوزەر بکەن، کە زۆربەیان بۆ ئەوە دەگونجا تیرهاوێژانی لێهاتوو تێدا بەرگری بکەن. بۆیە ئەمە سەلمێندرا، کە ناشێت عەشایەرەکانی ئەوێ بەبێ پاڵپشتی زیاتر تەمبێی بکرێن. ئەمەش دەکرا لە ماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا، دەستەبەر بکرێت. هێزی ژەنەڕاڵ نایتنگیل لە بەرزایی ئامێدی هێنرایە خوارێ، بۆ ئەوەی پەیوەندی بە لیواکەی ولریجەوە بکات، لە بەغداشەوە فەوجێکی ئاشووری هێنرا، کە هەر هەموویان ئاشووری چیایی نەسرانی بوون، بە سەرکردایەتی ئەفسەرانی بەریتانی و ئاشووری. ژەنەڕاڵ ماکمون دەڵێت، ئەوانە ((سەلماندیان کە بە نرخترین یارمەتی و پاڵپشتین کە بۆ سەر هێزەکانمان زیاد کراوە، هەروەها لەبەرئەوەی لە تاکتیکی تایبەتی لە چیادا، خۆیان لە قەرەی کوردەکان دەدەن)). چەندی هەفتەی رابردووش، بزووتنەوە سەربازییەکان کاتی خۆیان لە تەمبێی کردنی ئەو هۆزانە بەسەر برد، کە لە دۆلەکانی سەر بە ئامێدی نیشتەجێ بوون. تا گەیشتە ١٥ی ئەیلول سەرجەم هۆزەکان جگە لە ژمارەیەکی کەمیان نەبێ بۆ حکوومەت ملکەچ کران. هەرچی لە رۆژئاوای خاپور بوو، ژەنەڕاڵ ولریج ماوەیەکی درێژتری بۆ یەکلاکردنەوەی ئەنجامەکە خایاند. لە ناوەڕاستی ئەیلول خەریك بوو پاشەکشە بکات، بەو بڕوایەی کە کارەکانی کۆتایی پێ هاتووە و جێبەجێکراوە، بەڵام کۆمەڵێ لە عەشیرەتی گۆیان لە تەك ئەو ناوچەیەی کە ئەو تێیدا سوپاکەی خستبوو، دەرکەوتن. زنجیرەیەك هێرشی نەبەردانەی کرد، هەر زوو دەرکەوت کە بۆ دووبارە نەبوونەی پەشێوی، لە ئەنجامدانی تەمبێکاری ئەو دۆڵانەی کە عەشیرەتەکەی تێدا نیشتەجێ یە، پێویستی

به شتی زیاتر نییه. فەزلی ئەمەش بۆ بڕیارەکەی ماکمۆن سەبارەت بە درێژەدان بە چالاکییە سەربازییەکان، دەگەڕێتەوە.

دوو ڕەتل بە سەرکردایەتی ژەنەڕاڵ نایتنیگیل کۆکرانەوە، تاکو دەروازە و ڕێچکە تەنگە بەرەکان بکاتەوە. دوای پێکدادانێکی توند، کە لەسەر لوتکەی (باڵا کێش) ڕوویدا، سوپا هاتە ناو (کرور)ەوە. کرور، گوندێکە لە جەرگەی وڵاتی گۆیان، بەشێك لەو گوندە لە تۆڵەی کوشتنی سێر پێرسۆن سووتێنرا. بەم شێوەیە کۆتایی بەو هەڵمەتە هات، کە سێ مانگ درێژەی کێشا. پێ دەچێت سێر ماکمۆن لە هەڵمەتەکەدا سەربازانی هیلاك کردبێ، لە کاتێکدا هات، کاتی حەوانەوە بوو، ئەم ماندووکردنەی سەربازان شایەنی ڕێز و ستایش بوو. چیاکان زۆر کوورِ بوون و بە ئەستێرە و دەستەدار داپۆشرابوون، ڕۆژانە پێویستی بە بەسەرکەوتن و هاتنە خوارەوەی نزیکەی ٣ هەزار پێ بوو.

ئەگەر چارەنووس وابوایە، ئەو چالاکی و پاڵەوانێتییە، بەر لە شەڕ ڕاگرتنەکە ڕوویاندابا، سەربازی نوێ بە پلەی یەکەم پێی هەڵساban، هەرتەنها ڕۆژنامەی هاوچەرخی سەرقاڵ نەدەکرد، بەڵکو بێ گومان بەختی ئەوەشی دەبوو، کە بەدرێژی لە مێژووی فەرمی هەڵمەتەکانی نێوان دوو ڕووبارەکەش بنووسرێتەوە. لە ڕاستیدا ئەمە بەشیك لە بەشەکانی ئەو هەڵمەتانە بوو.

چوونە ناو شوێنە دوورە پەڕێز و نەزانراوەکانی کوردستان و تێپەڕین بەنێو هۆزە دڕندە چەکدارەکان، ئەو هۆزانەی هەرگیز شکستیان نەناسیووە، ئەمە لە جەسارەتی سەربازێکی لێهاتوو و شارەزا بەشەڕی شاخاوی زیاتر بوو. ئەو چالاکییە سەربازییانە لەسەر دەستی چەند یەکەیەك، کە زۆربەی کات لە سەربازانی بێ ئەزموون پێکهاتبوو، لەپاڵ ژمارەیەکی کەم لە سەربازی کۆن، لەوانەی کە لەماوەی چوار ساڵی جەنگەکە لە دەشت یا سەنگەردا جەنگاون، گەیشتە سەرکەوتن. ئەمە بڕوانامەیەکی سەرسوڕهێنەر هەڵدەگرێت، ئاماژە بە نەبەردی هێزەکانی ژەنەڕاڵ کاسل و سەرکرایەتی لیواکان و سەرکردەی یەکەکان، دەدات.

ژمــارەی زیانــەکان لەمیانــەی چــالاکییەکانی ئێســتای کوردســتان ســەرجەمیان گەیشتە ٣٣١ بەرکەوتوو، کە ١٣٧ یان کوژراون، کــە هــەموویان ســەربازی هینــدی بوون، جگە لە ٣٧ یان کە سەربازی ئینگلیزی بوون. ئەمانە قورسایی شەڕەکەیان لــە ئەستۆدا بوو، بەپلەی یەکەمیش فەزل بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە.

## شۆڕشی زێبارییەکان و ئاکرێ

ساڵەکە بەبێ ئەوەی حکوومەتی مەدەنی زیانێکی زۆری دیکەی گیانی نــەدا کۆتایی نەهات. دوای شەڕ راگرتنەکە بە ماوەیەکی کەم، حاکمێکی سیاســی لــە ئاکرێ دامەزرابوو، (ئاکرێ، کە کەوتۆتە بــاکووری رۆژهــەڵاتی موســڵ، لەســەر لێواری دەشتی موسڵ، لە ناوەڕاستی رێگای نێــوان ئامێــدی و رەوانــدوز). ئــەو چیایەی کە ئاکرێ لە زێی گەورە دادەبڕێنێ، بە نیشتیمانی کــوردە زێبارییــەکان دادەنرێت، بەڵام ئەو خاکانەی کە کەوتوونەتە ئەو بەری ڕووبارەکە بە مەنزڵگــەی شــێخی بــارزان دادەنرێــت. ناوچــەی بــارزان مێــژوێکی گــەردەلول ئــامێزی لــە سەردەمی تورکاندا هەیە. شــێخ عەبدالســلام بــارزانی لەســەر دەســتی پیــاوانی حکوومەتی عوسمانی ئازاری چەشتووە، لە ساڵی ١٩٠٩ تورکــەکان هەڵمــەتێکی سەربازییان کردە سەر شێخ عەبدالسلام جگە لــە ســەرکەوتنێکی مــام ناوەنــدی، هیچی دیکەی نەپێکا.

لە ساڵی ١٩١٠کاروباری هەرسێ ویلایەتە باڵاکە (بەغدا، موســڵ، بەســرە) بــە نازم پاشا سپێردرا، کێشەکان بە پەلە و ئاشتییانە لەگەڵیدا یەکلایی کراوە. بەڵام نازم پاشــا لــە ســاڵی ١٩١١ بــەخۆی و ئــەو رێوشــوێنانەی لەمبارەیــەوە گرتبوویەبــەر سەرکەوتن. لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگەکە، شێخی بارزان بۆ بەرگری کردن لــەخۆی ناچاربوو، ئەوەی کە زۆرجــار روســەکان لــە پێشــیان دادەنــا پێــی ڕازی بێــت، داوای پارێزگاری لەوان (روسەکان) کرد.

ناکۆکییەکی توند لە نێوان بارزان و ئاغـا زێبارییەکانـدا هـەبوو، فـارس ئاغـای زێباری بە مەبەستی دەست درێژی کردەنە سەر نەریتە باوەکانیـان و بەیارمـەتی ئـەو توانییان شێخی بارزانی بخەنە داوەوە و لە سێدارەدرا.

شێخ ئەحمەد بارزانی جێنشینی شێخ عەبدالسلام بارزانی، ئـەو ناکۆکییانـەی بـە میرات وەرگرت، بەڵام زیرەکی و بیر قوڵی ئـەوی، بـە مـیرات بـۆ نەمایـەوە. کـاتێ ئیدارەی بەریتانی لە ناوچەکە دامەزرا، بە توندی بێزاری خۆی لە دانـانی ئـەو لـەژێر ئەو ئیدارەیەی کە لە ئاکرێ هەبوو، دەربڕی، ئیدارەکەی بە ئیدارەیەکی بۆیـەکراو بـە دەسەڵاتی زێباری دادەنا. لە رۆژێك لە رۆژان بەپەرۆش بوو، بۆ ئـەوەی بـۆ رەوانـدوز بگوازێتەوە، بەڵام پرۆژەکە لای ئێمەوە هاننەدرا. فارس ئاغا لە پەرینەوە لەزێ بۆ ئەو بەری ناوچەی بارزان، قەدەغە کرابوو. هەوڵی پاراستنی هاوسەنگی لـەنێوان هـەردوو لایەنەکە دژبە خواستی هەردووکیان بوو، ئەمەش وایکـرد بـوارێکی فـراوان بـۆ ئـەو پرۆپاگەندە ژەهراوییانەی تورکیا، کە حاکمی پێشووی وان (حەیدەر بەگ) بە زیرەکـی و لێهاتووییەوە بەڕێوەی دەربرد، بێتەکایەوە. لە زستانی ١٩١٨، هەواڵ سەبارەت بـە گەیشتنی (ئەنوەر پاشا) لەگەڵ پاڵپشـتییەك، کـە لـە تـورك و روسـە هـەڵاتووەکان پێکهاتووە، بۆ وان بڵاو بووەوە.

حەیدەر بەگ لەڕێگەی هەواڵگری و بەمیانگیری تـورکی، پەیوەندییـەکی تونـدی لەگەڵ سیتو ئاغا لە (ئەورامار)ی باکووری ئامێدی و لەگەڵ بەرواریيەکان و سـەرجەم سەرکردە تورەکاندا هەبوو. پێ دەچوو ململانێی نێوان فارس ئاغای زێباری و ئەحمـەد بارزانی بەشێوەیەکی کاتی یەکلا کرابێتەوە. بەکرێگراوانی سوریش لە هەمان کاتدا بە بڵاوکردنەوەی ئەو یاسا و رێسایانە سەرقاڵ بوون، کە ئاغاکان گوێیان بۆ شل کردبوو. چونکە ئەو یاسا و رێسایانە مژدەی پرۆژەی حوکمێکی ئیسـلامی دووری ناچـالاکیان دەدات، کە دەسەڵاتێکی راستەقینەی بە ئاغاکان دەبەخشێ. جووتیارە عەشایەرەکان، بۆ ملکەچی تەواوی سەرۆکەکانیان دەبوو بـە ناچـاری بمێننـەوە، پـێ دەچـوو ئـەوان (جووتیارەکان) بەهەمان چاویلکە سەیری بابەتەکە نەکەن.

کاتێ، لە تشرینی یەکەمی ١٩١٩ مستەر جی ئیچ بیل (ئەفسەری سیاسی لە هیند، شارەزاییەکی زۆری لە سنوورەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران هەبوو) کاروباری ناوچەی موسڵی لە کۆلونێل لیچمەن وەرگرت ڕەوشەکە بەم شێوەیە بوو. منیش دەمێك بوو هەستم بەوە دەکرد، کە تازە گۆڕین شتێکی پێویست نییە. لیچمەن لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ عەرەبەکان، بەتایبەتی هۆزە کۆچەرییەکان، لێهاتووییەکی وای هەبوو کە نەوەك هەر لە عێراق، بەڵکو لە تەواوی وڵاتە عەرەبییەکاندا، هیچ ئەفسەرێکی بەریتانی ئەو توانایەی نەبوو. لەسەر ئەمەش لەگەڵ کورداندا لە باشترین حاڵدا نەبوو، هەروەها مێجەر سۆنیش هەرگیز لەگەڵ نەوەکانی ئیسماعیل دا لە باشترین حاڵدا نەبووە. هەریەکەیان ڕقی ڕەگەزپەرستی ئەو خەڵکانەی کە لە هەموو کەسی دیکە باشتریان دەناسین، خواردۆتەوە. نیازم نەبووە لەمپەر لەبەردەم گیانی دەستپێشخەری کارمەندانی گۆڕەپانی کارکردن، دروست بکەم، بەڵام بەرپرسیارێتییەکی قورسم لە بەرامبەر حکوومەتی خاوەن شکۆ و سەرکردەی گشتی لە ئەستۆدا بووە، کورت بینی دەروونی کوردەکان نیگەرانی دەکردم، ئەمەش لەو ڕەوشەی کە پێرسۆن و ویلی و ماکدونالدی تێدا کوژران بە دەرکەوت. لەبەرئەوەی من ئەو سێ ئەفسەرەم زۆر باش دەناسی، مردنیان زۆر ئازاری دام.

سوپاسێکی تایبەتی حکوومەتی هیندم لەسەر دانانی ترفور لە شوێنی مستەر بیل لە بوشەهر کرد، کاتێ خزمەتەکانی مستەر بیلی خستە ژێر هەڵسوکەوتی ئیدارەی مەدەنی. بیل یەکێك بوو لە برادەرە کۆنەکانم، بە متمانەوە سەیری داهاتوویم دەکرد و هیوام دەخواست کاتێ ڕەوشەکە باشتر بێت، لەبەر ئەوەی ئەو لە وەرگرتنی پۆستەکەیدا نوێ بوو، بۆیە ویستی بەخۆی ڕەوشەکە بناسێ و بیرۆکەیەك لە بارەی کێشەی کوردەوە پێکبهێنێ.

لە کۆتایی تشرینی یەکەم بە هاورێیەتی کاپتن (کی. ئار. سکۆت) سەردانی ئاکرێی کرد، سزای دارایی بەسەر دوو لە ئاغاکانی زێباری (فارس ئاغا و بابەکر

ئاغا) سەپاند، چونکە پیاوەکانیان سێرەیان لە پیـاوانی نیمچـە سـەربازی ئێمـە دەگـرت، لەیـەکی تشـرینی دووەم بـۆ ئـەوەی (شـبانە)ی یـەکێك لـە سـەرۆکە لۆکالییـەکان بەسـەر بکاتـەوە، لـەزێ پەڕییـەوە. دوو ئاغـا زێبارییەکـە، کـە غەرامەکردنەکە و پێویستی ملکەچکردن بۆ نیزام شێتی کردبوون، پەیوەندییان بە شێخ ئەحمەد بارزانییەوە کـرد، ئـەویش براکـەی و ٢٠ بیسـت پیـاوی خـۆی بـۆ یارمەتییان نارد، ئەمانە لەگەڵ فارس ئاغا و بابەکر ئاغا و پیاوانیان سەرجەمیان ژمارەیان دەگەیشتە ١٠٠ پیاو. لە نزیك گوندی (پیراکەپرا) کـە گونـدی بابـەکر ئاغایە، بۆسەیەکیان بۆ مستەر بیل و کاپتن سکوت دانا و کوشتیانن. چوار پیاو پاسەوانی هەردووکیان دەکرد، دوویان کە یەکێکیان ئاشووری و ئـەوەی دیکـەیان خەڵکی ئاکرێ بوو لەمیانەی بەرگریکردن لـە ئەفسـەرەکانیان کـوژران. هەرچـی دوانەکەی دیکە بوون، لەبەر ئەوەی زێباری بوون پەیوەندییان بە دوژمنەوە کـرد. هەموو ئاماژەکان ئـەوە دەسـەلمێنن کـە کوشـتنی دوو ئەفسـەرەکە، بـەگوێرەی پلانێکی پێشوەختە ساز نـەکراوە، بـەڵکو دوا بـەدوای ئـەو نۆبەتـە تورەیـە لـە ناکاوەوە هاتووە، کە میزاجی کوردی پێ دەناسرێتەوە. بـەڵام هەرکـە پرۆسـەکە تەواو بوو، وەك ئامـاژە بـە شۆرشـێکی گـەورە لـە ئـارادابێ وابـوو، زێبـاری و بارزانییەکان هێرشیان کردە سەر ئاکرێ، ئەفسەرانی (درك) بەزەحمەتیەکی زۆرەوە خۆیان گەیاندە موسڵ، دوای یەك دوو رۆژ هۆزەکان لەسەر دەستکەوتەکان کەوتنە کێشمەکێشەوە، بارزانییەکان بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە.

ژمارەیەك هـۆز دیارییـان وەك پیشـاندانی یارمـەتی و جەختکردنـەوە لەسـەر دۆستایەتی بۆ ئێمە نارد. کاتێ کاپتن (کیرك) یاریدەدەری حاکمی سیاسی باتاس لە ٩ی تشرینی دووم رێگای بەرەو ئاکرێ گرتەبەر، تەنها (شـبانە)ی کـوردی لەگەڵـدا بوو، بینی خەڵکی ئـاکرێ داوای گەڕانـەوەی ئیـدارەی بـەریتانی دەکـەن. دەسـت بەجێ سێر جۆرج ماکمون هەڵمەتێکی تەمبێکردنی لـەوێ دەسـت پێکـرد، کـاتێ

گەیشتە دۆڵی ڕووبارەکە زۆربەی گوندەکان ئاڵای سپیان هەڵکردبوو، پێ دەچوو ترسێکی ڕاستەقینەیان لە ئاغاکانیان هەبێت و خۆشحاڵ بوون بە پاراستنیان لە شەڕی ئاغاکان.

سەربازانمان خانووەکانی سەرۆکە زێبارییەکانیان سووتاند. دواتر لە زێ پەڕینەوە و هەمان سزایان بە بارزان گەیاند، بەڵام لەوەتەی هەڵمەتی ئامێدی کراوە، نەدەبوو گوندییەکان ئازار بدەن. شۆڕشگێڕان لە توانایاندا نەبوو هۆزەکانی دەوروبەریان بورژێنن، هۆکاری ئەمەش بەزۆری بۆ لایەنگری (عەبدالقادر ئاغا شوشی) سەرۆکێکی نزیك لە ئاکرێ، بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە. بۆیە لەکاتی بەرەوپێشچوونەکانمان بۆ ئەوەی هیچ بەرگرییەك ڕووی نەدا، چوار تاوانبارەکە (فارس و بابەکری زێباری و شێخ ئەحمەد بارزانی و براکەی) بۆ چیا رایان کرد.

پەشێوی پشتگیریکردن لە ئامێدی ڕووی نەدا، هەروەها سەید تەها شەمدینانی ئامادە نەبوو گوێ لە پێشنیازەکەی قائیمقامی نیری بگرێت، کە تورکان حامیەیەکی بچووکیان بە هاوکاری (سیتو) لە ئەورامارى لە بەرژەوەندی زێبارییەکان هێشتبووەوە، ئەم هەڵوێستە وای لە قائیمقام کرد لە سەلامەتی خۆی دڵنیا نەبێت و نیری بەجێهێشت و بۆ (پاش قەلا) چوو. کاتێ بزووتنەوەکان کۆتایی هات، بریاردرا سنوور تا ئاکرێ بێت و بە شێوەیەکی کاتی واز لەو وڵاتەی زێباری کە کەوتۆتە نێوان ئاکرێ و ڕووبارەکە بهێنرێت.

## کوردستان لە کۆتایی ١٩١٩

بەم شێوەیە، لە کۆتایی ساڵەکە، ئێمە حوکمی سنووری چیاییەکانی کوردستانمان نەدەکرد، سەنتەری هێزە بەریتانییەکان لە ڕەواندوز بۆ باتاس (کەوتۆتە نزیکەی ١٨ میل لە باشووری ڕۆژئاوای ڕەواندوز). گواسترا بووەوە. لەوێشەوە هێڵەکە بۆ ئاکرێ و دهۆك جگە لە چەند چیایەکی دەوروبەری زێی گەورە نەبێت، درێژ دەبووەوە، ئەو هێڵە بە ئامێدی و زێباردا نەدەڕۆیشت ئەمانە کەوتبوونە دەرەوەی ناوچەکانمان. گەیشتنمان

بەویّ لە سەرەتادا مایەی خۆشحالّی بوو، چونکە ئیّمە ئەو ئامرازانەمان ئامادە کرد، کە بەهۆیــەوە ویّرانــی و برســیّتی، کــە تورکــان بــەجیّیان هیّشــتبوو، لــەناو دەبــرد. یارمەتییەکانمان بەبیّ لایەنگری بەسەر موسولّمان و مەســیحییەکان دابــەش دەکــرد، لەوانە یارمەتییەکانمان ئەو خەلّکەی لەویّ بە کشتوکالّەوە خەریك بوو، رزگــار کــرد. بەلاّم نیازەکان بۆ دووبارە نیشــتەجیّکردنەوەی ئــاوارە مەســیحییەکان، ئەوانــەی کــە هەولّیاندا پاریّزگاری ئیّمە دەستخەن، ناشارینەوە، ئەوانە زۆریان بۆ ئیّمە دیّنا تاکو بۆ شــویّنی خۆیــان بگەڕیّنــەوە، ئــەم هەولّــە دادوەرییــەمان، ماددەیــەکی پیّویســتی پرۆپاگەندەی لــە دژی ئیّمــە ئامــادەکرد، هــەر لــە ســەرەتاوە نــەدەکرا خۆمــان لــەو دوژمنکارییەی کە ئاغاکان دەیانورژاند بپاریّزین.

کۆلونیّل (نولــدر) ســەبارەت بــە شۆڕشــی زیّبارییــەکان لــە لیّدوانیّکــدا دەلّیّــت: ((حالّــەتی ئاغــای ئاســایی کــوردی، لەگــەلّ حالّــەتی حکوومەتەکــەمان یــان هــەر حکوومەتیّکی دیکە ناگونجیّ، ئاغای کوردی وەك بــارۆنی دەرەبەگایــەتی ســەدەکانی ناوەڕاست وایە، دەست و پیّوەندیّکی چەکداری هەیــە، بــە گــویّرەی ئــارەزووی خــۆی جووتیاران دەچەوسیّنیّتەوە. ئەو زەوییەی کە فارس ئاغا و براکــەی هەیانــە، ســالاّنە داهاتیّکی یەکسان بە (٥٠٠) پاوەندی بۆیان دەست ناخات، سامانەکەیان بــە گشــتی پشت بە چەوساندنەوەی گوندییەکان دەبەستیّ، دەسەلاّتیشیان لە ریّگەی ئەو پارەی بە دەستی دەخەن و ئەو تاخمە چەکدارەی هەیانە پەیدا دەکەن. کەسانیّکی لەم جۆرە جگە لە نیگەرانی ناتوانن بە هیچ شیّوەیەکی دیکــە ســەیری حکوومــەتی جــیگیر بکــەن. سەرباری ئەمانەش زولّمی هەستکردن بە دوژمنداریکردنی مەسیحییەکان و پڕوپاگەندە فراوانەکانی تورکیا، بەمانە دەکریّت ئەو هەستەی ئیّســتا لــە کوردســتانی بــاکووردا باوە، بە تەواوی راڤەیکەین.. کۆتایی هات.

بارۆنە کوردەکان ئیّستا دەستیان بەسەر ئیدارەی مەدەنی داگرتووە، پەشــیّوی لــە دریّژای کوردستانی ناوەڕاست لە ئارادایە، هەرچی لە کوردستانی باشوورە، ئەوا شــیّخ مەحموود بەزەبری چەك، لابراوە، شیّخ مەحموود هەر دوو رۆلّی بارۆن و پیاویّکی ئایین

یاخی دەگیرا، ئاشتی لە تەواوی ساڵی ١٩٢٠ باڵی خۆی کێشابوو، هەروەها هەولێر و کۆیەش لە ژێر ئاشتیدا بوون.

مستەر دەبلیۆ ئار هی، کە لە تشرینی دووەم ١٩١٨ لە مەندەلییەوە بۆ کۆیە و هەولێر گواسترا بووەوە، هەروەك پێشتر روونمان کردەوە، ناچار کرا رەواندۆز بە شێوەیەکی کاتی بۆ کوردەکان جێبهێڵێت. ئەزموونەکانی لە کۆیە و هەولێر لە کتێبەکەیدا بە ناوی ((دوو ساڵ لە کوردستان [1])) بە روونی تۆمارکراوە. ئەم نووسینە شایەنی باسکردنێکی تایبەتییە، نەوەك تەنها لە بەر خەسڵەتە راستییەکانی، بەڵکو لە بەرئەوەی نووسەرەکەی تاکە حاکمی سیاسی کوردستان بووە، کە تا ئێستا چیرۆکێکی درێژی لە بارەی بواری کارەکە نووسیووە.

لە کانوونی یەکەمی ١٩١٩ تا کۆتایی بەهار هیچ پەرەسەندنێکی وا نە لە کوردستان و نە لە هەموو عێراق رووی نەدا. دۆڵە شاخاوییەکان ئەوکات لە دەست زستانی سەختدا بوو، کە پەیوەندیکردن تێیدا کارێکی سەخت بوو، بارانە خۆشەویستەکەش لە دەشتەکاندا ئەوەندە بە خوڕ بوو، هەموو پیاوێکی بە توانای لە کار کردن لە کێڵاندا سەرقاڵ دەکرد. لە هیچ کاتێك پێشتر بیرکردنەوە لە ئامادەکردنی ئەو هەموو رووبەرانە بۆ کشتوکاڵکردن نەکراوەتەوە، دانەویلەی تۆ بە فەزلی دائیرەی هاوردەکان زۆر و ئاودێری چەند زێیەکی لە فوراتی ناوەڕاست پاککردەوە و زێی دیکەش دروست کرد. تورکەکانیش وازیان لە هەموو شێوە دەسەڵات نواندنێك لە ویلایەتی موسڵ هێنابوو، هەروەها ئەو رێوشوێنانەی کە لە ناوچە کوردییەکان گیرابووە بەر وایکردبوو، پەشێوییەکان بۆ ماوەی چەندین مانگ نوێ نەبنەوە. راپۆرتەکانی هەموو لیواکان (پارێزگاکان) ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە وڵات بە قۆناغی ئارامی تێدەپەرێ، بەڵام گرفتی بنەڕەتی لە بارەی شێوەی حوکمڕانی کە ئیدارەی مەدەنی وەریدەگرێت، تا کۆتایی بێ چارەسەر کردن

---

1- Hay. w.R- Tow Year in Kurdistan.

مایەوە. هەر مانگێك دوا بکەوتابایە شێوەی حکوومەتـە عەرەبییەکـەی زیـاتر سەخت دەکرد.

پەشێوییە ترسناکەکانی کوردستان، وایکرد ئاڕاستەی حکوومەتی عەرەبی لە ویلایەتی موسڵ دوا بکەوێت، بە شـێوەیەکی بـن بـڕ سـەبارەت بـە بڕیارەکـانی کونگرەی ئاشتی تایبەت بەم ناوچەیە (ویلایـەتی موسـڵ)، نـەدەبوو لێـدوان لـە بارەیان بدەم. لـە بەغـدا و بەسـرە، ئەمـەم بینـی کـە بەرلـەوەی بریارێـك یـان بەیاننامەیەکی فەرمی لە بارەی سیاسەتی حکوومەتی داهاتوو دەربچێت ناکرێت هیچ کارێك بکرێت.

# پاشکۆی وێنەکان

کۆڵۆنێڵ ویڵسن وەکیلی حاکمی مەلەکی

(نووسەری کتێبەکە)

ئەمیر فەیسەڵی کوڕی حوسێن

ژەنەڕاڵ ئەیلمەر هۆڵدین

فەرماندەی هێزە بەریتانییەکان لە عێراق لە کاتی شۆڕشی ٢٠ی عێراق

جەمیل بەگ ئەلمەدفەعی

بە جلی سەربازی

شێخ سەعلان ئەبوئەلجون

شێخ عەبدولواحد حاجی سوککەر

دیوانیه لە ساڵی ١٩٢٠

هەولێر و قەڵاکەی لە ئاسمانەوە لە ساڵی ١٩١٩

حاجی جەعفەر چەلەبی ئەبولئەمن

سەرۆکی بزووتنەوەی نیشتمانی لە بەغدا

مستەر تی ئەی لۆرانس

